# فەرهەنگی مێژوو

ئامادەکردنی:

لوقمان حەسەن حەمەڕەشید

چاپی یەکەم

٢٠٠٨

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان


- ناوی کتێب: فەرهەنگی مێژوو.
- ئامادەکردنی: لوقمان حەسەن حەمەڕەشید.
- دیزاینی بەرگ: شێرکۆ خانزادی.
- ژمارەی سپاردن: (١٣٤٥) ی ساڵی ٢٠٠٨.
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە.
- چاپ: یەکەم — ٢٠٠٨.
- چاپخانە : سیما ـ سلێمانی ـ شەقامی مەولەوی

## پێشکەشە بە:

- دایکی زێدە ئازیزم کە پەروەردەی کردوم.
- هاوسەری خۆشەویستم (گۆنا)و جگەرگۆشەکەم (ئارین).
- خوشك و برا بەڕێزو سەنگینەکانم.

# پێشەکی

لەناوەڕاستی ساڵانی نەوەدەکانەوە وەك خولیایەك کەوتمە کۆکردنەوەی بەرواری گرنگترین ڕووداوەکانی ڕابردوو، هەر ڕووداوو بەرواریکم لەدەزگاکانی ڕاگەیاندن یان لەدووتوێی کتێبێکدا بەرچاو کەوتبێت لە لای خۆم تۆمارم دەکرد، کەبێگومان ڕۆژ دوای ڕۆژ هەگبەکەم لەزیادبووندابوو، دواتر پاش پوختکردن و ڕێکخستنەوەیان ساڵی (٢٠٠٧) بەشێوەی گۆشەی مانگانە لەڕۆژنامەی (داهێنان)دا بەناوی (مانگژمێری ڕۆژ) بڵاوم کردەوە، دواتریش کەوتمە بیری چاپکردنی لەدووتوێی کتێبێکدا، بەڵام هەندێك لەو بەروارانە پێویستیان بەدرێژەی زیاتر یان ڕوونکردنەوە هەبوو، بۆیە بەپێویستم زانی کە پەراوێز بۆ بەشێکی زۆر لەبەروارەکان دابنێم کەدواتر ئەم کتێبەی لێکەوتەوە.

کتێبەکە پێك دێت لە دوو تەوەری سەرەکی، تەوەری یەکەم کەبناغەی کتێبەکەیە، بریتیە لەگرنگترین ئەو ڕووداوو بەروارانەی کە لەمێژووی نزیکی جیهان و ناوچەکەو عێراق و کوردستاندا ڕوویانداوەو بەپێی ساڵنامەی زایینی نووسراون، چونکە زۆربەی ڕووداوەکان لەسەرچاوەکانەوە هەر بەپێی ئەو ساڵنامەیە تۆمارکراون، تەنانەت ڕووداوە کوردیەکانیش، بۆیە ئێمەش تەنها ساڵنامەی زایینیمان هەڵبژارد، تەوەری دووەمیش کە پەراوێزەکانەو بەشی زۆرینەی کتێبەکە پێك دەهێنێت، چەندین بابەتی گرنگ لەخۆ دەگرێت لەبوارە جیاوازەکاندا، وەك: مێژووی نوێ و هاوچەرخی گەلی کوردو ناوچەکەو ژیانی سەرکردە بەناوبانگەکانی کوردستان و عێراق و جیهان و ژیانی زاناو داهێنەرە گەورەکان و شاعیران و بواری تۆپی پێ و چەندینی تر، هەر لەبەر هەمەجۆری بوارەکانیش کتێبەکەمان ناونا (فەرهەنگ) بەمانای (ئینسایکلۆپیدیا) بەڵام (ئینسایکلۆپیدیایەکی بچووك)، بەشێوەیەکی گشتیش ڕەچاوی (کورت و پوخت)ی

لەدارشتنی پەراوێزەکانداو نەچوونە ناو قوڵایی ڕووداوەکان و ژیانی کەسەکانەوە کراوە، هەروەک گرنگی دراوە بەو بەروارانەی تایبەتن بەکوردو کەسایەتیەکانی، یاخود ئەوانەی پەیوەندیان بەکوردەوە هەیە، پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە مێژووی هەندێ ڕووداو یان ڕۆژی کۆچی دوایی هەندێ کەس زیاد لە بەروارێکی هەبووەو ئێمەش هەوڵمانداوە کام بەروارەیان ڕاسترەو زۆرترین سەرچاوەی لەسەر هەیە، ئەوەیان تۆمار بکەین.

بێگومان ئامادەکردنی کتێبێکی لەو جۆرە بێ کەم و کوڕی نابێت، بەهۆی کەمی سەرچاوەی پێویست لەم بوارەداو کەمی توانای گەیشتن بەسەرچاوەکان بەتایبەت (کتێب و ئینتەرنێت)و سنورداری توانای ئێمە وەك مرۆڤ، بۆیە ئومێدەوارم زانستیانەو بە ئەمانەتەوە زانیاریەکانم گەیاندبێتە تۆی بەڕێزو سوپاسی سەرنج و ڕەخنەو تێبینیەکانی هەموو خوێنەرێکی بەڕێز دەکەم.

لوقمان حەسەن

٢٠٠٨/٥/٢٨

# مانگی کانوونی دووەم (ینایر)

## * ١/١

- سەری ساڵی زایینی
- ١٨٩٤ کۆچی دوایی (هێنری ڕۆدۆلف هێرتن) دۆزەرەوەی شەپۆلی کارۆموگناتیسی[١].
- ١٩١٨ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لەبەغداد.
- ١٩٣١ کۆچی دوایی شێخ ئیبراهیم حەیدەری.

---

[١] - (هێرتن) لە ١٨٥٧/٢/٢٢ لەئەڵمانیا لەدایکبووە، فیزیازانێکی ئەڵمانی بووەو یەکەم کەس بوو لەساڵی (١٨٨٨)دا بەهۆی دروستکردنی دەزگایەکەوە شەپۆلی ڕادیۆیی لەرەلەر بەرز (UHF)ی دروستکرد، وەتوانی بوونی دیاردەی تیشکدانەوەی کارۆموگناتی بدۆزێتەوە، هێرتز لەهەمان ساڵدا شەپۆلە ڕادیۆیەکانی دۆزیەوەو تێبینی کرد کاتێك بڕی تیشکە سەرو وەنەوشەییەکانی زیاد دەکرد ئامێرەکە پریشکی زۆرتری بەرهەم دەهێنا، هێرتز لەتاقیکردنەوەکانیدا گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە (پریشکی کارەبایی لەنێوان دوو تەنی بارگاویدا ئاسانتر ڕوو دەدات ئەگەر بێت و بۆشایی نێوان دوو تەنەکە بەڕوناکی پریشکێکی کارەبایی دیکە ڕوناك بکرێتەوە، وە ئەم تاقیکردنەوانە بوونە هۆی دۆزینەوەی (دیاردەی کارۆ ڕووناکی) کە بریتیە لە (دەرچوونی ئەلکترۆن لەڕووی فلزەکانەوە کاتێك بەتیشکی ڕوناکی لەرەلەر کاریگەر ڕوناك بکرێتەوە)، لەساڵی (١٩٣٠)دا وەك ڕێزلێنانێك بۆ (ڕۆدۆڵف هێرتز) یەکەی پێوانی لەرەلەری شەپۆلی کارەبایی بەناوی ئەوەوە ناونرا (هێرتن)، هێرتز (Hertz): یەکەی پێوانی لەرەلەری کارەبایە کەدەکاتە یەك سوڕ (cycle) بۆ چرکەیەك.

- ١٩٦١ كۆچی دوایی شاعیر (عارف عورفی) لەسلێمانی[١].
- ١٩٧٣ کۆچی دوایی شاعیر (مەمەند ئاغای فانی)[٢].

---

[١] – عارف عورفی، ناوی عارف کوری شێخ مەحمودی مەلا نەسروڵلای قازیەو لەساڵی (١٨٩٦) لەگەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانی لەدایك بووەو نازناوی شیعری (عورفی)یە، هەر بەمنداڵی دایك و باوکی کۆچی دواییان کردووەو مامی گرتوویەتیە لای خۆی، لەمنداڵیدا چۆتە حوجرەو قورئانی پیرۆزو کتێبە دانراوەکانی ئەو سەردەمەی تەواو کردووە، پاش تەواوکردنی قوتابخانەی رِوشدیەی عەسکەری وەکو نوسەر (کاتب) لەبەڕێوەبەرێتی پۆلیس دادەمەزرێت، بەڵام لەجەنگی جیهانی یەکەمدا بەدیل دەگیرێت و نێردراوە بۆ هیندستان، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ عێراق و ساڵی (١٩٢٧) دەچێتە دەورەی (مفەوەز)و دواتر (معاونی)، دواتر بۆ ماوەی (١٩) ساڵ (معاونی پۆلیس) بووە لەشارەکانی کوردستانداو ساڵی (١٩٤٩) خانەنشین کراوە، عورفی شیعرەکانی لەکۆڕو دیوەخانەکاندا دەخوێنرایەوە، بەتایبەت ئەو هۆنراوەیەی کەهەموو ساڵێك لەکاتی نزیکبوونەوەی جەژنی قورباندا دەوترایەوە:

جەژنی قوربانە بەقوربان نۆبەتی قوربانیە
بۆتۆ قوربانی بەقوربان، گیانی من قوربانیە

عورفی لەبەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٦١/١/١ بەنەخۆشی کۆچی دوایی کردووەو لەگردی سەیوان لەسلێمانی بەخاك سپێردراوە، دەڵێن شاعیر چەند ڕۆژێك پێش مردنی ئەم هۆنراوەیەی وتووە:

تافی جوانی چوو نەما کەوتوویتە حاڵی غەرغەرە
وائەزانم ئینتیزاری قەبرەکەی سەیوانتە
گردی سەیوان حورمەتی میوانەکانت ڕاگرە
پێنج و دوو ڕۆژێکی تر وا (عارف)یش میوانتە.

[٢] – مەمەند ئاغای فانی کوری ڕەسوڵ ئاغای قایمقامەو لەتیرەی میراودەلی پشدەرە، فانی ساڵی (١٩١٠) لەدایکبووەو لەتەمەنی هەشت ساڵی یان نۆ ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی دەکات، دوای مردنی باوکی دەچێتە لای مەحمودی برای لە (دەشتێو)، کەئەو برایەی تەمەنی هەژدە ساڵ دەبێت، فانی هەر لەمنداڵیەوە خوودەداتە خوێندنەوە بەتایبەت

- ١٩٧٤ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (برایەتی).
- ١٩٩٢ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (بابان).
- ٢٠٠٠ دامەزراندنی کەناڵی ئاسمانی (کوردسات).
- ٢٠٠٧ (بان کی مون) بوو بەئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان.

**١/٢ ***

- ١٩٥٩ (ڤیدڵ کاسترۆ) بوو بەسەرۆکی کوبا[١].
- ١٩٨٣ (دامەزراندنی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان) لەبەغداد.

---

گوڵستان و بوستانی سەعدی شیرازی و ئەدەبیاتی حافیزو شانامەی فیردەوسی و چەندین کتێبی تر، ماوەیەك سەرۆکی شارەوانی (مەرگە)و سەردەمێکیش جێگری موتەسەڕیفی سلێمانی بووە، ئاشنایەتی لەگەڵ ڕۆشنبیران و شاعیرانی ئەو کاتەدا هەبووە بەتایبەتی (ئەحمەد هەردی و تەها بابان)، ساڵی (١٩٧٣) کۆچی دوایی کردووە.

فانی لەپارچە شیعرێکیدا ڕوو لەکوردان دەڵێت:

کوردە تادوژمن بەخۆت و ئاشنای بێگانەبی
هەردەبێ نێچیری خەسم و بەندی بەندیخانەبی
کەی ڕەوایە هەر لەدەستی دوژمنانا شانەبی
بۆچرای هیوا لەسەر تۆ فەرزە وەك پەروانە بی.

[١] - فیدڵ کاسترۆ، سەرۆك وەزیران و پێشەوای سیاسی کوبایە، ساڵی (١٩٢٧) لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی ئیسپانیا لە (سانتیاگۆ) لەدایکبووە، لە (١٩٤٥) لەبەشی یاسای زانکۆی (هاگانا) دەرچووە، لە (١٩٥٠) دکتۆرای لە (ئابووری سیاسی)دا بەدەستهێناوە، بەهۆی بەشداری لەشۆڕشی (١٩٥٣)دا دەستگیرکراوە، دواتر ئازادکراوەو چووە بۆمەکسیك و لەوێوە بۆ نیویۆرك، لە (١٩٥٦)دا لەگەڵ (٨٠) شۆڕشگێڕی وڵاتەکەیدا دەگەڕێتەوە بۆ کوباو دەستیان بەکاری شۆڕشگێڕی و تێکۆشانی سیاسی کردووە، لە(١٩٥٩)دا توانی دەسەڵاتی (مۆلجینکۆ پاتیستا) بڕوخێنێت و سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، دەستی بەسەر دەسەڵاتی کوبادا گرت و حکومەتێکی سۆشیالیزمی دامەزراند کە تائێستاش بەردەوامە.

## * ١/٣

- ١٩٦٠ كۆچی دوایی ڕۆماننووسی فەڕەنسی (ئەلبێرکامۆ).
- ١٩٧٠ (د. کـورت ڤالـد هـایم) بـوو بەئەمینـداری گـشتی نەتـەوە یەکگرتووەکان.
- ١٩٧٥ کۆچی دوایی (سدیق شاوەیس)
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی شاعیر (مەلا حامیدی مەلا حەمدوون).
- ٢٠٠٦ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ئاوێنە) لەسلێمانی.

## * ١/٤

- ١٩٤٨ سەربەخۆیی (بۆرما) لەئیتاڵیا.
- ١٩٦٤ کۆچی دوایی شاعیر (ت. س. ئەلیوت).
- ١٩٩٦ کۆچی دوایی نووسەری کورد (کەریم زانستی) لەسلێمانی.

## * ١/٥

- ١٩١٩ دامەزراندنی (حیزبی نازی) ئەڵمانیا[١].
- ١٩٢٧ کۆچی دوایی شاعیر (سلێمان نەزیف)ی دیاربەکر.
- ١٩٧١ کۆچی دوایی (خادیم)ی شاعیر[٢].

---

[١] - حیزبـی نـازی، سـەرەتا نـاوی (حیزبـی کرێکـارانی ئـەڵمانیا) بـوو، یەکـەم سـەرۆکی حیزبەکەش ناوی (هێرماریەر) بوو کەڕۆژنامەنووسێکی دیار بوو، دواتر هیتلەر نـاوی حیزبـی گۆڕی بە (حیزبی ناسیۆنال سۆسیالیستی کرێکارانی ئەڵمانیا)و بەزاراوەی (نازی) ناسـاندی، کە وشەکانی سەرەتای ناوە ئەڵمانیەکەی حیزبەکەیە (nationalso zialisscho).

[٢] - (خادیم) یەکێکە لەشاعیرە بەتواناکانی ئـەدەب و شـیعری کـوردی، نـاوی حـاجی مـیرزا عەبدوڵڵای کوڕی محەمەد مەولودەو نازناوی (خادیم)ە، ساڵی (١٨٩٥) لەشاری کۆیە لـەدایك بووە، لەتەمەنی ١٢ ساڵیدا هەموو کتێبەکانی ئەو سـەردەمە تـەواو دەکـات، پاشـان ماڵـیان چۆتە قـەڵادزێ و بووەتـە بەرگدروو، لەسـاڵی (١٩٣٥) دەچێت بـۆ حـەج و سـاڵی (١٩٤٦)

- ١٩٨٤ كۆچی دوایی زاناو ڕۆشنبیر (تۆفیق وەهبی)[١].

---

دەچێتە سلێمانی و دەبێتە بەرگدروو لەشەقامی مەولەوی و دووکانەکەی دەبێتە کۆڕی شاعیرانی وەك (بێخودو ڕەمزی مەلاعارف و عەلی کەمال باپیرو ئەحمەد شوکری و...هتد)، لە ١٩٧١/١/٥ کۆچی دوایی دەکات و لەگۆڕستانی (گردی جۆگە) لەسلێمانی بەخاك دەسپێردرێت.

خادیم لە(قەصیدەی نوور)داو لەستایشی پێغەمبەردا (ﷺ) دەڵێت:

ئەی پێشەوای مەحفەلی سالاری ئەنبیا

وەی ڕەهنومای جانی عەزیزانی ئەولیا

ئەی شەمعی جەمعی مەجلیسی ڕەوحانیانی عەشق

پەروانەیە بەدەوری تۆ ئەرواحی ئەتقیا

ئەکسیری خاکی دەرگەهی (دار الأمان)ی تۆ

وەك سوورمەیە بەچاوی جیهان بینی ئەصفیا

لەم ئاستانە عالەمی کەون و مەکان هەموو

سەر دادەنێن لەخاکی دەرت ڕووی ئیلتجا.

[1] - تۆفیق کوڕی مەعروف محەمەدە، سالی (١٨٩١) لەشارۆچکەی چوارتای سەر بە پارێزگای سلێمانی لەدایکبووە، ڕوشدیەی عەسکەری لەسلێمانی و دواناوەندی عەسکەری لەبەغداد تەواوکردووە، سالی (١٩٠٨) قوتابخانەی جەنگی (مەدرەسەی حەربی) لەئەستەنبوڵ تەواوکردووەو بووە بەئەفسەر لەسوپای عوسمانی و گوازراوەتەوە بۆ ئەڵمانیا، تۆفیق وەهبی زانایەکی زمانەوان بووەو خاوەنی کتێبی (دەستوری زمانی کوردی)یە کە لەسالی (١٩٢٩) لەبەغداد چاپکراوەو (فەرهەنگی کوردی - ئینگلیزی) کە لەسالی (١٩٦٥) بەهاوکاری لەگەڵ (ئەدمونز)دا لەلەندەن چاپی کردووە، سەرەڕای چەندین لێکۆڵینەوەی زانستی لەبواری مێژووی کورددا، تۆفیق وەهبی بەگ سەرەڕای زمانی کوردی، زمانەکانی عەرەبی و تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی زانیوەو لەشۆڕشەکانی شێخ مەحموودا بەشداری کردووە، لەحکومەتی عێراقیدا پۆستی وەزارەتەکانی (ئابوری، مەعاریف، کاروباری کۆمەلایەتی) وەرگرتووەو یەکێك بووە لەو ئەفسەرە کوردانەی

- ٢٠٠٠ كردنەوەی (ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی) لەهەولێر.

## * ١/٦

- ١٤١٢ لەدایك بوونی خاتوو (جان دارك).
- ١٨٨٤ كۆچی دوایی زانای بەناوبانگی نەمسایی (گریگۆر مەندل)[١].

---

ـەشداری لەدامەزراندنی سوپای عێراقدا كردووەو ماوەیەكیش ئەندامی ئەنجومەنی نوێنـەران ـ موتەسـەریفی سـلێمانی بـووە، لـەكۆتایی ژیانیـشیدا لەشـاری لەنـدەن جێگیربـوو، ـوێژینەوەیەكی لەئاینی ئیسلامدا كردووەو بەعیشقی خـوداو خـاك و خەڵكـەوە لەبـەرواری ـ١٩٨٤/١/ لەدووری نیشتمان سەری نایەوەو لەسەر داوای خۆی لە (چیای پیرەمـەگرون)ی ـزیك سلێمانی بەخاك سپێردراوە.

[1] – گریگۆر یۆهان مەندل، لەساڵی (١٨٢٢) لەنەمسا لـەدایك بـووە، لەتەمـەنی (٢١) سـاڵیدا ـەكڵێسەی شاری برۆندا بووە بەباخەوان، لەساڵی (١٨٥١)یشدا بۆ خوێندنی فیزیـاو مێـژووی سروشـتی چـۆتە زانكـۆی ڤیـەننا، لەسـاڵی (١٨٥٤) گەڕاوەتـەوە بـۆ كڵێـسەكەی و بـووە بەمامۆسـتای زانیـاری لەقوتابخانـەی (بـرۆن)، لـەماوەی نێـوان سـاڵی (١٨٥٧–١٨٦٣) سەرگەرمی تاقیكردنـەوەی ڕووەكی پۆڵكـە بـووە، مەنـدل بـە وردبوونـەوەو كۆڵنـەدان بـوو بەپێشەنگی ئەوانەی كەڕۆڵی گرنگیان لەپێشخستنی بـۆ ماوەزانیـدا هـەبووە، تاقیكردنـەوەو دەرەنجامەكانیشی لەساڵی (١٨٦٦)دا لەبڵاوكراوەی (كۆمەڵی مێژووی سروشتیدا) لە (برۆن) بڵاوكردەوە، بەڵام لەو كاتەدا لێپرسراوانی ئەو كۆمەڵەیە سـەرگەرمی وتووێـژو لێكۆڵینـەوەی (بیردۆزی پەرەسەندن)ی (چـارلس داروین) بـوون، لەبەرئـەوە ئاگایـان لەتاقیكردنـەوەكانی مەندل نەبوو، بۆیە باسەكانی نزیكـەی (٣٣) سـاڵ لـەبیركرا، مەنـدل تاقیكردنـەوەی تریـشی لەسەر مێشی میوەو هەنگیش كرد، بەڵام زۆربەی نووسراوەكان ون بوون و لەناوچوون.

مەندل پاش زنجیرە تاقیكردنەوەیەكی ورد لەسەر ئـەو (١٠) هـەزار پۆڵكەیـەی كەچاندبووی گەیشتە ئەنجامێك كەپێی دەوترێت (یاسـای یەكـەمی مەنـدل) یـان (یاسـای جیابوونـەوەی سیفەتەكان) كـەدەڵێت: (هۆكـارە هاوجووتـەكانی بۆمـاوە لەتاكێكـدا لـەكاتی دروسـتبوونی گەمیتەكاندا لێك جیادەبنەوە، پاشان بەكرداری پیتێن یەك دەگرنەوە لـەكاتی دروسـتبوونی تاكێكی نوێدا).

- ١٩٢٦ دامەزراندنی سوپای عێراق.
- ٢٠٠٣ کۆچی دوایی شێوەکاری کورد (عەزیز سەلیم).

## ١/٧ *

١٨٩٢ لەمیسر (تۆفیق پاشای خدێوی) کۆچی دوایی کردو (عەلی خدێوی) دەسەلاتی گرتەدەست.

- ١٩٤٢ کۆچی دوایی (نیکۆلا تێسلا) پەرەپێدەری تەزووی گۆڕاو[١].
- ١٩٤٦ یەکەم ژمارەی گۆڤاری کوردستان لەمەهاباد دەرچوو.

---

(مەندل) بەو هەموو دۆزینەوە گرنگانەوە کە بەدەستی هێنابوو هێشتا خولیای دۆزینەوەی شتێکی گرنگی کەوتبووە سەر، دەیویست بزانێت (چی ڕوودەدات ئەگەر ئەو ڕووەکانەی پەروەردەی دەکات لەجیاتی سیفەتێك لەدوو سیفەتدا جیاوازبن؟)، مەندل لەمەشدا ڕووەکی پۆلکەی هەڵبژاردو پاش زنجیرە تاقیکردنەوەیەك یاسای دووەمی دانا کەپێی دەوترێ: (یاسای دابەشکردنی سەربەخۆ) کەدەڵێت: (ئەگەر دووتاك لەدوو سیفەتی یەك ڕەگی هاودژدا جیاوازبوون، ئەوا کاتێك گەمیتەکانی وەچەی یەکەمیان لێ دروست دەبێت، دوو هۆکارەکەی هەر جۆرە سیفەتێك بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەجیابوونەوەی دوو هۆکارەکەی جووتە سیفەتەکەی تر جیادەبنەوەو سیفەتی هەر جووتەشیان لەنەوەی دووەمدا بەڕێژەی ٣ زاڵ بۆ ١ بەزیو دەردەکەوێ).

[١] – نیکۆلا تێسلا لە ساڵی (١٨٥٦) لەناوچەی (لیکا)ی کرواتیا لەدایکبووە، تێسلا داهێنەرو ئەندازیارێکی بواری کارەبای ئەمریکیە کە لەساڵی (١٨٨٤)ەوە کۆچی کردووە بۆ ئەمریکاو بووە بەهاوڵاتی ئەمریکی، تێسلا بنچینەی بواری موگناتیسی خولاوە ( Rotating magnetic field)ی دارشت و چەند پلانێکی بۆ پەرەپێدانی ماتۆڕی موگنەکار دانا، ئەمەش یەکەم هەنگاوی سەرکەوتووی بوو ڕووەو بەکارهێنانی بیرۆکەی تەزووی گۆڕاو، تاقیکردنەوەکانی تێسلا لەبواری گڵۆپی کارەبایی و وزەی لەرینەوەی کارەبایی بەردەوام بوو، کۆیلەکەی تێسلا کە لەساڵی (١٨٩١)دا دایهێنا، ئەمڕۆ بەشێوەیەکی بەرفراوان لەپێکهاتەی ڕادیۆو تەلەفیزیۆنداو لەئامێرە ئەلکترۆنیەکانی بێتەلدا بەکار دەهێنرێت.

## * ١/٨

- ١٣٢٤ (ماركۆ پۆلۆ) گەشتیاری ناسراوی جیهانی کۆچی دوایی کرد[1].
- ١٩٢٦ (سوڵتان عەبدولعەزیز ئال سعود) پلەی شای حیجازی پێ بەخشرا.
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی نووسەری کورد (د.عەبدولڕەحمان نوری جان) لەبەغداد.
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی (شوئین لای) پێشەوای گەلی چین.
- ١٩٩٦ کۆچی دوایی سەرۆکی فەڕەنسی (فڕەنسۆ میتران).
- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی (شێخ مەعصوم زیائەدین نەقشبەندی) لەئەمریکا.

## * ١/٩

- ١٩١٠ ڕۆژنامەی (بیلدرم) لەبەغداد دەرچوو.
- ١٩٧٠ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (هاوکاری) لەبەغدا.
- ١٩٩٧ کۆچی دوایی شاعیری کورد (حەسیب قەرەداغی) لەسلێمانی.

---

[1] – مارکۆ پۆلۆ، گەشتیارێکی ناوداری ئیتاڵیایە، ساڵی (١٢٥٤) لەشاری ڤینسیا (بوندوقیە) لەدایکبووە، لە ساڵی (١٢٧١) لەگەڵ باوکی و مامی بەگەشت لەڤینسیاوە ڕۆیشتووە، لە (١٢٧٥) گەیشتوونەتە وڵاتی چین، (قوبلاخان)ی ئیمپراتۆری چین پێشوازی لێکردوون و (مارکۆ)ی کردووە بە فەرمانڕەوای شاری (نیفتشاو) بۆماوەی سێ ساڵ، مارکۆ نزیکەی (٢٠) ساڵ لەچیندا ماوەتەوەو لە ساڵی (١٢٩٥) گەڕایەوە بۆ (ڤینسیا)، لەساڵی (١٢٩٨) کرا بەکابتنی کەشتیەکی جەنگی، لەهێرشی سەر (جەنەوا)دا بەدیل گیراو زیندانی کراوە، لە زینداندا هەرچیەکی بینیوەو زانیوە بۆ هاوڕێیەکی زیندانی گێڕاوەتەوە، ئەویش هەمووی نوسیوەتەوە، کەدواتر بۆتە فەرهەنگێکی جوگرافی گرنگ.

## ١/١٠ *

- ١٦٥٣ بڵاوبوونەوەی یەکەم ڕۆژنامە لەجیهاندا لەشاری ڕۆمای نیمانیا، بەناوی (ئەکتادیورنا) واتە (ڕووداوەکانی ڕۆژانە).
- ١٨٣٠ بۆ یەکەم جار بەکارهێنانی پوولی نامەناردن.
- ١٩١٠ دامەزراندنی (کۆمەڵەی هیوا) لە ئەستەنبول.
- ١٩٢٣ کۆچی دوایی (ولیەم ڕۆنتیگن) داهێنەری تیشکی (X)[١].
- ١٩٤٦ یەکەم دانیشتنی نەتەوە یەکگرتووەکان لەلەندەن ئەنجامدرا.
- ١٩٤٩ بەرپابوونی شۆڕشی چین بەسەرۆکایەتی (ماوتسی تونگ).
- ٢٠٠٢ کۆچی دوایی ڕووناکبیری عیراقی (حسێن جەمیل).

## ١/١١ *

- ١٩٤٦ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) لەمەهاباد.
- ١٩٦٥ کۆچی دوایی (جەمالەدین بابان)[٢].

---

[١] – ولیەم کۆنارد ڕۆنتیگن لە ئازاری (١٨٤٥) لەئەڵمانیا لەدایك بووە، یەکەمین کەس بووە خەلاتی نۆبڵی وەرگرتووە بەهۆی دۆزینەوەی تیشکی سینی (X) کە داهێنانێکی تازەو گرنگ بوو لەبواری پزیشکیدا، ڕۆنتیگن وانەبێژبووە لە زانکۆی (ستراسبۆرگ) لەساڵی (١٨٧٤)، ساڵێك دواتر بووەتە پرۆفیسۆر لەئەکادیمیای کشتوکاڵ لە هۆینهایم و وێتمبێرگ، ساڵی (١٨٨٨) بووەتە سەرۆکی بەشی فیزیا لەزانکۆی (وێرتسبێرگ)، ساڵی (١٩٠٠) بووەتە سەرۆکی بەشی فیزیا لەزانکۆی میونیخ، لەساڵی (١٨٩٥) کاتێك خەریکی تاقیکردنەوە بوو لەسەر تێپەڕبوونی تەزووی کارەبا بەناو تیوبێکی شووشەیی بەتاڵدا، پاش چەند تاقیکردنەوەیەك تیشکی (سین)ی دۆزیەوە.

[٢] - جەمالەدین بابان، جەمال ڕەشید عەبدوللا بەگ، لەساڵی (١٨٩٣) لەبەغداد لەدایکبووە، ساڵی (١٩١٤) قوتابخانەی مافی لەبەغداد تەواوکردووە، وە هەر لەو ساڵەدا بووە بەخاوەنی گۆڤاری (بانگی کورد)، وەك مولازمێکی سوپای عوسمانی بەشداری لەیەکەمین جەنگی

– ١٩٦٩ کۆچی دوایی شێخ ئەحمەد بارزانی.

– ٢٠٠٢ کۆچی دوایی (ئازاد قەرەداغی) ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان لەسوید.

## * ١/١٢

– ١٩٦٢ کۆچی دوایی شاعیر (شێخ تاهیری شوشی)[١].

---

جیهانیدا کردووە، پاشان ئینگلیزەکان بەدیل گرتیان و گواستیانەوە بۆ هیندستان، ساڵی (١٩٢٠) گەڕایەوە بۆ بەغدادو بوو بەپارێزەر، پاشان بەدادوەری سزا لەدادگاکانی بەغدادو سلێمانی و موسڵدا کاری کردووە، لە١٣ی ئایاری (١٩٢٨) وەك نوێنەری هەولێر بۆ (ئەنجومەنی نوێنەران) هەڵبژێردرا، پاشان دووبارە لەساڵانی (١٩٣٠و ١٩٣٧و ١٩٤٠) بەنوێنەری موسڵ هەڵبژێردرا، لە ١٩٣٠/٣/٢٣ پۆستی وەزارەتی دادی لەیەکەمین کابینەی وەزاری (نوری سەعید)دا وەرگرت، پاشان چەندین پۆستی وەزاری وەرگرتووە لەکابینەی وەزاری (ئەلمەدفەعی)و (صالح جەبر)و (نوری سەعید)دا، لە ١٩٥٥/٦/٢٩ بوو بەئەندام لەئەنجومەنی ماقووڵان (مجلس الأعيان)داو تا تەمووزی (١٩٥٨) لەهەمان پۆستدا مایەوە، لە ١٩٦٥/١/١١ لەبەیروتی پایتەختی لوبنان کۆچی دوایی کرد.

[١] – شاعیر، ناوی شێخ تاهیر محەمەد تاهیر شێخ ئیسلامی شوشێیە، ساڵی (١٩١٨) لەگوندی شوشێ لەزنجیرە چیای ئاکرێ لەدایك بووە، بۆخوێندن چەند شوێنێکی کوردستان گەڕاوە، لەتەمەنی (٣٨) ساڵیدا تووشی نەخۆشی دەبێت و لە ١٩٦٢/١٢/١ کۆچی دوایی دەکات، شێخ تاهیر شاعیرێکی خواناس و خۆشنووسێکی بەتوانا بووە، لەگەڵ ئەو تەمەنە کورتەیدا توانیویەتی چەند بەرهەمێکی نایاب لەدوای خۆی بەجێ بهێڵێت، لەوانە:

١– رياض النور یان گوڵزار، کەبەهۆنراوە باس لەژیانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات.

٢– فن القافيه، بەزمانی عەرەبی.

٣– الشرح المنظوم على أرجوزة الشيخ معروف النودهي، بەزمانی عەرەبی.

٤– المتخب في ذكر ميلاد سيدنا محمد ﷺ فخر العجم والعرب.

٥– موجز تأريخ حياتي وماشاهدته من الحوادث المهمة.

٦– التأريخ نَبذَة من تأريخ الحَوادث والْوَقائِع ووفاة كِبار الرِجالات.

- ١٩٩٢ دەرچوونی ژمارە سفری ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ).
- ١٩٩٢ هەڵوەشاندنەوەی خولی دووەم و ئەنجامی هەڵبژاردنەکان لەجەزائیر.
- ٢٠٠٠ کۆچی دوایی شاعیری کورد (ع. ح.ب) لەسلێمانی[١].

## * ١/١٣

- ١٩٦٠ کۆچی دوایی مێژوونووسی کورد (ئەحمەد تەقی).
- ١٩٩٣ کۆچی دوایی شاعیری کورد (جەلالی میرزا کەریم).

---

[١] - (ع.ح.ب) ناوی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ حسێنی بەرزنجیە، ساڵی (١٩٢٣) لەبەرزنجە لەدایك بووەو لای باپیرەی لەحوجرە دەستی بەخوێندن کردووە، لەبەر ناڵەباری بارودۆخی ژیانی خوێندنی تەواو نەکردووەو بووە بەفەرمانبەر لەسلێمانی، (ع.ح.ب) یەکێك بووە لەشاعیرە ناودارەکانی کوردو ساڵی (١٩٦٨) یەکەم دیوانی بەناوی (ناسۆری دەروون) بڵاوکردۆتەوە، سەبارەت بە نازناوی (ع.ح.ب) شاعیر دەڵێت: (لەبەر بارودۆخی ئەو کاتە کە نەکەومە بەردەستی دەسەڵاتدارانی ئەو کات و تووشی ناڕەحەتی بێم، لەبەرئەوە یەکەم قەسیدە کە بۆ گۆڤاری (گەلاوێژ)ی ئەوکاتەم نارد بەناوی (لەگەنجی و پیری و مردندا) بەناوی عەلی برامەوە (ع.ح.ب) –عەلی شێخ حسێن بەرزنجی–یەوە ناردم، ئیتر دەستبەرداری ئەو نازناوە نەبووم و دوای گەلاوێژ لە (ژین)یشدا هەر بەهەمان شێوە شیعرو نووسینم بڵاوکردۆتەوە).

لەکۆتایی سیەکاندا پەیوەندی کردووە بە (کۆمەڵەی هیوا)وە کەمامۆستا (ڕەفیق حیلمی) سەرۆکایەتی دەکرد، یەکەم شیعری لە گۆڤاری (گەلاوێژ) لەساڵی (١٩٤٧)دا بڵاوکردۆتەوە، ساڵی (١٩٦٣) بەتۆمەتی شیوعیەت گیراوەو لەسەر کارەکەی لابراوە، شاعیر زۆر کاریگەر بووە بە (گۆران) و خۆی بەقوتابی مامۆستا گۆران دەزانێت، لەبەرهەمە چاپکراوەکانی: (ناسۆری دەروون، گرێی نهێنیەکان، زەردەخەنەی تاساو، تریفەی ڕێژاو)، لەبەرەبەیانی ٢٠٠٠/١/١٢داو لەتەمەنی (٧٧) ساڵیدا لەگەڕەکی عەلی کەمالی شاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

**- ١٩٩٨ كۆچی دوایی مامۆستا (هەمزە عەبدوڵڵا)[١].**

## * ١/١٤

**- ١٩٤٣ لوتكەی (دار البیضاء) بەئامادەی سەرۆكی ئەمریكا (ڕۆزفڵت)و سەرۆكی بەریتانیا (چەرچل)و سەرۆكی فەڕەنسا (دیگۆل) بەسترا.**

**- ١٩٦٤ كۆچی دوایی (د. صدیق ئەتروشی).**

**- ٢٠٠٠ كۆچی دوایی شاعیری ئێرانی (بێژەنی جەلالی).**

---

[١] - سیاسەتمەدارو كەسایەتی ناسراو (هەمزە عەبدوڵڵا عومەر عاشور) لەخێڵی (شەرەفخان)ی سەر بەهۆزی (ئەتروش)ەو، ساڵی (١٩١٥) لەگوندی (ڕاژان)ی كوردستانی ئێران لەدایكبووە، بەڵام بەهۆی بارودۆخی نائاسایی ئەوكاتەی كوردستانەوە خانەوادەكەیان بەرەو باكووری كوردستان ڕێیشتوون و پاشان بۆ باشووری كوردستان (باكووری عێراق)، قۆناغەكانی خوێندنی لەشاری موصڵ و زاخۆ تەواو كردووەو ساڵی (١٩٣٢) لە (كۆلیژی ماف)ی بەغداد وەرگیراوە، لەبەغداد ئاشنایەتی لەگەڵ خوێندكارانی كوردی وەك (ئیبراهیم ئەحمەد و شاكر فەتاح)دا پەیدا كردووە، ساڵی (١٩٣٤) پەیوەندی بەحیزبی شیوعی عێراقەوە كردووە، لەبەغداد وەك نووسەرو ڕۆژنامەنووس كاری كردووە، لەكۆتایی سیەكاندا لەسەر چالاكی سیاسی زیندانی كراوە، پاش ئەوەی بۆ حكومەتی عیراقی ئاشكرا دەبێت كەهەمزە عەبدوڵڵا عیراقی نیە، حكومەت بڕیار دەدات ڕەگەزنامەی عێراقی لێ بسێنێتەوە، ئەویش بەناچاری چۆتە ماڵی (سەید ئەحمەدی خانەقا) لەكەركوك و ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ (مەلا برایم)، ساڵی (١٩٤٦) لەگەڵ چەند كەسێكی تردا لەبەغدا (پارتی دیموكراتی كورد)یان دامەزراندووەو هەمزە عەبدوڵڵاش بووە بەسكرتێری مەكتەبی سیاسی پارتی، لەئەیلولی ئەو ساڵەشدا ڕۆژنامەیەكیان بەناوی (ڕزگاری)یەوە بلاوكردۆتەوە، لەپەنجاكاندا لەبەرئەوەی كەعیراقی نیە لەلایەن حكومەتی عێراقیەوە دوورخراوەتەوە بۆ توركیا، توركیاش نەیگرتۆتە خۆی و گەڕاوەتەوە بۆ كوردستانی عیراق، لەكۆتایی پەنجاكاندا بەهۆی ناكۆكیەكانی لەگەڵ پارتیدا وازی لەپۆستەكەی هێناوە لەناو پارتیداو خۆی بۆ نووسین و خوێندنەوە تەرخانكردووە، لە ١٣ی كانوونی دووەمی (١٩٩٨) كۆچی دوایی كردووە.

## * ١/١٥

**- ١٩١٥ دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان لەڕەواندز، لەلایەن (حسێن حوزنی موکریانی).**

**- ١٩١٥ (گراهام بێڵ) تەلەفۆنی داهێنا.**

**- ١٩٥٨ یەکەم ژمارەی گۆڤاری (شەفەق) لەکەرکووك دەرچوو[١].**

**- ٢٠٠٠ کۆچی دوایی هونەرمەندی شێوەکاری عێراقی ( ئارداش کاکافیان).**

**- ٢٠٠٧ لەسێدارەدانی هەردوو تاوانبار (بەرزان تکریتی و عەواد حەمەد بەندەر).**

## * ١/١٦

**- ١٩٢٠ یەکەم کۆبوونەوەی ڕێکخراوی (کۆمەڵەی گەلان).**

**- ١٩٧٠ موعەممەر قەزافی بوو بەسەرۆکی لیبیا.**

**- ١٩٧٩ شای ئێران (محەمەد ڕەزا پەهلەوی) ناچارکرا ئێران بەجێبهێڵێت.**

---

[١] - (گۆڤاری شەفەق)، گۆڤارێکی نیومانگی ئەدەبی و زانستی و کۆمەلایەتی بوو، بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لەکەرکووك دەرچووە، گۆڤاری شەفەق لەژێر ناوەکەیدا نووسراوە: (گۆڤارێکی خوێندەواری گشتیە)، خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەری مامۆستا عبەبدولقادر بەرزنجی بوو، دیارترین نووسەرو ڕەخنەگرەکانی گۆڤاری شەفەق (مارف بەرزنجی و مارف خەزنەدارو ڕەفیق حیلمی) بوون، لەژمارە یەکداو لەلاپەڕە سێدا نووسەری ناودار (موحەڕەم محەمەد ئەمین) لەژێر ناونیشانی (ئامانجمان) ڕێڕەوی گۆڤارەکەی دیاری کردووە، ساڵی (١٩٥٩) گوێزرایەوە بۆ سلێمانی و ناوی بووە بە (بەیان)و (مامۆستا گۆران) سەرپەرشتی دەکرد، پاش ماوەیەك دیسان گوێزراوەتەوە بۆ کەرکووك و ناوەکەی جارانی وەرگرتەوە، سەرەتای ساڵی (١٩٦٣) داخرا.

- ١٩٩٨ دادگای دەستوری تورکیا بڕیاریدا پارتی ڕەفاهی ئیسلامی هەڵبوەشێنرێتەوە.
- ٢٠٠١ تیرۆرکردنی (لۆران کابیلا) سەرۆکی کۆنگۆ.

## ١/١٧*

- ١٩٦٧ کوشتنی (پاتریس لۆمۆمبا)[١].
- ١٩٩١ هێرشەکانی هاوپەیمانان بۆ سەر عیراق بەناوی (گەردەلوولی بیابان) دەستی پێکرد.
- ١٩٩٩ دامەزراندنی کەناڵی ئاسمانی (کوردستان تی ڤی).

## ١/١٨ *

- ١٩١٢ ڕۆژنامەی (الحقوق) لەبەغداد دەرچوو.
- ١٩٢٩ (جۆرج بەرنادشۆ) خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت.
- ١٩٧٧ قاهیرە دووچاری ڕاپەڕین و خۆپیشاندانێکی گەورەبوو کە بە(ڕاپەڕینی نان) ناسرا.
- ١٩٩١ عێراق بۆ یەکەم جار بەمووشەکی دوورهاوێژ لەئیسڕائیلی دا.
- ١٩٩٣ دامەزراندنی دادگای پێداچوونەوە (تەمین)ی کوردستان.

## ١/١٩ *

- ١٤٠٥ کۆچی دوایی (تەیمور لەنگ).

---

[١] - (پاتریس ئەمرجی لۆمۆمبا) شۆڕشگێرو نیشتمانپەروەری کۆنگۆیە، ساڵی (١٩٥٦) پارتێکی بۆ تێکۆشان دژی داگیرکاری بەلجیکایی دامەزراند بەناوی (بزووتنەوەی نیشتمانی کۆنگۆ)، کەتوانی گەلەکەی بگەیەنێت بەڕزگاری و سەربەخۆیی، لە (١٩٦٠)دا بوو بە یەکەم سەرۆك وەزیرانی کۆنگۆ، بەڵام بەهۆی جیاوازی بەرە سیاسیەکانی کۆنگۆ، پاش ماوەیەك (سەرۆك کۆمار) لۆمۆمبای لەسەرۆکی حکومەت لابردو، دەستگیرکراو لە (کاتانگا) کوژرا.

١٧٣٦ لەدایکبوونی (جیمس وات).

١٩٢ یەکەم قوتابخانەی کچان لەبەغدا کرایەوە.

١٩٦٦ خاتوو ئەندێرا غاندی بوو بەسەرۆکی هندستان.

١٩٨٧ کۆچی دوایی هونەرمەندی کورد (خودادا عەلی) لەسلێمانی.

١٩٩٩ کۆچی دوایی قورئان خوێن (شعبان الصیاد).

## ١/٢٠ *

١٩١٠ کۆچی دوایی شاعیر (شێخ ڕەزای تاڵەبانی)[١].

---

[١] - شێخ ڕەزا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی شێخ ئەحمەدی مەلا مەحمودی زەنگەنەیەو ساڵی (١٨٣٥) لەئاوایی (قرخ)ی نزیك چەمچەماڵ لەدایکبووە، سەرەتا لای باوکی دەستی بەخوێندن کردووەو دوایی بۆ فەقێیەتی چۆتە کەرکوك، پاشان چۆتە کۆیە بۆلای مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە، هەر لەسەردەمی فەقێیەتیدا چۆتە سلێمانی و لەمزگەوتی گەورە خوێندویەتی، هەر لەوکاتەدا فێری ئەدەبیات و زمانی فارسی و تورکی بووە، شێخ ڕەزا لەتەمەنی ٢٥ساڵیدا چۆتە ئەستەنبوڵ و دووساڵ لەوێ دەمێنێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ کەرکوك و هەر لەو کاتەدا باوکی کۆچی دوایی دەکات، پاش شەش مانگ لەبەر تێکچوونی لەگەڵ شێخ عەلی برایدا کەرکوك بەجێ دەهێڵێ و دەچێت بۆ کۆیە بۆلای شێخ غەفوری مامی.

ساڵی (١٨٦٦) بۆ جاری دووەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەنبوڵ و بەهۆی (صەدری ئەعزەم)ەوە دەچێت بۆ حەج، دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەنبوڵ و تا ساڵی (١٨٧٤) لەوێ دەمێنێتەوەو پاشان دەگەڕێتەوە بۆ کەرکوك، ساڵی (١٨٩٨) بەیەکجاری کەرکوکی بەجێ هێشتووەو لەتەکیەی تاڵەبانی لەبەغدا نیشتەجێ بووە، ساڵی (١٩١٠) لەتەمەنی ٧٤ ساڵیدا لەبەغدا کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بەخاك سپێرراوە، لەسەر ڕاسپاردەی خۆی ئەم چوار دێڕە هۆنراوەیەی خۆی لەسەر گۆڕەکەی نووسراوە:

یارسول الله چه باشد چون سگ اصحاب کهف

داخل جنت شوم در زمرەیی احباب تو

- ١٩٤٩ (هنری ترومان) بوو بەسەرۆکی ئەمریکا.
- ١٩٥٣ (ئەیزەنهاوەر) بوو بەسەرۆکی ئەمریکا.
- ١٩٨١ (ڕۆناڵد ڕیگن) بوو بەسەرۆکی ئەمریکا.
- ١٩٩٦ کۆچی دوایی (م. محەمەد حامد ئەبونەصر) ڕابەری گشتی کۆمەڵی برایانی موسڵمان لەمیسر.
- ٢٠٠١ (جۆرج بۆشی کوڕ) بوو بەچل و دووەمین سەرۆکی ئەمریکا.

## * ١/٢١

- ١٩٢٤ کۆچی دوایی (لینین)[١].

---

او رود در جـنـت و مـن در جـهـنـم کی رواست

او سـگ اصحاب کهـف و من سگ اصحاب تو.

واتە: (ئەی پێغەمبەری خوا چی ئـەبێ وەکو سـەگی یـارانی ئەشکەوت بـچمە بەهەشـتەوە لەگەڵ دەستەی خۆشەویستانی تۆ، کەی ڕەوایە ئەو بچێتە بەهەشت و من بچمە جەهەننەم؟ ئەو سەگی یارانی ئەشکەوتەو من سەگی یارانی تۆ)، شێخ ڕەزا شاعیرێکی قسەخۆش بووەو بەنموونـەی شـاعیری داشـۆرین (هـەجو) دادەنرێـت لەئـەدەبی کوردیـدا، ئەگەرچـی لـەزۆر مەیدانی تردا دەستی باڵای هەبووە، لەپارچە شیعرێکدا لەهەجووی قازی کۆیەدا دەڵێت:

لەسەگم پرسی عەجەبا قەومتە حوسنی پاشا

تـووڕەبـوو کـلکی لـەقـان، وتـی حـاشا حاشا

ڕاستە گەرچی سەگیشم بەخودا خۆم دەکوژم

ناوی من بێنی لەگەڵ ئیسمی خەبیسی پـاشا.

[١] - ڤلادیمێـر ئیلیـتش لیـنین، سـاڵی (١٨٧٠) لەشـاری (سمبرسـك) لـەدایك بـووە، پـاش دوورخستنەوەی بۆ سیبریا، ساڵی (١٩٠٠) چۆتە ئەورووپا، سەرکردایەتی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩١٧)ی کرد لەڕوسیا کەشیوعیەکان پێی هەستان و یـەکێتی سـۆڤیەتی دامەزرانـد، لیـنین سـەرکردەیەکی تونـدو خۆسـەپێن بـووەو لـەماوەی دەسـەڵاتیدا گەشـەی بـەتیۆری مارکسیدا، ساڵی (١٩٢٤) بەنەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

- ١٩٢٦ دەرچوونی ڕۆژنامەی (ژیان) لەسلێمانی[1].
- ١٩٥٨ کۆچی دوایی نووسەری کورد (مەعروف جیاوك)[2].

---

[1]- ژیان ڕۆژنامەیەکی سیاسی ئەدەبی بوو، هەفتەی جارێك دەردەچوو، ژمارە یەکی لەڕۆژی پێنج شەممە ١٩٢٦/١/٢١ دەرچووە، واتە یەك هەفتە دوای دەرچوونی دوایین ژمارەی (ژیانەوە) کە ژمارە (٥٦) بوو لە ١٩٢٦/١/١٤، ژیان لەچاپخانەی شارەوانی چاپ دەکراو هەرخۆشی لایەنی دەرکردنی ڕۆژنامەکە بوو، ژیان یەکەمین ڕۆژنامەیە لەحکومەت جیابۆتەوەو بووە بەئەهلی، پیرەمێردی شاعیرو ڕۆژنامەنووس ئیمتیازەکەی کڕیەوەو لەژمارە (٤٠٦)ەوە لە ١٩٣٤/٨/١٤ بوو بەسەرنووسەری، پاش ئەوەی لەژمارە (٣٢١)ەوە لە ١٩٣٢/٥/٦دا دوای کۆچی دوایی (حسێن نازم) سەرنووسەری پێشووی ئەرکی سەرنووسەرایەتیەکەی گرتە ئەستۆ.

ژیان سەرەڕای گرنگیدان بەلایەنی وێژەیی و هۆنراوەو چیرۆك بەگەڵ وتاری کۆمەلایەتی ڕازابوەوە، دوایین ژمارەی ژیان کەژمارە (٥٥٣) بوو لە لە ١٩٣٨/٣/١٠دا دەرچووە، بەم جۆرە لەمێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا یەکەمین جار بوو ڕۆژنامەیەك نزیکەی (١٣) ساڵ بەردەوام بێت، کەزۆری نەخایاند (ژین) جێگەی گرتەوە.

[2] - (مەعروف جیاوك)، مەعروفی کوڕی عەلی ئەسغەر، ساڵی (١٨٨٤) لەبەغداد لەدایك بووەو لە ١٩٥٨/١/٢١ هەر لەبەغداد کۆچی دوایی کردووەو لەشاری هەولێر نێژراوە، مەعروف جیاوك دەرچووی قوتابخانەی ماف بوو لەئەستانە، لەشارەکانی کەرکوك و هەولێرو دیوانیەو حەی و مسەیب و کەربەلاو حللەدا بووتە دادوەر، ساڵی (١٩١٢) ڕۆژنامەی (الحقوق)ی لەبەغدا دەرکردووە، وەك نوێنەری شاری هەولێر هەڵبژێردراوە، زیاتر لەجارێکیش وەك یەکەم جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران دەست نیشانکراوە، ساڵی (١٩٤٤) بووەتە موتەسەریفی سلێمانی، لەسەرەتای داگیرکردنی عێراقدا ئینگلیزەکان لەبەصرە گرتیان بەدیل، لەساڵی (١٩١٤)ەوە تا ساڵی (١٩١٩) لەزینداندا مایەوە.

مەعروف جیاوك چەند کتێبێکی داناوە بەزمانی عەرەبی، لەوانە: (ڕۆژی کورد-١٩٢٥)، (ڕێنووسی زمانی کوردی-١٩٣٠)، (نوێنەرایەتیم-١٩٣٨)، (کارەساتی بارزان-ی زوڵم لێکراو- ١٩٥٤)، هەروەها (پەندو قسەی نەستەق-١٩٣٩)یشی بەزمانی کوردی داناوە.

- ۲۰۰۰ کۆچی دوایی سەرۆك وەزیرانی پێشووی لوبنان (سائیب سەلام).

# * ۱/۲۲

- ۱۹۰۰ کۆچی دوایی (دێڤید هۆگس) داهێنەری مایکرۆفۆن.
- ۱۹۱۰ دروستکردنی یاریگەی (ئۆلد ترافۆرد) لە ئینگلتەره[۱].
- ۱۹٤٦ دامەزراندنی (کۆماری مەهاباد) بە سەرۆکایەتی پێشەوا[۲].

---

[۱] - یاریگەی (ئۆلد ترافۆرد) لەشاری (مانچستەر)ی ئینگلتەرایەو یاریگەی یانەی (مانچستەر یونایتد)ەو، شوێنی دانیشتنی (۷٦) هەزار کەس دەبێت و داهاتی ساڵانەی نزیکەی (٥۳) ملیۆن دۆلارە.

[۲] - پاش کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم، پێشەوا قازی محەمەد بیری لەقۆستنەوەی بارودۆخە کردەوە بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی کوردی، دوای ئەوەی لەمانگی ئابی (۱۹٤٥) پارتی دیموکراتی کوردستانی دامەزراند، لە ۱۹٤٦/۱/۲۱ (۲۰) کەس لەبەرزترین پیاوانی شاری مەهاباد لەفراوانترین مزگەوتی شاردا کۆبوونەوە بۆ قسەکردن لەسەر ئۆتۆنۆمی و پرۆگرامی سبەینێ، پاشان لە ۱۹٤٦/۱/۲۲ بەئامادەبوونی دەیان هەزار کەس لەچین و توێژە جیاوازەکان کۆبوونەوەیەکی فراوان لەمەیدانی چوارچرا سازکراو پێشەوا قازی محەمەد باسی مافی چارەی خۆنووسین و دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی بۆ کردن لەناو کیانی ئێراندا، وە هەر ئەو ڕۆژە سەعات (۱۰)ی سەر لەبەیانی ئاڵای کوردستان لەسەر (ئەمارەتی هەیئەتی ڕەسمی میللی) هەڵکراو یەکەم کۆماری میللی کوردی ڕاگەیەنرا.
لە ۱۹٤٦/۲/٥ قازی محەمەد دانرا بەسەرەك كۆمارو شاری (مەهاباد)یش کرا بەپایتەخت، وە لە۱۹٤٦/۲/۱۱ پێکهاتەی حکومەت ڕاگەیەنراو قازی و هەموو وەزیرەکان سوێندیان خوارد کەدڵسۆزی کۆمارەکەیان بن، هەر لەو ڕۆژەدا پێشەوا بەدەستی خۆی سەرپۆشی لەسەر قورئانی پیرۆزو ئاڵای کوردستان لابرد، کۆمارەکە بریتی بوو لە شارەکانی (بانەو سەقزو سەردەشت و مەریوان و دیواندەرەو مەهابادو ئەشنۆیەو میاندو ئاب و سنە)، بەداخەوە کۆمارەکە ساڵێکی تەواو نەکردو لە ۱۹٤٦/۱۲/۱۷ هێزەکانی شای ئێران هاتنە ناو شاری مەهابادەوەو کۆمارە ساواکەیان لەناوبرد.

١٩٦١ كوچی دوایی هونەرمەندی شێوەکاری عێراقی (جەواد سەلیم).

## * ١/٢٣

١٩٩٩ کۆچی دوایی گۆرانی بێژی ناسراوی کورد (محەمەدی ماملێ) لەشاری مەهاباد.

## * ١/٢٤

- ١٩٦٥ کۆچی دوایی سەرۆك وەزیری بەریتانیا (ونستۆن چەرچل)[1].
- ١٩٩٢ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (الاتحاد) زمانحالی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان).
- ١٩٩٢ دامەزراندنی (کۆمەڵەی کوردستانێکی سەوز).

---

[1] - ونستۆن چەرچڵ لەساڵی (١٨٧٤) لەئینگلتەرە لەدایك بووەو لەکەسایەتیە ناودارەکانی ئینگلیز بووەو سەرۆکی پارتی پارێزگارانی بەریتانیا بووەو بۆ ماوەی نۆ ساڵ سەرۆك وەزیری بەریتانیا بووە، ساڵی (١٩٥٣) خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی وەرگرتووە، چەرچڵ یەکێك بووە لەو کەسانەی کە بووە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم و ڕۆڵێکی گرنگی لەجەنگەکەدا هەبوو، دەڵێن لەکاتی جەنگەکەدا وەك یەکەم وەزیری ئینگلیز بەمەبەستی قسەکردن بۆ جیهان سواری ئۆتۆمبیلێکی تاکسی بوو بۆ شوێنی (ڕادیۆی BBC) ڕۆیشت، کاتێك دابەزی بەشۆفێرەکەی وت: نیو سەعات لەڕێم بوەستە تا دەگەڕێمەوە، شۆفێرەکە وتی: ببورە من دەمەوێ بەرەو ماڵ بگەڕێمەوە، تا بتوانم گوێ بۆ قسەکانی (چەرچڵ) بگرم، چەرچڵ بەبیستنی ئەم قسەیە زۆر دڵخۆش بوو، بۆیە دوو ئەوەندەی کرێکەی دایە شۆفێرەکە، کابرای شۆفێر زەردەخەنەیەکی کردو وتی: بۆ چەرچڵ کێیە؟! من لەڕێت دەوەستم تا دەگەڕێیتەوە!، ونستۆن چەرچڵ پاش (٩١) ساڵ تەمەن، لە ١٩٦٥/١/٢٤ کۆچی دوایی کرد.

## *١/٢٥

- ١٩٣٥ (ئەتاتورك) بڕیاریدا مزگەوتی (ئەیاصوفیا) بکرێتە مۆزەخانە بۆ هونەرو کلتوری بێزەنتیەکان.
- ١٩٤٨ کۆچی دوایی (کەریمی عەلەکە)، وەزیری دارایی حکومەتەکەی شێخ مەحمود.
- ١٩٥٩ یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (طریق الشعب) لەبەغداد دەرچوو.
- ١٩٨٠ (ئەبولحەسەن بەنی صەدر) بوو بەسەرۆك کۆماری ئێران.
- ١٩٩١ سەربەخۆیی (مەقدۆنیا) لەیۆگسلاڤیا.

## * ١/٢٦

- ١٩٣٩ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ژین) لەسلێمانی.
- ١٩٤٨ دامەزراندنی کۆماری هیندستان و، جەواهیر لال نەهرۆ بوو بەسەرۆکی وڵات[١].
- ١٩٩١ لەئەنجامی هێرشی ئەمریکاو هاوپەیمانان بۆ سەر عێراق چەند فڕۆکەیەکی عێراقی پەنایان بردە بەر ئێران.

---

[١] – کۆماری هیندستان دەکەوێتە کیشوەری ئاسیاو ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی یەك ملیۆن کەس دەبێت و، ڕووبەرەکەی (٣,٢٨٦,٤٠٠کم٢) یەو، نزیکەی (١٥٠) ئاین و ئاینزای جۆراوجۆری تێدایەو سیستمی فەرمانڕەوایی کۆمارییەو ڕێژەی هەژاری تیایدا لەئاستێکی بەرزدایە، سەرچاوەی ئابووری هیندستان هەندێك کانزای وەك (ئاسن و گۆگردو ئەڵماس)ەو زەوی کشتوکاڵی کە (شەکرۆچا)ی لێ بەرهەم دەهێنرێت، لەهیندستاندا زیاد لە (١٥٩) زمان و (٤٣٩) زاراوەی جیاواز هەیە، یەکێك لەشتە سەیرەکانی هیندستان ئەوەیە، کەهیندو سیخەکان بۆئەوەی خۆیان لەگوناه پاك بکەنەوە، بەجلەوە خۆیان دەخەنە ڕووبارێکەوە کەناوی (ڕووباری لینج)ە، وەکاتێك مردوویەکیان لێ دەمرێت دەیخەنە ناو ڕووباری (لینج)ەوەو، پاشان دەیسوتێنن.

**٢٠٠٠ (هانز بليكس) سەرۆكايەتی ليژنەی (ئەنمۆڤيك)ی وەرگرت.**

**٢٠٠٨ كۆنگرەی بەجيهان ناساندنی جينۆسايدی گەلی كورد لەهەولێر دەستی بەكارەكانی كرد.**

## * ١/٢٧

**١٨٨٧ دروستكردنی بورجی ئيڤڵ لەپاريس[1].**

**١٩٤٨ ڕاپەڕينی كانوون دژی (ساڵح جەبر).**

**١٩٩٢ كۆنگرەی يەكەمی يەكێتی نيشتمانی كوردستان لەسلێمانی و هەولێر دەستی پێكرد.**

**١٩٩٧ هەڵبژاردنی (ئەسلاَن مەسخادۆف) بەسەرۆكی چيچان.**

**- ٢٠٠٨ كۆچی دوايی (جۆرج حەبەش) دامەزرێنەری بەرەی ميللی ڕزگاری فەلەستين.**

**- ٢٠٠٨ كۆچی دوايی (سۆهارتۆ)ی سەرۆكی پێشووی ئەندەنوسيا لەتەمەنی (٨٦) ساڵيدا.**

---

[1] - بورجی ئيڤڵ لەلايەن ئەندازيار (ئەلكساندەر ئيڤڵ)ەوە لەساڵی (١٨٨٧) دەستكراوە بەدروستكردنی و بە (٢٦) مانگ تەواوی كردووە (نۆ هەزار) تەن ئاسنی تيا بەكارهاتووەو ژمارەی پليكانەكانی دەگاتە (١٧٨٩) پليكانە، بورجەكە بۆ كەرنەڤاڵی پاريس دروستكرا، كە بەبۆنەی ساڵرۆژی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا سازكرابوو، كەسەدەيەك لەوەوپێش ڕووی دابوو، ئەم بورجە (٩٨٤) پێ بەرزەو (٧) مليۆن فرەنكی ئاڵتونی تێچووە، ئەم پارەيە لەماوەی (سێ مانگ و نيو)دا كەلەلايەن تەماشاكارانەوە كەلەهەموو دونياوە بۆ ديتنی دەهاتن دەستكەوتۆتەوە، ئێستا لەسەر ئەم بورجە (٦) دەزگای (TV)و (٨) ئيستگەی ڕاديۆ هەيە، بەحەوت ساڵ جارێك بۆياخ دەكرێتەوەو هەر جارەی (٤٠) تەن لەباشترين بۆيەی بۆ بەكاردێنن.

## * ١/٢٨

- ١٩٠٠ دامەزراندنی یەکێتی تۆپی پێی ئەڵمانیا.
- ١٩٨٦ کەشتی ئاسمانی (چالنچەر)ی ئەمریکی پاش (٧٢) چرکە لەهەڵدانی تەقیەوەو (٧) کەشتیەوانەکەی گیانیان لەدەستدا.

## * ١/٢٩

- ١٦٣٥ دامەزراندنی کۆڕی زانیاری فەرەنسی.
- ١٩٣٩ کردنەوەی ئیستگەی کوردی لەبەغدا.

## * ١/٣٠

- ١٩٤٨ کۆچی دوایی شۆڕشگێڕی هندی (غاندی)[١].
- ١٩٦٦ بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەی (دەنگ و باس).
- ١٩٩١ کۆچی دوایی (جۆن باردن) یەکەم داهێنەری (ترانزیستۆر).
- ١٩٩٧ کۆچی دوایی زانای گەورە (شێخ عوسمان سیراجەدینی نەقشبەندی)[٢].

---

[١] - موهانداس کرمشەند غاندی سەرکردەی بەناوبانگی هیند،ساڵی (١٨٩٦) لەدایك بووە، غاندی ناسراوبووە بە (مەهاتما) بەواتای دەروونی گەورە (النفس الكبيرة)، بانگەشەی بەرەنگاربوونەوەی ئاشتیانەی بێ توندوتیژی دەکرد، هەوڵی دەدا بۆ ڕزگارکردنی هیند لەداگیرکاری بەریتانی و، تەبایی و یەکێتی لەنێوان موسڵمان و هیندو سیغەکاندا، لەلایەن هیندۆسیەکی توندڕەوەوە کوژرا لەساڵی (١٩٨٤)، لەبەناوبانگترین دانراوەکانی ژیانی خۆیەتی بەناونیشانی (قصة تجاربي مع الحقيقة) لەساڵی (١٩٢٧).

[٢] - شێخ محەمەد عوسمان سیراجەدین لەساڵی (١٣١٤)ی کۆچی لەدایکبووە، لەپێنج ساڵیدا ئامادەی هەموو نوێژو جەماعەت و خەتمەکان بووەو لەدوای ئەوە (تمسك)ی لەخزمەتی شێخ (عەلائەدین)دا کردووە، بەلێبڕانەوە خەریکی خۆپەروەردەکردن و فێربوونی

٢٠٠٠ دووەمین کۆنگرەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) لەسلێمانی ...ستی پێکرا.

٢٠٠٠ هەڵبـژاردنی گـشتی لـەعێراق بـۆ (ئەنجومـەنی نوێنـەران)و ئەنجومـەنی پارێزگاکـان)و (ئەنجومـەنی نیـشتمانی کوردسـتان) لەیـەك کاندا.

# * ١/٣١

**ڕۆژی خۆپاراستن لەنەخۆشی گەڕی.**

---

زانسته شەرعیەکان بووە، لەتەمەنی (٣٠) ساڵیدا ئیجازەی ئیرشادی ڕەهای پێدرا، کەشێخ علاءالدین وەفاتی کرد، شێخ عوسمان لەبیارە لەپۆستی ئیرشاددا دەست بەکاربوو، موریـدو پـەیڕەوانێکی زۆر لەکوردسـتان و هەنـدێ وڵاتـی جیهـانی ئیـسلامیەوە پەیوەنـدیان پێوەکردووەو بەیعەتیان پێداوە، ساڵی (١٩٥٩) لەبەر ئاڵۆزی بـارودۆخی کوردسـتان کۆچـی کردووە بۆ کوردستانی ئێران و لەوێ خانەقای (دووڕووە)ی ئاوەدان کردۆتەوەو ماوەی (٢٠) سـاڵ لەئێرانـدا ماوەتـەوە، سـاڵی (١٩٧٩) گەڕاوەتـەوە بـۆ کوردسـتان، سـاڵی (١٩٨٠) هەوارگەی گواستۆتەوە بۆ بەغدادو پاشان چەند گەشتێکی بۆ (فەڕەنسا)و (بەریتانیا)و گەلێ لەوڵاتانی جیهانی ئیسلامی و ئەورووپی ئەنجامدا، لـەو گەشـتانەیدا زۆر کـەس لەسەردەسـتی ئیمانیـان هێنـاوەو تەمەسـوکیان کـردووە بەتەریقـەتی نەقـشبەندیەوە، وە لەزۆربـەی ئـەو وڵاتانەدا خانەقای کردۆتەوە، ساڵی (١٩٨٧) گەڕاوەتەوە بۆ بەغـداد، سـاڵی (١٩٩٠) کۆچـی کرد بۆ ئەردەن و لەوێوە بۆ تورکیا، لەشاری ئەستەنبوڵ گـەورەترین خانـەقای نەقـشبەندی دروستکرد، شێخ عوسمان شارەزای قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بووە، هەروەها کەسـێکی ئـەدەب دۆسـت و شـاعیر بـووە، دوو دیـوانی گـەورەی شـیعری بڵاوکردۆتـەوە، هەروەها چەند پەڕاوێکی نووسیوە لەوانە: تەفسیری هەندێك لەسورەتەکانی قورئانی پیرۆزو کتێبـی (سـراج القلـوب)و (طـب القلـوب)، لـە ٣٠ی کـانوونی دووەمـی (١٩٩٧) لەشـاری ئەستەنبوڵ کۆچی دوایی کردووە، شایەنی باسـە شـێخ مـەولانا خالیـدی بـرای ڕۆژێك پـێش لەوەفاتی ئەو لەکوردستانی ئێران کۆچی دوایی کرد.

- ١٩١٩ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان لەئەستەنبوڵ[1].

- ١٩٤٣ شەڕی (ستالینگراد) لەنێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانیا کۆتایی هات.

- ١٩٥٤ کۆچی دوایی (ئێدوین ئارمسترۆنگ) داهێنەری ڕادیۆی FM.

- ١٩٧٨ کۆچی دوایی شاسوار جەلال، ناسراو بە (شەهید ئارام).

- ١٩٨٧ کۆچی دوایی (ئیدریس مستەفا بارزانی).

---

[1] - کوردستان، بەتورکی و عوسمانی و، هەردوو زاراوەی کرمانجی خواروو و سەروو، هەندێ وتارو هۆنراوەی بەزمانی عەرەبی و فارسی تێدایە، بەمجۆرە خۆی دەناسێنێت: (حەفتەنامەیەکی سیاسی، ئیجتیماعی، ئەدەبی، عیلمیە)، خاوەنی ئیمتیازەکەی (محەمەد میهری)و سەرنووسەری (محەمەد شەفیق) بووە، دوا ژمارەی کە ژمارە (١٩)یە لە ٢٧ی مارتی (١٩٢٠) دەرچووە، ئەوەی تائێستا زانراوە، ئەم ڕۆژنامەیە چوارەمین ڕۆژنامەی کوردیە بەناوی (کوردستان)ەوە دەرچوویێ...

جاری یەکەم (١٨٩٨-١٩٠٢) کەمقداد مەدحەت بەدرخان لەقاهیرە دەستی پێکرد.

جاری دووەم (١٩٠٨) کەسورەییا بەدرخان، دوای سەرکەوتنی کودەتای عوسمانی لەئەستەنبوڵ دەری کردووە.

جاری سێیەم (١٩١٧) دووبارە سورەیا بەدرخان لەقاهیرە دەری کرد.

# مانگی شوبات ( فبرایر )

## * ٢/١

١٢٤٣ ئـازادكردنی (بیـت المقـدس) لەلایـەن سـەركردەی موسـڵمانی كورد (سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی).

- ١٩٢٩ سەربەخۆیی (ڤاتیكان) لەئیتاڵیا[1].

- ٢٠٠١ كۆچی دوایی (م. عەبدولمەجید جەلی زادە).

- ٢٠٠٤ تەقاندنـەوەی هـەردوو بارەگـای لقـی دووی (پـارتی دیموكراتی كوردستان)و مەڵبەندی سێی (یـەكێتی نیشتمانی كوردستان) لەهـەولێر لەیەك كاتدا.

## * ٢/٢

- ١٩٧١ سەربەخۆیی (ئیماراتی عەرەبی) لەبەریتانیا.

- ٢٠٠٠ هێزەكانی چیچان لەگرۆزنی پایتەخت كشانەوە.

## * ٢/٣

- ١٩٧٥ كۆچی دوایی گۆرانی بێژی عەرەب (ئوم كەلسوم).

- ١٩٩٩ كۆچی دوایی مۆسیقار (م. ئەحمەد بەرزنجی) لەهەولێر.

---

[1] - (ڤاتیكـان) مەڵبەنـدی پاپـای ڕۆمایـەو دەوڵـەتێكی نیمـچە سـەربەخۆیە، لەهـەرێمێكی ناوجەرگەی پایتەختی ئیتاڵیادا، ڕووبەرەكەی نزیكەی نیو كم٢، دانیشتوانی لە (١٠٠٠) كەس تێناپـەڕێت، ئـەم دەوڵەتـە بـەگوێرەی ڕێكەوتننامـەی (لاتـیران) لەسـاڵی (١٩٢٩) لەلایـەن ئیتاڵیـاوە دانـی پیـادانراوە، (پاپـا) سـەرۆكی دەوڵەتەكەیـەو هـەر سـێ دەسـەڵاتەكەی بەدەستەوەیەو نوێنەری سیاسی لەزۆربـەی وڵاتـانی جیهانـدا هەیـە، پاپـا سـەرۆكی ڕۆحـی ئاینیەو ڤاتیكان دڵی زیندووی كڵێسای كاسۆلیكەو شوێنی پیرۆزی مەسیحیەكانە.

**- ٢٠٠٠ یەکەم هەڵبژاردنی شارەوانیەکان لەناوچەکانی (ئیدارەی سلێمانی) حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەنجامدرا.**

**- ٢٠٠١ (شێخ ئەسعەد جۆشان)و چەند هاوەڵێکی لەتورکیا گیانیان لەدەستدا.**

## * ٢/٤

**- ١٩٤٨ سەربەخۆیی سیریلانکا لەبەریتانیا[١].**

**- ١٩٩٥ سەرهەڵدانی (بزووتنەوەی تاڵیبان) لە ئەفغانستان.**

**- ١٩٩٩ کۆچی دوایی (د. سەعید بارزانی).**

**- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی مۆسیقاری ناوداری ئێرانی (یاحەقی).**

## * ٢/٥

**- ١٩٢١ یەکەمین فیلمی سینەمایی هونەرمەند (شارلی شاپلن) نمایشکرا.**

**- ١٩٤٦ پێشەوا (قازی محەمەد) کرا بەسەرۆك کۆماری مەهاباد.**

## * ٢/٦

**- ١٩٣٥ کۆچی دوایی شاعیر (ئەحمەد موختار جاف).**

---

[١] - سریلانکا دەوڵەتێکی کۆماریە لەنۆقیانووسی هیندی و پایتەختەکەی شاری (کۆلۆمبۆ)یە، ڕووبەرەکەی (٦٥٦١٠ کم٢)، ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی (٢٠) ملیۆنە، دراوی فەرمی وڵات (ڕووپیێ)یەو گەورەترین و گرنگترین بەرهەمی (چا)یە، جگە لەبەرووبوومی تری وەك (برنج و گوێزی هندی و مەطاط)، پورتوگالیەکان لەسەدەی شانزەوە دەستیان بەسەر (سیریلانکا)دا گرتبوو، تا هۆڵەندیەکان لە (١٦٥٨)دا دەریانکردن لێی، دوای ئەوە لە (١٧٩٥)دا بەریتانیا داگیری کرد تا ساڵی (١٩٤٨) کۆتایی بەدەسەڵاتی بەریتانیا هات و (سیلان) بوو بەدەوڵەتێکی سەربەخۆ.

**- ١٩٩٢ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (پەیامی ڕاستی) لەسلێمانی.**

**- ١٩٩٤ ئیعلانکردنی (یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان).**

**- ١٩٩٧ کۆچی دوایی ڕۆماننووسی ئێرانی (بوزورگی عەلەوی)[1].**

---

[1] - بوزورگ ساڵی (١٩٠٤) لەدایك بووە، حاجی سەید ئەبولحەسەنی باوکی دەینێرێت بۆ ئەڵمانیاو لەوێ خوێندن تەواو دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ئێران و خەریکی مامۆستایی و کاری نووسین دەبێت، ساڵی (١٩٢٨) لەگەڵ (صادق هیدایەت)دا دەبنە ئاشناو پاشانیش (شیراز زادە پەرتو) دەناسن و پێکەوە خەریکی پڕۆژەیەکی ئەدەبی دەبن کەتیایدا بەرگری لەپاراستنی ڕەسەنایەتی کەلتوری ئێران دەکەن، دواتر (د.ئارانی) دەناسێت کە یەکێکە لەڕۆشنبیرانی ناسراوی ئەو سەردەمەو لەساڵی (١٩٢٥-١٩٢٧)دا دکتۆرا لەفەلسەفەو کیمیادا وەردەگرێت و لەزانکۆی بەرلین و پاشان دەبێتەوە بە مامۆستای لۆژیك (مەنتق) لەهەمان زانکۆداو چەندەها کتێبی زانستی و ئەدەبی دەنووسێت، پاشان بەڕابەرایەتی (د.ئارانی) گروپی (پەنجاو سێ کەس) پێکدێت کە ئامانجیان پەرەدان بەبواری ڕۆشنبیری و خەباتکردن لەپێناوی ئازادیدا دەبێت، تا لەساڵی (١٩٣٧)دا هەر پەنجاو سێیان دەگیرێن و زیندانی دەکرێن، عەلەوی لەماوەی زیندانی کردنیشیدا هەر سەرگەرمی نووسین دەبێت، ساڵی (١٩٤٦) کاتێك وڵات دووچاری پاشاگەردانی دەبێت ئەندامەکانی ئەو گروپە ئازاد دەکرێن، بوزورگ لەسەرەتای نوسینەکانیدا دەکەوێتە ژێر کاریگەری (هێرمان هۆسەو چیخۆف و شیلەرو دۆستۆیڤیسکی)یەوە، هەربۆیە هەندێ لەکارەکانی ئەو نوسەرانەش وەردەگێڕێت، لەوانە (خاتوونەکەی ئۆرلیان)ی شیللەرو (باخی گێلاس)ی چیخۆف، لەبەرهەمەکانی عەلەوی: (جانتا، پارچە کاغەزەکانی بەندیخانە، پەنجاو سێ کەس، نامەکان، میرزا، پیاوە گەورەکان، چاوەکانی)، زۆربەی ڕەخنەگران ڕۆمانی (چاوەکانی) بەسەرکەوتووترین کاری عەلەوی لەقەڵەم دەدەن، کە لەماوی (١٠) ساڵدا چوارجار لەئێراندا چاپکراوەتەوەو لە ئەورووپاش تا ساڵی (١٩٦٠) تیراژی گەیشتە سەد هەزار دانە، جێی ئاماژەیە ئەم ڕۆمانە لەلایەن (ئازاد بەرزنجی)ەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی، بوزورگ لەشوباتی (١٩٩٧) کۆچی دوایی کردووە.

## * ٢/٧

- ١٨١٢ ڕۆماننووسی ئینگلیز (چارلس دیکنز) لەدایك بوو.
- ١٩٠٠ دامەزراندنی (پارتی کرێکارانی بەریتانیا).
- ١٩٩٩ کۆچی دوایی پادشای ئوردون (مەلیك حسەین).
- ٢٠٠٧ (کۆمکاری زیندانیە سیاسیەکانی کوردستان) لەهەولێر دامەزرا.

## * ٢/٨

- ١٧٢٥ (پیتەری یەکەم) قەیسەری ڕوسیا کۆچی دوایی کرد.
- ١٩١٤ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (بانگی کورد) لەبەغداد[١].
- ١٩٦٣ لەکودەتایەکدا حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم ڕوخێنرا.
- ١٩٦٣ دەرچوونی دوا ژمارەی ڕۆژنامەی (ژین) لەسلێمانی.
- ١٩٨٢ کارەساتی شارۆچکەی (دوجەیل) لەلایەن ڕژێمی بەعس.
- ١٩٨٤ کۆچی دوایی (مامۆستا مەلا محەمەدی خورماڵ).
- ٢٠٠٠ ئیسرائیل وێستگەی کارەبای لوبنانی خاپورکرد.

---

[١] – یەکەم ژمارەی بانگی کورد لە ٨ی شوباتی (١٩١٤) لەبەغداد دەرچووە، بانگی کورد بایەخی زۆری بەبابەتی جۆراوجۆری ئایینی و ڕۆشنبیری و کشتوکاڵی و مێژوویی دەدا، (جەمال بابان) دایمەزراندو سەرپەرشتی نووسین و دابەشکردنەکەشی دەکرد لەسەرانسەری کوردستانی عێراق ودەرەوەدا، هەریەك لە (عومەر نەزمی)و (عەلی کەمال باپیر) یاریدەدەری بوون، دیارترین نووسەرەکانیشی (شوکری فەزڵی)و (بەهادین شێخ نوری) بوون، گۆڤاری (بانگی کورد) لەڕاستترین بۆچووندا پێنج ژمارەی لێ دەرچووەو بەقەبارەی (٢٢,٥*١٥,٥سم)و بە (٢٤) لاپەڕە لە چاپخانەی (الاداب) چاپکراوە.

## * ٢/٩

- ١٩٦٠ ڕۆژنامەی (دەنگی کورد) لەبەغدا دەرچوو.
- ١٩٦٣ کوژرانی یەکەم سەرۆك وەزیرانی عێراق (عەبدولکەریم قاسم).
- ١٩٩٢ کۆچی دوایی (مامۆستا ئەحمەدی موفتی زادە)[١].
- ٢٠٠٣ تیرۆرکردنی (شەوکەتی حاجی موشیر) لەشارەزوور.

## * ٢/١٠

- ١١٣٨ لەدایك بوونی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی.
- ١٢٥٨ هۆلاکۆ شاری بەغدای داگیرکرد.
- ١٩٥٩ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (ڕزگاری) لەبەغداد.
- ١٩٧٠ دامەزراندنی (یەکێتی نووسەرانی کورد).

---

[١] - ناوی (کاك ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحمودی موفتی زادەی مەلا عەبدوڵا)ی (دشە)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، ساڵی (١٩٣٤) لە(سنە) لەدایکبووە، مەلا مەحمودی باوکی موفتی شاری سنە بووە، سەرەتای خوێندنی لەمزگەوتی (دار الاحسان)ی شاری سنە لەلای باوکی بووە، لەتەمەنی شانزە ساڵیدا بۆ خوێندن هاتۆتە سلێمانی و ماوەیەکیش لەمزگەوتی (حاجی حان)ی سلێمانی بووە، دوای ساڵێك دەگەڕێتەوە بۆ سنەو لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێت، ساڵی (١٩٦٣) زیندانی دەکرێت، لەسەرەتای حەفتاکانەوە لەڕادیۆی سنە بەرنامەیەکی پەروەردەیی ئیمانی دەبێت، لەساڵی (١٩٧٦) (مەکتەب قورئان) دادەمەزرێنێت کەقوتابخانەیەکی فیکری ئەخلاقی بووە، لەساڵی (١٩٧٩) بەشداری شۆڕشی ئێرانی کردووەو ڕابەرایەتی شۆڕش بووە لەشاری سنەو شارە کوردنشینەکانی ئێران، ساڵی (١٩٨٢) دەستگیردەکرێت و دە ساڵ لەزینداندا دەمێنێتەوە، کاك ئەحمەد کەسایەتیەکی ناودارو بیریارێکی زیرەك و خوانـاس و شاعیرو ڕۆشنبیرێکی بەتوانا بووە، بەهۆی مانەوەی لەزینداندا دووچاری نەخۆشیەك دەبێت، سەرەنجام لەبەرواری ١٩٩٢/٢/٩ لەنەخۆشخانەیەکی تاران کۆچی دوایی دەکات و لەشاری سنە بەخاك دەسپێردرێت.

## * ٢/١١

- ١٦٥٠ كۆچی دوایی فەیلەسوفی فەرەنسی (ڕێنیە دیكارت)[١].
- ١٨٤٧ لەدایك بوونی داهێنەری گڵۆپی كارەبا (ئەدیسۆن).
- ١٩٣١ كۆچی دوایی (چاڕلس پارسۆنس) داهێنەری تۆربینی هەڵمی.
- ١٩٤٦ پێكهاتەی حكومەتی مەهاباد ڕاگەیەنرا.
- ١٩٧٩ سەركەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران بەسەر شادا.
- ١٩٩٠ ئازادكردنی سەركردەی ئەفریقیای باشوور (نێڵسن ماندێلا)، دوای (٢٧) ساڵ زیندانی، كەدواتر لەساڵی (١٩٩٢) خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت.

## * ٢/١٢

- ١٨٠٩ لەدایك بوونی (چاڕلس داروین).
- ١٨٥٢ كۆچی دوایی نووسەری ڕووسی (گۆگۆڵ).

---

[١] – فەیلەسوف و بیركاریزانی فەرەنسی (ڕێنیە دیكارت) ساڵی (١٥٩٦) لە گوندی (لاهای) لەدایكبووە، لە (٢٠) ساڵیدا بڕوانامەی پارێزەری وەرگرتووە، لە ساڵانی (١٦١٦–١٦٢٨) گەشتی بۆ (ئیتاڵیاو پۆڵەنداو پورتوگاڵ) كردو (٢١) ساڵ لە پۆڵەندا مایەوە، سەرنج و تێڕوانینەكانی بوونە ڕێبازێكی گشتی بۆ گەڕان بەدوای ڕاستیدا، (دیكارت) گومانكردن لەهەموو شتێكی كردۆتە ڕێبازێكی تایبەتی چەسپاندنی بیروڕاكەی، كە ئەویش ئەوەیە: چۆن مرۆڤ دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر گوماناو ڕاستی بۆ دەربكەوێت، دیكارت وتەیەكی بەناوبانگی هەیە كەدەڵێت: (من بیردەكەمەوە كەواتە من هەم)، هەر لەم سەرەتایەوە دەچێت بۆ چەسپاندنی بوونی خوداو جیهان، جگە لەوە دیكارت گەلێ بیردۆزەو چاكسازی لە بیركاری پەروەردەدا هەیە، ئەندازەی شیكاری لە (١٦٣٧)دا دۆزیوەتەوەو ئەندازەی گۆڕیوە بۆ هاوكێشەی جەبری و لەفیزیادا جێبەجێی كردووە، لەساڵی (١٦٥٠) لەسوید كۆچی دوایی كردووە.

- ١٩١٢ دامەزراندنی (کۆماری چین).

- ١٩٤٩ تیرۆرکردنی (حەسەن بەننا) دامەزرێنەری کۆمەڵی برایانی موسڵمان لەمیسر[١].

- ١٩٩٣ کۆچی دوایی مەقام بێژی کورد (مەلا سدیق تۆفیق)[٢].

- ٢٠٠٥ تیرۆرکردنی ڕۆژنامەنووس (دلێر عەلی کەرەم) لەبەغداد.

---

[١] - حەسەن بەننا لەساڵی (١٩٠٦) لەشارۆچکەی (مەحمودیە)ی میسر لەدایکبووە، باوکی گەناوی (ئەحمەد عەبدولڕەحمان ساعاتی)یە، زانایەکی ناوداربووە لەزانستی فەرموودە، بەننا خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لەمەحمودیە تەواوکردووە، لە ١٤ ساڵی قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە، پاشان بۆخوێندن چووەتە پەیمانگای مامۆستایان لە (دمنهور) و لەوێ کەوتە بانگەوازکردن و پێکهێنانی کۆمەڵەو ڕێکخراو بۆ ڕێنموونی خەڵکی، کە لەوکاتەدا تەمەنی ١٩ ساڵان بووە، ساڵی (١٩٢٣) چووە بۆ (دارالعلوم) لەقاهیرەو ساڵی (١٩٢٧) بەپلەی یەکەم تەواوی کردووە، پاشان بووە بەمامۆستا لە (ئیسماعیلیە)، ساڵی (١٩٢٨) لەگەڵ شەش کەس لەهاوبیرەکانی کۆمەڵەی برایانی موسڵمان (إخوان المسلمین)ی دامەزراند، ساڵی (١٩٣٢) مەڵبەندی گشتی برایانی لەقاهیرە کردەوەو بانگەوازەکەشی بەهەموو پارێزگاکانی میسردا بڵاوکردەوە، لەسەرەتای سییەکانەوە چەندین لقی ڕێکخراوەکەی لەزۆرێك وڵاتاندا کرانەوەو ژمارەی لایەنگرانی گەیشتە نیو ملیۆن کەس، کاتێك لەساڵی (١٩٤٨) جەنگ دژی جوولەکە بەرپاکرا، بەننا دەهەزار سەربازی ڕێکخراوەکەی نارد تابەشداری ئەو جەنگە بکەن، لە ١٩٤٨/٥/٣١ کۆمەڵەی برایان بەفەرمانی (مەلیك فاروق) هەڵوەشێندرایەوەو زۆربەی ئەندامەکانی دەستگیرکران، تاوەکو لە مانگی شوباتی (١٩٤٩) حەسەن بەنناش تیرۆرکرا.

[٢] - مەلا سدیق یەکێکە لە مەقام بێژە ناودارەکانی کوردو لەساڵی (١٩١٢) لەدایك بووە، ناوی تەواوی (سدیق تۆفیق خدر زەنگەنەیە)، مەلا سدیق شارەزاییەکی زۆری لەچڕینی هەموو جۆرەکانی مەقامدا هەبووەو شیعری زۆربەی شاعیرانی کوردی وەرگێڕاوە بۆ فارسی، وە جگە لەزمانی زگماکی خۆی بەزمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی مەقامی خوێندووە، لەشوباتی (١٩٩٢) لەکەرکووك کۆچی دوایی کردووە.

- ٢٠٠٧ بڕیاری لەسێدارەدان بۆ (تەها یاسین ڕەمەزان) دەرچوو.

# * ٢/١٣

- ٢٠٠٠ کۆچی دوایی (چاڕلس شوڵدز) داهێنەری کارتۆنی (پینەت).

# * ٢/١٤

- ڕۆژی عاشقانی جیهان.
- ١٩٤٩ لەسێدارەدانی یوسف سەلمان یوسف، ناسراو بە (فەهد) دامەزرێنەری (حیزبی شیوعی عێراقی).
- ١٩٥٨ (یەکێتی هاشمی) لەنێوان (عێراق و ئوردون) ڕاگەیەنرا.
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی قورئان خوێن (سەید نەقشبەندی).
- ١٩٨٢ کۆچی دوایی (شێخ ئەحمەدی شاکەلی).
- ٢٠٠٥ تیرۆرکردنی ڕەفیق حەریری سەرۆک وەزیری پێشووی لوبنان[١].

# * ٢/١٥

- ١٥٧٠ کۆچی دوایی شێخ عەبدولقادری گەیلانی.
- ١٩٣٠ دەرچوونی یاسای خانەنشینی لەعێراق.
- ١٩٤٩ دەرچوونی دوا ژمارەی گۆڤاری (نزار).
- ١٩٩٣ کۆچی دوایی (محەمەد قەفتان) خاوەنی چاپخانەی (کامەرانی) لەسلێمانی.

---

[١] - ڕەفیق حەریری ساڵی (١٩٤٤) لەشاری صەیدای لوبنان لەدایك بووەو کۆلیژی بازرگانی لەزانکۆی بەیروت تەواو کردووە، بۆ یەکەم جار لەساڵی (١٩٩٢) بووەتە سەرۆك وەزیرانی لوبنان، جارێکی تریش لەساڵانی (٢٠٠٠- ٢٠٠٤) بووەتەوە بەسەرۆك وەزیران، پێش تیرۆرکردنیشی سەرۆکایەتی فراکسیۆنی (بڕیاری بەیروت)ی لەناو پەرلەمانی لوبناندا دەکرد، لە ٢٠٠٥/٢/١٤ لەخۆرئاوای بەیروت تیرۆرکرا.

- ١٩٩٩ دەستگیرکردنی (عەبدوڵڵا ئۆجەلان) سکرتێری پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیا[1].

---

[1]- ئۆجەلان لەساڵی (١٩٤٦) لەگوندی (ئۆمەرلی) هەرێمی (ئورفە)ی باکوری کوردستان لەدایك بووە، (ئۆجەلان) واتە (تۆڵەسێن)، هەروەك بە (ئاپۆ)ش ناسراوە کەبەمانای (مامە) دێت، ئۆجەلان بەمنداڵی تورکی نەزانیوە بەڵام بەناچاری لەقوتابخانەی سەرەتایی فێری بووە، ساڵی (١٩٦٦) چۆتە زانکۆی ئەنقەرەو کۆلیژی (زانستە سیاسیەکان)ی تەواو کردووە، ساڵی (١٩٧٠) بەشداری خۆپیشاندانێکی قوتابیانی کردووەو لەئەنجامدا زیندانی کراوە، ئەو بەندکردنەی سەرتاپا ژیانی گۆڕی و باوەڕی بەبیری مارکسی هێنا، ساڵی (١٩٧٤) لەگەڵ چەند خوێندکارێکی دیکەدا دامەزراوەی (پەروەردەی باڵای ئەنقەرە)یان پێك هێنا، لە ٢٧ی تشرینی یەکەمی (١٩٧٨) (پارتی کرێکارانی کوردستان)ی دامەزراند، ساڵی (١٩٧٩) ئۆجەلان هەستی بەمەترسی کودەتایەکی سەربازی کرد، بۆیە لەترسی ئەوەی نەوەك دەستگیربکرێ، وڵاتی بەجێهێشت و چوو بۆ سوریا، کودەتا سەربازیەکەی تورکیا لە (١٩٨٠) ڕوویدا، ئۆجەلانیش لەسوریا مایەوەو لەوێوە سەرکردایەتی پارتەکەی دەکرد، تا مانگی تشرینی یەکەمی (١٩٩٨) کەسوریا ناچاربوو لەژێر فشاری تورکیادا ئۆجەلان لەوڵاتەکەی دەربکات، ئاپۆ لەسەرەتای شۆڕشەکەیدا داوای دەوڵەتی کوردی سەربەخۆی دەکرد کە لەسەر بنەمای مارکسی دابمەزرێ، بەڵام دواتر ئامانجەکەی گۆڕا بۆ ئۆتۆنۆمی یان فیدراڵی لەچوارچێوەی دەوڵەتی تورکیادا، ئۆجەلان پاش ڕۆیشتنی لەسوریا لە ١٥ی شوباتی (١٩٩٩) لە (کینیا) دەستگیرکراو تەسلیم بەتورکیا کرایەوە، پاش دەستگیرکردنی سەرۆکەکەیان، پەکەکە زۆربەی گەریلاکانی لەکوردستانی تورکیا کشاندەوەو هەموو پەلامارێکی دژی تورکیا وەستاند، لەگەڵ ئەمانەشدا ئۆجەلان بەتاوانی ناپاکی (خیانەت) لە ٢٩ی حوزەیرانی (١٩٩٩) بڕیاری لەسێدارەدانی بۆدەرچوو، بەڵام داگای ئەورووپی بۆ مافەکانی مرۆڤ داوای کرد لەسێدارەدانەکە دوابخات، لەساڵی (٢٠٠٢) تورکیا بڕیاری لەسێدارەدانی هەڵوەشاندەوە، لەئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا سزای لەسێدارەدان بۆ ئۆجەلان گۆڕا بۆ زیندانی هەمیشەیی، تائێستاش (٢٠٠٨) ئۆجەلان لە دوورگەی (ئیمرالی) لەزینداندا درێژە بەژیان دەدات.

## * ٢/١٦

- ١٩٢٥ کۆچی دوایی نووسەری ناوداری کورد (ئەمین فەیزی بەگ)[1].

## * ٢/١٧

- ١١٦٠ سوتاندنی زانای ئیتالّی (جیۆردانۆ) بەدەستی کلّێسای ڕۆما.
- ١٨٩٠ کۆچی دوایی (کریستۆڤەر لاسام شۆلس) داهێنەری ئامێری چاپکردن (Typewriter).
- ١٩٩٨ کۆچی دوایی (خاتوو مینا) هاوسەری پێشەوا قازی محەمەد.
- ٢٠٠٨ سەربەخۆیی (کۆسۆڤۆ) لەسڕبیا.

## ٢/١٨*

- ١٩٥٢ دامەزراندنی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)و (یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان).
- ١٩٦٥ سەربەخۆیی (گامبیا) لەبەریتانیا.
- ١٩٧٦ یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (العراق) دەرچوو.

---

[1] – ئەمین فەیزی یان محەمەد بەگ کوڕی دەروێش ئاغایە، سالّی (١٨٦٣) لەسلێمانی لەدایکبووە، فەیزی نازناوە، (بەگ) پلەی سەربازیە ئەگینا بەگزادە نیە، ئەمین فەیزی پاش تەواوکردنی قوتابخانەی (ڕوشدیە) نێرراوەتە بەغدادو لە ئامادەیی عەسکەری وەرگیراوە، پاش وەرگرتنی بڕوانامە چۆتە ئەستەنبولّ و لەبەشی ئەندازیاری تۆپخانە وەرگیراوە، لەبەغدادو ئەستەنبولّ چەند پۆستێکی پێدراوە، سالّی (١٩٠٤) سەردانی مالّی خوای کردووە، لە (١٩١٣) خانەنشین کراوە، بۆ سەردان و چارەسەری نەخۆشی چووە بۆ ڤیەنناو پاریس، سالّی ١٩٢٥ لەئەستەنبولّ کۆچی دوایی کردووە، چەندین بەرهەمی چاپکراوو چاپ نەکراوی بەزمانی تورکی و کوردی نووسیوە، کە بەناوبانگترینیان کتێبی (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد)ە، کە بەرهەمی پانزە شیعری کوردی لەخۆگرتووە.

- ٢٠٠١ تیرۆرکردنی (فرەنسۆ هەریری) لە هەولێر[١].

## * ٢/١٩

- ١٩٨٨ دەست پێکردنی پرۆسەی شالاوی (ئەنفال)ی یەك لەدۆڵی جافایەتی.

## * ٢/٢٠

- ١٩١٨ لەدایك بوونی (دڵدار)ی شاعیر.
- ١٩٩٩ کوژرانی (ئایەتوڵڵا محەمەد صادق) لەنەجەف.

## * ٢/٢١

- ڕۆژی جیهانی زمانی دایك.
- ١٨٩٣ دامەزراندنی (یەکێتی تۆپی پێی ئەرجەنتین).
- ١٩٤٦ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (هەڵاڵە) لە بۆکان.
- ١٩٩١ کۆچی دوایی (هەژار موکریانی) شاعیر لەتاران[٢].

---

[١] - فرەنسۆ هەریری ساڵی (١٩٣٧) لەشارۆچکەی (هەرین)ی سەر بەپارێزگای هەولێر لەخێزانێکی مەسیحی لەدایکبووە، ساڵی (١٩٦٠) بووە بەمامۆستا، ساڵی (١٩٦٣) بەشداری شۆڕشی ئەیلوولی کردووە، هەریری ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان و بەرپرسی لقی (٢) بووەو، لە ساڵی (١٩٩٢)شدا بووە بەئەندامی (ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان)و سەرۆکی فیدراسیۆنی زەرد لەو ئەنجومەنە، لە ١٨ی شوباتی ٢٠٠١ لەناو شاری هەولێر تیرۆرکرا.

[٢] - هەژار موکریانی، ناوی (عەبدولڕەحمان شەرەفکەندیە)، شاعیرێکی ناوداری کوردە، ساڵی (١٩٢١) لەشاری (مەهاباد) لەدایکبووە، بۆ خوێندن زۆر شوێن گەڕاوە، لەتەمەنی لاویدا دەستی بەشیعر هۆنینەوە کردووە، لەساڵی (١٩٤٣) بووە بەئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ك) و لەگەڵ (هێمن)ی شاعیردا ڕۆڵی گرنگیان لەیەکەمین (وەزارەتی ڕاگەیاندن)ی کۆماری

## * ٢/٢٢

- ١٨١٠ لەدایك بوونی مۆسیقاری فەڕەنسی (شۆپان).
- ١٩٧٤ كۆچی دوایی ئەدیبی كورد (لەتیف حامید).
- ٢٠٠٦ تەقاندنەوەی مەزارگەی هەردوو ئیمام (علی الهادی)و (حسن العسكری) لەسامەڕا.

## * ٢/٢٣

- ١٨٥٥ كۆچی دوایی (كارل فردریك گاوس) دانەری یاسای گاوس[1].
- ١٩٢٣ هاتنی سمایل خانی شكاك (سمكۆ) بۆ سلێمانی بۆ پشتگیری شێخ مەحموودی حەفید[2].

---

كوردستاندا هەبووە، پاش ڕووخانی كۆمارەكە لە (١٩٤٦) دەربەدەری سوریاو عێراق بووە، هەژار لەگەڵ (هێمن و هێدی) بەسێكوچكەی قوتابخانەی شیعری مەهاباد دادەنرێن، شیعرەكانی زۆربەی نیشتمانپەروەرین، زمانی فارسی و توركی بەباشی زانیوە، هەژار جگە لەشیعر لەبواری زمان و فەرهەنگسازیدا باڵادەست بووە، كتێبی (شەرەفنامە)ی لەفارسیەوە كردووە بەكوردی و لە (١٩٧٣) لەبەغداد چاپی كردووە، (١٨) كتێبی تری لەبواری تردا وەرگێڕاوە، ساڵی (١٩٩١) لە(تاران) كۆچی دوایی كردووە.

[1] – گاوس لەئازاری (١٧٧٧) لەئەڵمانیا لەدایكبووە، ماتماتیكزانێكی زیرەك و بلیمەت بووە، گاوس لەساڵی (١٧٩٦) تیۆری ژمارەی داهێنا، وە لەساڵی (١٨٣١) بەهاوكاری لەگەڵ زانای فیزیایی (ولیەم وێبەر) كارێكی گەورەی ئەنجامدا كەبووە هۆی داهێنانی نوێ لەبواری موگناتیسیدا، لەوانە: (دۆزینەوەی یەكەی موگناتیسی لەلایەنی بارستایی و درێژی و كاتەوە، وە دۆزینەوەی یاساكانی سوڕە كارەبای كریچۆڤ لەكارەبادا)، ساڵی (١٨٣٣) (گاوس و وێبەر) یەكەمین تەلەگرافی كارۆموگناتیسیان داهێنا.

[2] – لە ڕۆژی ٢٣ی شوباتی ١٩٢٣ سمایل خانی شكاك بەخۆی و (٤٠٠) سەربازەوە گەیشتە شاری سلێمانی، بۆ پشتگیریكردنی حكومەتە نوێیەكەی شێخ مەحموود، سەردانەكەی

١٩٢٦ کۆچی دوایی شاعیر (جەمیل سدقی زەهاوی).

٢٠٠٠ کۆچی دوایی مامۆستا (شێخ محەمەد ئەمینی بەڵخەیی).

٢٠٠٦ تیرۆرکردنی (ئەتوار بەهجەت) پەیامنێری کەناڵی ئاسمانی (العربية) لەعیراق.

## ٢/٢٤*

- ١٩٢٤کۆچی دوایی مێجەرسۆن حاکمی سیاسی ئینگلیز لەسلێمانی[١].

---

سمکۆی شکاک بۆ سلێمانی بووە جێی نارەزایی دەسەلاتدارانی بەریتانیاو ڕۆژێك دواتر لەڕێگەی فڕۆکەوە بەیاننامەیەکیان بەسەر شاری سلێمانیدا بڵاوکردەوەو ئاگاداری (شێخ مەحمود)و (سمایل خان)یان کردبوو کە ئەگەر سمکۆی شکاک لەماوەی (٢٤) کاتژمێردا سلێمانی بەجێنەهێڵێ، ئەوا فڕۆکەکانی ئینگلیز شارەکە بۆردومان دەکەن، لەو گەشتەیدا سمکۆ سەردانی چەند شارێکی تری کوردستانی کرد.

[١] مێجەرسۆن سالی (١٨٨١) لەبەریتانیا لەدایکبووە، سالی (١٩٠٢) چووە بۆ ئێران و لەبانکی (شاهنشاهی) دامەزراوە، دواتر بووە بە سەرۆکی بانکی (کرماشان)و سالی (١٩٠٧) وازی لێهێناوە، (مێجەرسۆن) یەکێك بوو لەئەفسەرانی بەریتانیا کەمەبەستی ناسینی کۆمەڵگەی کوردی لەپێش جەنگی جیهانی یەکەمەوە ڕەوانەی کوردستان کرابوو، ماوەیەکی زۆر لەکوردستاندا بەناوی (میرزا غولام حسێن شیرازی)یەوە کاری کردووەو زمانی کوردی و فارسی بەباشی زانیوە، لەسالی (١٩١٦) کراوە بەجێگری کونسوڵی بەریتانیا لە (دیزەفوڵ)، دوای داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەکانەوە (سۆن) لەسالی (١٩١٨) لەگەڵ (شوکری فەزلی) ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) بەزمانی کوردی لە (بەغداد) دەرکردووە، (سۆن) لەسالی (١٩١٩) گوێزرایەوە بۆ سلێمانی و بوو بەحاکمی سیاسی ئینگلیزو ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی بەزمانی کوردی دەرکرد، هەروەها کتێبێکی بەناونیشانی (کوردو عەرەب و تورك) نووسیوە، کەباسی ئەدەب و مێژوو و کۆمەڵی کوردەواری تیا کردووە، (مێجەرسۆن) [illegible] ئەفسەری بەریتانیە کە لەناو کۆمەڵگەی کوردیداو لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی [illegible]ودی حەفید)دا ڕۆڵی هەبووە.

- ١٩٢٦ دامەزراندنی (کۆمەڵی زانستی کوردان) لەسلێمانی.
- ١٩٥٥ مۆرکردنی پەیمانی بەغداد لەنێوان (تورکیاو عێراق)دا، کەدواتر (بەریتانیاو پاکستان و ئێران)یش بوونە ئەندام تیایدا.

## * ٢/٢٥

- ١٥٤٣ لەدایکبوونی مێژوونووسی بەناوبانگی کورد (شەرەفخانی بەتلیسی)[١].
- ١٩٣٨ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (زانستی) لەسلێمانی[٢].
- ١٩٦٤ (محەمەد عەلی کلای) بووە پاڵەوانی جیهان لەیاری (مشتەکۆڵە).

---

[١] - مێژوونووسی بەناوبانگی کورد (شەرەفخانی بەتلیسی) لەگوندی (گریهوود)ی نزیك شاری (قوم)ی ئێران لەدایکبووە، دوای کۆچی باوکی لەتەمەنی (٣٠) ساڵیدا بووە کراوەتە (میری کوردان) لەئێران، دواتر کراوەتە والی (گەیلان)و ساڵی (١٥٧٦)یش (شائیسماعیلی دووەم) شەرەفخانی کردۆتە یەکێك لەئەندامانی بنەماڵەکەی خۆی و کردویەتی بەوالی ویلایەتی (ئەخچەوان) لەناوچەی قەوقاز، ساڵی (١٥٧٨) گەڕاوەتەوە بۆ ویلایەتی (بەتلیس)ی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و کراوە بەوالی (بەتلیس)، بەڵام دواتر بەمەبەستی تەواوکردنی کتێبی (شەرەفنامە) وازی لەویلایەتی هێناوەو (شەمسەدین)ی کوڕی لەجێی خۆی داناوە، شەرەفخان لە ساڵی (١٦٠٣) یان (١٦٠٤)دا کۆچی دوایی کردووە.

[٢] - زانستی، گۆڤارێکی نیومانگی (زانستی) بوو، لەشاری سلێمانیدا دەرچووەو (ساڵح قەفتان) سەرنووسەری بوو، (جەبار جەباری) مێژووی دەرچوونی بە ١٩٣٨/٢/١٥ دیاری کردووە، بەڵام (د.کەمال مەزهەر) پێی وایە لە ١٩٣٨/٢/٢٥دا دەرچوویێت، گۆڤارەکە نوێنەرایەتی کۆمەڵەی (زانستی کوردان)ی دەکرد، کەقوتابخانەیەکی ئێوارانیشی بۆ فێربوونی گەورەکان کردۆتەوە، گۆڤارەکە تەنها یەك ژمارەی لێ دەرچووە.

## * ٢/٢٦

- ١٤٤٥ گۆتەنبەرگ یەکەم چاپخانەی داهێنا[1].

١٩٣٦ کۆچی دوایی ڕۆماننووس (مەکسیم گۆرکی).

- ١٩٩٤ کۆچی دوایی شاعیر (محەمەد عەلی مەدهۆش) لەسلێمانی[2].

---

[1] - بۆ یەکەم جار داهێنانی چاپی نوێ بەپیتی نەچەسپاو (متحرك) لەلایەن داهێنەری ئەڵمانی (یۆحەننا گۆتەنبەرگ)ەوە بوو لەساڵی (١٤٤٥)، کەتوانی بزوێنەرێکی چاپی تەختە دروست بکات کە بەدەست ئیشی دەکرد، دوای ڕێکخستنی لاپەڕەی پێویست بەپیتی نەچەسپاو بەو بزوێنەرە چاپ دەکراو ئینجا پیتەکان دیسان بەسەر قاسەی تایبەتدا دابەش دەکرانەوە بۆ دووبارە بەکارهێنانەوەیان، ئەم ئامێرە دەیتوانی لەسەعاتێکدا سەد لاپەڕە چاپ بکات، ئەمە خێراییەکی بێ وێنەبوو لەکاتی خۆیدا، بەهۆی ئەم ئامێرەوە توانرا هەڵەی ناوکتێب کەم بکرێتەوەو ناوەڕۆکی بپارێزرێ، یەکێك لەو کتێبانەی کە گۆتەنبەرگ بۆ یەکەم جار بەبزوێنەرەکەی خۆی چاپی کردن (ڕێزمانی لاتینی) بوو بۆ قوتابخانەو فێرگەکان، گۆتەنبەرگ بۆ یەکەم جار لەچاپخانەکەی خۆیدا ئینجیلی چاپ کرد، وە لەماوەی نیو سەدەدا (واتە تا ساڵی ١٥٠٠ن) نزیکەی (٣٠) هەزار کتێبی چاپکراو کەوتە بازاڕەوە، کە ئەمەش وای لەپیاوانی کەنیسە کرد دژی داهێنانەکەی گۆتەنبەرگ بوەستنەوەو پەنایان بردە بەر قەدەغەکردنی کتێب، لەساڵی (١٥٥٩)دا نزیکەی (٤٠) لیست بڵاوکرایەوە کەناوی هەزارەها کتێبی قەدەغەکراوی هەمەجۆری تێدابوو.

[2] - شاعیر (حەمە عەلی مەدهۆش)، کوڕی محەمەد حاجی مستەفای قوربانیە، لەساڵی (١٩١٩) لەسلێمانی لەدایکبووە، کاری سەرەکی ڕۆژانەی بەرگ دوورین بووە، لەسەرەتادا بەهۆنراوەی کلاسیکی دەستی پێکردووە، پاشان بەرە بەرە ڕێگەی هۆنراوەی نوێی گرتۆتە بەر، شاعیرێکی هەست ناسك بووەو زۆربەی هۆنراوەکانی دڵداری و باسی بەسەرهات و ڕووداوە، چیرۆکی بەشیعر نووسیوە، چەند دیوانێکی شیعری چاپکردووە، لەوانە (هەمیشە بەهار)، بەسەریەکەوە هەموو دیوانەکانی لەگەڵ چەند شیعرێکی تردا لەکتێبێکدا بەناوی (یانەی دڵان) لەلایەن (محەمەدی مەلا کەریم)ەوە کۆکراوەتەوەو چاپکراوە.

- ١٩٩٨ کۆچی دوایی شاعیری ڕۆژهەڵاتی کوردستان (مارف ئاغایی)و شێوەکار (جەعفەر قازی).

## * ٢/٢٧

- ١٨٤٤ سەربەخۆیی (دۆمەنیکان) لەهایتی.
- ١٩٠٠ دامەزراندنی یانەی وەرزشی (بایرن میونیخ)ی ئەڵمانی.
- ١٩٢٤ (کۆمەڵەی نیشتمانی تورکیا) خەلافەتی ئیسلامی هەڵوەشاندەوە.
- ١٩٨٦ خاتوو (کوارزۆن ئەکینۆ) بوو بەسەرۆك کۆماری فلیپین.
- ١٩٩٢ دامەزراندنی کۆمەڵەی منداڵپارێزی کوردستان.
- ١٩٩٥ تەقینەوەیەکی گەورە شاری (زاخۆ)ی هەژاند.
- ١٩٩٩ کۆچی دوایی شاعیر (ڕۆستەم حەویزی) لەکۆیە.
- ٢٠٠٨ تیرۆرکردنی (شەهاب تەمیمی) نەقیبی (سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عیراق).

## * ٢/٢٨

- ١٨٦٩ کۆچی دوایی شاعیری فەڕەنسی (لامارتین)[١].
- ١٩٢٢ سەربەخۆیی (میسر) لەبەریتانیا[٢].

---

[١] - ئەلفوس دو لامارتین، شاعیرو سیاسەتمەداری فەڕەنسی، ساڵی (١٧٩٠) لەدایك بووە، بەیەکێك لە بەناوبانگترین شاعیرەکانی ڕۆمانتیکی فەڕەنسی دەژمێردرێت، لەدوای شۆڕشی ساڵی (١٨٤٨) پۆستی سەرۆکایەتی حکومەتی کاتی فەڕەنسای پێ سپێردراوە، لەشوباتی (١٨٦٩) کۆچی دوایی کردووە.

[٢] - کۆماری عەرەبی میسر، لە ١٩٢٢/٢/٢٨ سەربەخۆیی لەبەریتانیا وەرگرتووە، میسر ڕووبەرەکەی (٩٩٧,٧٣٩ کم٢)یەو لەم ڕووەوە (٢٩)یەمین وڵاتی جیهانە، ژمارەی

١٩٥٨ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (پێشکەوتن).

١٩٨٦ تیرۆرکردنی (ئۆڵف پالمەر)، سەرۆك وەزیرانی سوید.

١٩٨٨ کۆچی دوایی شاعیری لوبنانی (میخائیل نەعیمە)[١].

- ٢٠٠٠ کۆچی دوایی زانای گەورە (سەید سابق).

---

دانیشتوانی میصر (٦٢,١١٠,٠٠٠) کەسە بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٩٧)و لەم ڕووەوە هەشتەمین وڵاتی جیهانە، پایتەختی ئەم وڵاتە (قاهیرە)یەو ژمارەی دانیشتوانەکەی (٦,٨٤٩,٠٠٠)کەسە، سیستمی فەرمانڕەوایی کۆماریە لەگەڵ یەك ئەنجومەنی یاسادانان، عەرەب (٩٩٪)ی هاولاتیانی میسر پێك دەهێنێ، لەڕووی ئاینیشەوە (٩٠٪)ی موسڵمانەو (١٠٪)ی مەسیحی قیبیتیە، دراوی میسر (لیرە)یەو گرنگترین شارەکانی (ئەسکەندەریە، جیزە، پۆرسەعید، ...هتد).

[١] – (میخائیل نەعیمە)ی شاعیر، ساڵی (١٨٨٩) لەلوبنان لەدایکبووە، پاشان کۆچی کردووە بۆ ئەمریکاو کاریگەر بووە بەئەدەبی ڕۆژئاوا، لەگەڵ هاوڕێکەیدا (جوبران خەلیل جوبران) (الرابطة القلمیة)یان دامەزراندووە، دواتر گەڕاوەتەوە بۆ لوبنان و لەساڵی (١٩٨٨) کۆچی دوایی کردووە، لەدانراوەکانی: (الغربال) وە دیوانی (همس الجفون).

# مانگی ئازار ( مارس )

## * ٣/١

- ڕۆژی بەرگری شارستانی جیهانی.
- ١٩٧٠ ڕۆژی مامۆستایانی عیراق.
- ١٩٧٩ کۆچی دوایی سەرکردەی کورد (مەلا مستەفای بارزانی) لەئەمریکا[1].

---

[1] - مەلا مستەفای کوڕی شێخ محەمەدی بارزانی، لە ١٩٠٣/٢/١٤ لەگوندی بارزان لەدایکبووە، ساڵی (١٩٠٦) پاش سەرنەگرتنی شۆڕشی بارزان دژ بەدەوڵەتی عوسمانی، لەگەڵ دایکی لەبەندیخانەی موسڵ بەندکراوە، ساڵی (١٩١٩) بەشداری لەشۆڕشی شێخ مەحمودی حەفیددا کردووە، ساڵی (١٩٣٢) سەرکردایەتی هێزەکانی (بارزان)ی لەدژی هەڵمەتی حکومەتی عێراق کردووە، پاشان لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەپێشمەرگەو خێزاندا پەنای بردۆتەبەر تورکیا، ساڵی (١٩٣٣) دەچێتە موسڵ و لەوێ دەیگرن و دەخرێتە ژێر بەزۆر نیشتەجێ بوون (إقامة جبرية)ەوە، تاساڵی (١٩٤٣) بارزانی دوورخرابووەوەو ئەو کاتە لەسلێمانی دەبێت، بەڵام توانی ڕابکات و بەناو کوردستانی ئێراندا بگاتەوە ناوچەی بارزان، ساڵی (١٩٤٥) شۆڕشی بارزانی دژی حکومەتی عێراق هەڵگیرساند، پاش شۆڕشی (١٩٤٥) بارزانی لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دەچێتە مەهابادو کرایە فەرماندەی سوپای کۆماری مەهابادو پلەی (ژەنەڕاڵ)ی لەیەکێتی سۆڤیەتی ئەوساوە پێ بەخشرا، دوای دامەزراندنی (پارتی دیموکراتی کوردستان) لە١٦ی ئابی (١٩٤٦) بارزانی بەسەرۆکی ئەوپارتە دەست نیشانکرا، پاش ڕوخانی کۆماری مەهاباد بارزانی لەگەڵ (٥٠٠) پێشمەرگەدا لەڕووباری (ئاراس) پەڕینەوەو پەنایان بۆ سۆڤیەت برد، پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەموزی (١٩٥٨) لەعێراق، مەلا مستەفا گەڕایەوە بۆ عێراق و لە ١٩٥٨/١٠/٦ گەیشتە بەغداو پێشوازی گەرمی لێکرا، لەساڵی (١٩٦١)ەوە سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولی کرد تا ساڵی (١٩٧٥)و هەرەس هێنانی شۆڕشەکە، لە ١١ی ئازاری (١٩٧٠) بارزانی ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ حکومەتی

١٩٩٧ دامەزراندنی کەناڵی تەلەفزیۆنی (خاك) لەسلێمانی.

٢٠٠٦ دامەزراندنی کەناڵی ئاسمانی (الرسالة).

## * ٣/٢

١٩٥٢ (عەلی ماهر) سەرۆك وەزیرانی میسر دەستی لەکارکێشایەوە.

١٩٨٩ کۆچی دوایی (مامۆستا مەلا عبدالرحیمی پەرخی)[١].

## * ٣/٣

- ١٩٣٧ هەرەس هێنانی ڕاپەڕینی (سەید ڕەزای دەرسیم) لە کوردستانی تورکیا.

- ١٩٣٨ کۆچی دوایی (میرزا غەفوور) ی شاعیر[٢].

---

مێژالدا مۆرکرد کە ئۆتۆنۆمی بەگەلی کورد بدرێت و، بە(بەیانی یانزەی ئازار) ناسراوە، پاش ڕێکەوتننامەی جەزائیر لەئازاری ١٩٧٥ مەلا مستەفا ڕوویکردە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تا لە ١٩٧٩/٣/١ هەر لەوێ بەنەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد.

[١] - مەلا عەبدولڕەحیمی پەرخی، کوڕی میرزا کوڕی عەبدوڵڵا، ساڵی (١٩٠٧) لەگوندی (پەرخ)ی سەر بەناوچەی (بەرزنجە)ی پارێزگای سلێمانی لەدایکبووە، لای زانایانی سەردەمی خۆی زانستی ئیسلامی وەرگرتووە، ساڵی (١٩٣٥) لای زانای هەڵکەوتوو (شێخ عومەر قەرەداغی) ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە، هەموو تەمەنی سەرقاڵ بووە بە وانەوتنەوەو ڕێنموویيکردنی خەڵك، لەئازاری (١٩٨٩) لەسلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

[٢] - میرزا غەفوری کوڕی حاجی غەفوری حاجی عەباس، لەساڵی (١٨٧٠) لەگەڕەکی (سەرشەقام)ی شاری سلێمانی لەدایك بووە، لای خواجە ئەفەندی قورئانی پیرۆزی خوێندووە، بەڵام نەیتوانیوە خوێندن تەواو بکات، لەگەڵ ئەوەشدا زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی زانیوە، ماوەیەك دەبێت بە (باشچاوەش)، حەوت ساڵیش لەتورکیا سەربازی کردووە، پاشان دەست لەکاری میری هەڵدەگرێت و خۆی بۆ بازرگانی کڕین و فرۆشتنی توتن تەرخان دەکات، لە ١٩٣٨/٣/٣ کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٤٣ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (ڕۆژا نویٚ) لەبەیروت.
- ١٩٥٩ کۆچی دوایی (شێخ سەلام) ی شاعیر.
- ٢٠٠٣ دامەزراندنی کەناڵی ئاسمانی (العربیة).

## * ٣/٤

- ١١٩٢ کۆچی دوایی سەرکردەی موسڵمانی کورد (سەلاحەدینی ئەیووبی)[١].
- ١٩١٦ مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی (سایکس بیکۆ) کە دابەشکردنی کوردستانی لێکەوتەوە.
- ١٩٢٣ بۆمبارانی شاری سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە.
- ١٩٦١ دەرچونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) لەبەغداد.

---

[١] – سەلاحەدینی ئەیووبی لەساڵی (٥٣٢ك) لەشاری تکریت لەدایك و باوکێکی کورد لەدایك بووەو، تەمەنی منداڵی و لاوێتی لەشاری (بەعلەبەك و دیمەشق) بەسەربردووە، لەساڵی (٥٥٩ك)، لەیەکەم هێرشدا بۆ سەر میسر بەسەرکردایەتی شێرکۆی مامی بەشداری کردووەو لەساڵی (٥٦٢ك) لەدووەم هێرشیدا بۆ سەر میسر هەر لەوێ جێگیردەبێت، لەساڵی (٥٦٤ك)دا دوای مردنی مامی وەزارەتی میصر دەگرێتە دەست، لەساڵی (٥٦٧ك) کۆتایی بەدەوڵەتی فاتیمی دەهێنێت و فەرمانڕەوایەتی میسر بەتەواوی دەگرێتە دەست.
لەساڵی (٥٦٩ك) دوای لەدنیا دەرچوونی (نووردەین مەحمود زەنکی) وڵاتی شام دەخاتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە، بەمجۆرە دەوڵەتێکی فراوانی کەوتە ژێردەستەوە، هەمووی یەکخست و بارو گوزەرانی چاککردن و سوپایەکی بەهێزی پێکهێنا، وەتوانی لەساڵی (٥٨٣ك)دا لەشەڕی (حەتین)دا خاچپەرستەکان بشکێنێ و شاری قودس و زۆربەی ناوچە داگیرکراوەکان ڕزگار بکات، لەساڵی (٥٨٩ك– ١١٩٢ز) کۆچی دوایی کردو لەدیمەشق بەخاك سپێردرا.

**١٩٩٧ كۆچی دوایی (ئەحمەد خواجە) كوڕی خواجەفەندی لەبەغداد[1].**

**٢٠٠٢ تیرۆركردنی (م. عەبدوڵڵا قەسریێ) ئەندامی مەكتەبی سیاسی (هۆمەڵی ئیسلامی كوردستان) لەبازگەی تاسڵوجەی سلێمانی.**

## ٣/٥ *

**١٩٩١ ڕاپەڕینە جەماوەریەكەی باشووری كوردستان لەشاری ڕانیەوە دەستی پێكرد.**

**٢٠٠٣ دامەزراندنی (فیدڕاسیۆنی ڕێكخراوە قوتابی و خوێندكاریەكان) لەسلێمانی.**

**٢٠٠٨ تیرۆركردنی سیاسەتمەداری ناسراوو مامۆستای زانكۆی كەركوك (د. عەبدولستار تاهیر شەریف).**

---

[1] - ئەحمەد خواجە، كوڕی كەسایەتی ناوداری كورد (خواجەفەندی) لەڕۆژی ١٩٠٢/٧/٦ لەگەڕەكی كانێسكانی شاری سلێمانی لەدایكبووە، ساڵی (١٩١٨) قۆناغی ئامادەیی (ڕوشدیەی عەسكەری) لەسلێمانی تەواوكردووەو دواتر خولی (ئەندازیاری ڕێگاوبانی) لەبەغداد تەواوكردووە، لەسەرەتای ژیانیەوە لەساڵی (١٩١٩) پەیوەندی كردووە بەشۆڕشەكەی شێخ مەحمودەوە، ماوەیەك بەرپرس و سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال) بووە، ئەحمەد خواجە كەسی نزیكی شێخی نەمر بووەو ماوەیەك سكرتێری بووەو لەسەرجەم ڕووداوەكاندا لەگەڵیدا بووەو بیرەوەری و یاداشتەكانی خۆی بەناوی (چیم دی) لە سێ بەرگدا چاپ كردووە، (بلانجۆ)و سێ بەرگی تری (چیم دی)و (ڕووداوەكەی دەرسیم) لەبەرهەمە چاپ نەكراوەكانیەتی، چەندین جار لەسەر بیری نەتەوایەتی فەسڵ و نەقڵ كراوە، لەبەعقوبەو كەركوك و سلێمانی وەك ئەندازیارو فەرمانبەر كاریكردووە، لەڕۆژی ١٩٩٧/٣/٤ لەبەغداد بەنەخۆشی كۆچی دوایی كردووەو تەرمەكەی هێنراوەتەوە بۆ سلێمانی و لەگردی سەیوان بەخاك سپێردراوە.

## * ٣/٦

- ١٩٢٨ لەدایکبوونی ڕۆماننوسی کۆلۆمبی (گابریەل گارسیا مارکێز)[١].
- ١٩٥٣ کۆچی دوایی (ستالین).
- ١٩٥٧ سەربەخۆیی (گانا) لەبەریتانیا.
- ١٩٧٥ مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر کە ئامانج لێی هەرەس هێنانی شۆڕشی کورد بوو لەکوردستانی عیراق.
- ١٩٩٥ کۆچی دوایی نووسەری بەناوبانگ (د.نەجیب گەیلانی)[٢].

---

[١] – (مارکێز) لەساڵی (١٩٢٨) لەهەرێمی سانتامارای هۆڵەندا لەدایك بووە، لەساڵی (١٩٤١) یەکەمین وتارەکانی خۆی لەڕۆژنامەدا چاپکردو لە (١٩٤٧) لەزانکۆی بوگاتا لەبەشی یاسادا دەستی بەخوێندن کرد، لەساڵی (١٩٦٥) دەستی بەنووسینی ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی) کردو لە (١٩٦٨) تەواوی کرد، کە بەبڕوای شارەزایانی ئەدەب ئەم ڕۆمانە باشترین و سەرکەوتووترین ڕۆمانی نووسەرە، ساڵی (١٩٨٢) بەڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی) خەلاتی نۆبڵی ئەدەبی پێ بەخشرا.

[٢] – د. نەجیب گەیلانی، ساڵی (١٩٣١) لەپارێزگای (الغربیە)ی میسر لەدایکبووە، ساڵی (١٩٤٩) لەکۆلیجی پزیشکی زانکۆی قاهیرە وەرگیراوە، ساڵی (١٩٥٥) بەتۆمەتی ئەندامبوون لەکۆمەڵی برایانی موسڵمان (إخوان المسلمین) خرایە زیندانەوە کەدواساڵی خوێندنی زانکۆی بوو، بڕیاری (١٠) ساڵ زیندانی بۆ دەرچوو، بەڵام بەهۆی خراپی باری تەندروستیەوە دوای (٤) ساڵ ئازادکرا، دوای ئازادبوونی لەزیندان ساڵی (١٩٦٠) بڕوانامەی کۆلێژی پزیشکی بەدەستهێنا، ساڵی (١٩٦٥) بۆ جاری دووەم دەستگیرکرایەوەو دوای دوو ساڵ ئازادکرا، دوای ئەوە ناچاربوو میسر بەجێ بهێڵێ و ڕوویکردە دەوڵەتی ئیمارات و لەوێ دەکرێت بەبەڕێوەبەری ڕۆشنبیری تەندروستی لەوەزارەتی تەندروستی، تا ساڵی (١٩٩٤) لەئیمارات مایەوەو دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ میسر، دکتۆر نەجیب گەیلانی ئەدیبێکی بەتوانا بووەو دیوانی یەکەمی (نحو العلا)ی لەقۆناغی ئامادەییدا بڵاوکردەوە، لەناو زیندانیدا چەندەها چیرۆکی نووسیوە، لەوانە: (الطریق الطویل) کەخەڵاتی باشترین چیرۆکی درێژی پێدرا

## * ٣/٧

- ١٩٩١ لەسێیەم ڕۆژی ڕاپەڕیندا شاری سلێمانی ئازادکرا.
- ٢٠٠٨ کۆچی دوایی دادوەر (ئەمیر عەبدولکەریم ئاغای حەوێزی)[١].

## * ٣/٨

- ١٩٠٨ ڕۆژی ئافرەتانی جیهان.
- ١٩٢٣ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (بانگی حەق)[٢].

---

لەلایەن وەزارەتی پەروەردەو فێرکردنی میسرییەوە، سەیر لەوەدابوو کەتەنها بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکە ئازادیان کردو دوایی بردیانەوە بۆ زیندان، گەیلانی (٣١) ڕۆمان و (٦) کۆمەڵە چیرۆك و (٣) دیوانە شیعرو یەك شانۆگەری بڵاوکردۆتەوە، لەبواری لێکۆڵینەوەی ئیسلامیشدا (١٠) کتێبی بڵاوکردۆتەوەو (٨) کتێب لەبواری پزیشکیدا، وە زیاتر لە (١٠) خەڵاتی وەرگرتووە، لەئازاری (١٩٩٥)دا کۆچی دوایی کرد.

[١] - دادوەر ئەمیر عەبدولکەریم، ساڵی (١٩٣٦) لەکۆیە لەدایکبووە، لەساڵی (١٩٥٨) کۆلیژی مافی لەبەغدا تەواوکردووە، ساڵی (١٩٧٠) بووە بەدادوەر لەقەڵادزێو پاشان لەهەموو ناوچەکان دادوەری کردووە،ساڵی (١٩٨٨) لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە گواستراوەتەوە بۆ باشوری عێراق،ساڵی (١٩٨٩) بووەتە ئەندامی دادگای تێهەڵچوونەوە (إستئناف)، ساڵی (١٩٩٢) سەرۆکی لیژنەی باڵای یەکەمین هەڵبژاردنی هەرێمی کوردستان بووەو یەکێك بووە لەئەندامەکانی داڕشتنی یاسای هەڵبژاردنی هەرێمی کوردستان، لەساڵی (١٩٩٣) ئەندامی دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان بووەو ئەندامی کارای لیژنەی نووسینەوەی پرۆژەی دەستوری هەرێمی کوردستان بووە، لەساڵی (٢٠٠٠) خانەنشین کراوە، ئێوارەی ٢٠٠٨/٣/٧ لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کردو لەشاری کۆیە بەخاك سپێردرا.

[٢] - دوای ئەوەی (شێخ مەحموود) لەبەر بۆمبارانی فڕۆکەکانی هێزەکانی بەریتانیا سلێمانی بەجێهێشت، وە لەگەڵ هێزەکەی ڕووی کردە ناوچەی سورداش، لەگەڵ خۆی چاپخانەکەی هێنا: لە (ئەشکەوتی جاسەنە) دایمەزراندو ڕۆژنامەی (بانگی حەق)ی پێ دەرکرد، لەژێر

**– ١٩٥٩ جولانەوەکەی (عەبدولوەهاب شەواف) لەموسڵ، دژی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم.**

**– ١٩٨٠ کۆچی دوایی زاناو شاعیری کورد مەلا تاهیری پاکی**

**– ٢٠٠٠ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (پێگە).**

**– ٢٠٠٤ لەبەغداد یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوە ڕاگەیەنرا.**

## * ٣/٩

**– ١٨٥١ کۆچی دوایی (هانز کریستیان ئۆرستید) دۆزەرەوەی دیاردەی کارۆموگناتیسی.**

**– ١٨٩٧ کۆچی دوایی بیریاری ئیسلامی (سەیدجەمالەدینی ئەفغانی)[1].**

---

ناوی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە (ناشکێ بەتۆپ و بۆمبا سەرفرازە بانگی حەق)، (سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی، غەزەتەیەکی ڕەسمیە، لەقەرارگاهی عمومی ئۆردوی کوردستان تەبع دەکرێ)، (غایەو ئەمەلی ئیستیحصالی حقوقی کوردانە).

لەگەڵ ژمارە یەکدا پاشکۆیەکی بڵاوکردۆتەوە، بەناونیشانی (عەلاوەی جەریدەی بانگی حەق ژمارە –١–) کەڕێنمایی شێخ مەحمودە بەناونیشانی (تەعلیماتە بۆ هەیئەتی مودافەعەی میللیە)، پاش ئەوەی شێخ مەحمود ناچاربوو لەترسی هێزەکانی ئینگلیز ئەشکەوتەکەی بەجێبهێڵێت و ڕوویکاتە ناوچە سنوورییەکانی پێنجوێن، ئینگلیزەکان ئەشکەوتی جاسەنەیان داگیرکردو دەستیانگرت بەسەر کەلوپەلی ناو ئەشکەوتەکەداو چاپخانەکەیشیان گرت و هێنایانەوە بۆ سلێمانی، بەم شێوەیە (بانگی حەق) تەنها (٣) ژمارەی لێ دەرچوو.

[1] – لەساڵی (١٨٣٩) جەمالەدینی کوڕی سەفدەری ئەفغانی لەگوندی ئەسعەد ئابادی سەر بە(کابول) لەبنەماڵەیەکی ناودار لەدایك بوو، ئەفغانی لەتەمەنی هەشت ساڵیدا لای باوکی دەستی بەخوێندن کردووەو، پاش ساڵێك دەست دەکات بەخوێندنی کتێبە سەرەتاییەکان و دەچێتە ناو بوارە جیاوازەکانی زانست و وێژەو ڕێزمانی عەرەبی و مێژوو و زانستەکانی

- ١٩٠٨ دامەزراندنی یانەی وەرزشی (ئەنتەر میلان)ی ئیتاڵی.
- ١٩٨٨ کۆچی دوایی (مەلا عەلی بیارە)[١].

---

تەفسیرو فیقھ و ئوسوڵ و کەلام و تەصەوف و، زانستەکانی مەنتق و سیاسەت و ئاکارو فەلسەفەو زانستە بیرکاریەکانی ئەندازەو جەبرو گەردووناسی و تیۆریەکانی پزیشکی و توێکاری خوێندووە، زمانەکانی عەرەبی و ئەفغانی و فارسی و تورکی و فەرەنسی زانیوە.
ئەفغانی وەك کارایەکی بواری دینی و سیاسی شارەکانی (بۆمبای و قاھیرەو ئاستانەو ھەیدەرئابادو کەلکەتا) گەڕاوە، ساڵی (١٨٨٣) گەیشتۆتە پاریس و بەھاوکاری قوتابیەکەی (محەمەد عەبدە) کۆمەڵەی (العروة الوثقی)ی دامەزراندو گۆڤارێکیشی بەوناوەوە دەرکرد، کۆمەڵەکە بەپەنھانی لقی لەزۆربەی شارو وڵاتەکاندا ھەبوو، ساڵی (١٨٨٦) ڕوویکردە ئێران پاشان مۆسکۆو سانبترسبورگ و میونیخ و لە ساڵی (١٨٨٩)شدا جارێکی تر گەڕایەوە بۆ ڕوسیا، لەکۆتایی ئەو ساڵەشدا ئەفغانی لەسەر داوای (ناسرەدین شا) گەڕایەوە بۆ تاران، پاش چەند مانگێك کەشی ناوخۆی تاران شێواو (ناسرەدین شا) لەجێی (شاعەبدولعەزیزی حوسەینی) لەتەمووزی (١٨٩٠) دایناو تاوەکو لەسەرەتای (١٨٩١) دەرکراو لەئازاری ئەو ساڵەدا گەیشتە بەغدادو پاشان بەسرەو لەوێشەوە ڕویکردە لەندەن و تا سەرەتای (١٨٩٢) لەوێ مایەوەو، بەدەنگێکی بەرز بەگژ فەسادو ستەمکاریەکانی (ناسرەدین شا)دا چووەوە، بۆیە (ناسرەدین شا) داوای لە(سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی) کرد تاوەکو بانگی بکات بۆ پایتەختی عوسمانی، سوڵتان بانگی کردو ئەوەشی خستە بەردەم کە لەپرۆژەکەی (جامیعەی ئیسلامی)دا ھاوکاری بکات، کە یەکێك بوو لەوێستگەکانی پرۆژەی بوژانەوەی ئەفغانی و لەھەوڵی دامەزراندنیدا بوو، لەسەر داوای سوڵتان لەھاوینی (١٨٩٢) گەیشتە (ئاستانە)و لەژێر چاودێری سوڵتاندا مایەوە تاوەکو لەئازاری (١٨٩٧) کۆچی دوایی کرد.

[١] – عەلی حسێن میرزا، ساڵی (١٩٤١) لەگوندی (بناوەسوتە)ی پێنجوێن لەدایکبووە، دوای وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی دەبێتە وتاربێژو مامۆستا لەخانەقای بیارە، چەند ساڵێکیش وتاربێژی مزگەوتی سەیدسادق بووە، ساڵی (١٩٨٤) چۆتە شاخ و بووە بەجێگری ڕابەری شێخ و بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری (بزووتنەوەی یەکێتی ئیسلامی)، دواتر لە

- ١٩٩٦ کۆچی دوایی (م. محمد غەزالی) لەسعودیە[1].

# * ٣/١٠

- ڕۆژی جیهانی کتێبخانە.
- ١٨٨٢ (ڤان کوخ) میکرۆبی نەخۆشی (سیل)ی دۆزیەوە.
- ١٩٥٣ دامەزراندنی (کۆمەڵی ئافرەتانی کوردستان-عیراق).
- ١٩٨٥ کۆچی دوایی شاعیری کورد (حیلمی)[2].

---

بزووتنەوەی ئیسلامیدا بووە بەئەندامی مەکتەبی سیاسیو بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری، لە ١٩٨٨/٣/٩ لەئەنجامی بۆردومانی فڕۆکەکانی بەعس گیانی لەدەستداوە.

[1] - شێخ محەمەد غەزالی لەساڵی (١٩١٧) لەگوندێکی سەر بەشاری (البحيرة)ی میسر لەدایك بووە، لەتەمەنی دە ساڵیدا قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە، ساڵی (١٩٤١) زانکۆی ئەزهەری تەواو کردووەو بۆ ماوەیەکیش هەر لەوێ وانەی وتۆتەوە، لەچەند زانکۆیەکی تریش کاری کردووە، وەك: زانکۆی (أُم القرى) لەمەککەو زانکۆی (قەتەر)و زانکۆی (ئەمیر عەبدولقادر) لەجەزائیر، دووجار لەسەر کۆمەڵی برایان (إخوان المسلمين) دەستگیرکراوە لەساڵی (١٩٤٩و ١٩٦٥)، شێخ غەزالی زیاتر لەپەنجا نووسراوی هەیە یەکەمیان (الاسلام والاوضاع الاقتصادية)و دواهەمینیان (التفسير الموضوعي للقران الكريم) کە سێ بەرگە، ساڵی (١٩٩٦) لەکاتی بەشداریکردنی لەکۆڕێکی فیکریدا لە (ریاض) کۆچی دوایی دەکات و لەگۆڕستانی (بەقیع) دەنێژرێ.

[2] - حیلمی، ناوی (شێخ محەمەدی شێخ حسێن)ە، ساڵی (١٩٠٩) لەهەڵەبجە لەدایکبووە، لەحوجرە خوێندویەتی، پاشان چۆتە قوتابخانەو تاپۆلی شەشەمی تەواو کردووەو بووە بە(برین پێچ)، دوایی کاری سەعاتچی کردووە، حیلمی شاعیرێکی نیشتمان پەروەر بووەو بەرهەڵستی داگیرکەری کردووە، ساڵی (١٩٣٤) لەگەڵ (ئەحمەد موختار جاف) لەدژی ئینگلیز چەکی هەڵگرتووە، حیلمی زۆرجار بەشاعیرێکی توانج و پلاردەر دەناسرێت، بەڵام بوارەکانی (ئایینی و نیشتمانی و عەشق و کۆمەڵایەتی)یشی لەبیر نەکردووەو بەهەردوو زمانی کوردی و فارسی هۆنراوەی هەیە، ساڵی (١٩٧٥) هەردوو چاوی لەدەستداوە.

- ٢٠٠٨ تەقینەوەیەك لەبەردەم (ئوتێل سلێمانی پالاس) ڕویدا.

- ٢٠٠٨ کۆچی دوایی کەسایەتی ناوچەی گەرمیان (ئەحمەد کەلاری).

## * ٣/١١

- ١٩٢٥ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (دیاری کوردستان) لەبەغداد[1].

- ١٩٧٠ مۆرکردنی بەیاننامەی (یانزەی ئازار)و دانانی بەمافی ئۆتۆنۆمی بۆگەلی کورد لەباشووری کوردستان[2].

---

[1] - (دیاری کوردستان) گۆڤارێکی هەفتانەبوو بە زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی، خاوەن ئیمتیازو بەڕێوەبەری بەرپرسی (سالح زەکی ساحێبقران) بوو، (ڕەشید شەوقی)ش بەڕێوەبەری کارگێڕی بوو، دیاری کوردستان ئەدەبی، کۆمەلایەتی، وێنەداربوو، هەواڵی هەمەڕەنگی ناوخۆو جیهانی بڵاودەکردەوە، هەروەها شیعری شاعیرانی ناسراوی کوردو چیرۆك و حەکایەتی فۆلکلۆری کوردیشی بڵاودەکردەوە، وێنەکانیشی بەزۆری ناودارانی کورد بوون، ژمارە یەکی ئەم گۆڤارە لە ١٩٢٥/٣/١١دا دەرچووەو هەر ژمارەیەکی (٢٤) لاپەڕەی قەبارە (٢٢*١٦)سم بووە، هەموو ژمارەکانی (دیاری کوردستان) بەوێنەیەکی (سەلاحەدینی ئەیوبی) ڕازابوونەوە، لەژێریاندا بەزمانی کوردی نووسرابوو: (تۆ نەمردووی ئەی سەلاحەدینی ئەیوبی نەسەب، هەربژی ئەی شاهی بەیتی کورد، ئەی فەخری عەرەب) هەروەها لەهەموو ژمارەکانیشدا بەزنجیرە ژیاننامەی سەلاحەدینی ئەیوبی و قارەمانێتیەکانی بڵاوکردۆتەوە، گۆڤارەکە لەچاپخانەی (السلام) و (العصرية)و (الفرات)و (ئەلسریانی کاسۆلیکی) چاپکراون و پازدە ڕۆژ جارێك بڵاوبۆتەوە، دوایین ژمارەی کە ژمارە (١٦)یە لە ١١ی مایسی (١٩٢٦)دا دەرچووە.

[2] - بەیانی ١١ی ئازاری ساڵی (١٩٧٠) لەنێوان مەلا مستەفای بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و (سەدام حسێن)ی جێگری سەرۆك کۆماری ئەوکاتەی عێراقدا ئیمزاکرا، ئەم ڕێکەوتننامەیە لە (١٥) بەندی گرنگ پێکهاتبوو، کەتیایدا بڕیاری ئۆتۆنۆمی بەگەلی کورد بدات لەعێراقداو کێشەی کورد بەیەکجاری چارەسەر بکات، لەو چوار ساڵەی

**- ١٩٩٠ سەربەخۆیی (لیتوانیا) لەیەکێتی سۆڤیەت.**

**- ١٩٩١ لەدرێژەی ڕاپەڕینی گەلی کوردستاندا (شاری هەولێر) ئازادکرا.**

**- ١٩٩٧ تیرۆرکردنـی (محێـدین ڕەحـیم) ئەنـدامی کۆمیتـەی ناوەنـدی (پارتی دیموکراتی کوردستان) لەهەولێر.**

**- ٢٠٠٦ تـەرمی (سـلۆدۆڤان میلۆسـۆڤیچ)ی سـەرۆکی پێـشووی یۆکسلاڤیا لەزینداندا دۆزرایەوە.**

## * ٣/١٢

**- ١٩١٤ کۆچـی دوایـی (جـۆرج ویـستنگهاوس) داهێنـەری پیـشەسازی کارەبا[1].**

**- ١٩٥٧ کۆچی دوایی شاعیر عەبدولجەبار ئاغا (کانی).**

**- ١٩٦٨ سەربەخۆیی (مۆریش) لەبەریتانیا.**

---

بڕیاربوو بەیانی ئازاری تیادا جێبەجێبکرێ، حکومەتی بەعس سیاسەتی بەعەرەبکردنی کەرکوک و دەوروبەری پیادەکردو لەبەرانبەریشدا زۆربەی گوندە کوردنشینەکانی کەرکوکی لەدانیشتوانەکەی چۆڵکرد، لەساڵی (١٩٧١)یشدا لەڕێی کۆمەڵێک (مەلا)وە هەوڵی تیرۆرکردنی بارزانیدا، ئەگەرچی بەیانەکە جێبەجێ نەکراو ڕێکەوتنی جەزائیری بەدوادامات، بەڵام بوو بەبنامەیەکی سەرەکی بۆ خواستەکانی کورد لەداهاتوودا، تەنانەت دانوستانی دوای ڕاپەڕینی (١٩٩١) کە (مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی) لەگەڵ سەرۆک کۆماری عیراق (سەدام حسێن) ئەنجامیاندا، لەسەر بنەمای بەیاننامەی یانزەی ئادار بوو.

[1] - ویستنگهاوس لە ١٥ی تشرینی یەکەمی (١٨٤٦) لەنیویۆرک لەدایکبووە، ئەندازیارێکی ئەمریکیەو بەداهێنەری ئێربرێکەری هێڵی شەمەندەفەرو ڕۆتۆری بزوێنەری هەڵمی و پیشەسازی کارەباو دامەزرێنەری سیستمی وزەی کارەبا دادەنرێت، ویستنگهاوس لەژیانیدا (٣٦٠) داهێنانی تۆمارکردووەو کۆمپانیاکەشی ٦٠ لقی هەبووە کە (٥٠٠٠٠) کەس کاری تیاکردووە، لەئازاری (١٩١٤) لەنیویۆرک کۆچی دوایی کردووە.

## * ٣/١٣

**- ١٩٣٦ کوژرانی (خەلیل خۆشەوی).**

**- ١٩٤٢ کۆچی دوایی (مەلا ڕەشید بەگی بابان).**

**- ١٩٩٤ دامەزراندنی (دەنگی یەکگرتوو - ڕادیۆی سلێمانی).**

## * ٣/١٤

**- ١٨٨٢ کۆچی دوایی (کارل مارکس)[١].**

**- ١٩٠٣ لەدایکبوونی سەرکردەی کورد (مەلا مستەفا بارزانی).**

**- ١٩٣٢ کۆچی دوایی (جۆرج ئیستمان) داهێنەری کامێرای کۆداك.**

**- ١٩٩١ ئازادکردنی شاری دهۆك لەڕژێمی بەعس.**

**- ١٩٩٩ کۆچی دوایی (د. سەید عەزیز شەمدینی).**

**- ٢٠٠٧ پاش چارەسەری نەخۆشی، (مام جەلال) سەرۆك کۆماری عێراق لەعەممانەوە گەڕایەوە بۆ سلێمانی.**

## * ٣/١٥

**- ١٨٩٢ دامەزراندنی یانەی وەرزشی (لیڤەرپوڵ) لە ئینگلتەرا.**

---

[١] - مارکس لەساڵی (١٨١٨) لەشاری (ترەیر)ی ئەڵمانیا لەدایکبووە، لەتەمەنی (١٧) ساڵیدا بۆ خوێندنی قانون چۆتە زانکۆی (بۆن)، پاشان چۆتە زانکۆی بەرلین کە لەم زانکۆیە کەوتە ژێر کاریگەری بیروڕاکانی (هیگڵ)ەوە، بڕوانامەی دکتۆرای فەلسەفەی لەزانکۆی (ییناـ) وەرگرتووە، پاشان لەپاریس بۆتە هاوڕێی (فریدریك ئەنگلس)، لەگەڵ ئەنگلس یەکەم بڵاوکراوەی خۆیان بەناوی (بانگەوازی کۆمۆنیزم) بڵاوکردەوە، یەکەمین بەرگی کتێبەکەی بەناوی (سەرمایە) لەساڵی (١٨٦٧) بڵاوکردەوەو دوو بەرگەکەی تریش لەپاش مردنی بڵاوکرانەوە، مارکس وەك ڕێبەرو سەرۆکی ئەنتەرناسیۆنالیزمی یەکەم (کەبزووتنەوەیەکی نەتەوەیی کرێکاری)بوو وەنووسەری کتێبی (سەرمایە) ناوبانگی دەرکرد، لەمارسی (١٨٨٣) کۆچی دوایی کردو دوای خۆی ئەنگلس تەواوکردنی کارەکانی گرتە ئەستۆی خۆی.

- ١٩٢٣ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (هەتاو) لەسوریا.

# * ٣/١٦

- ١٩٤٥ کۆچی دوایی شاعیر (معروف عبدالغنی الرصافی)[١].
- ١٩٧٧ کۆچی دوایی (کمال جنبلاط).
- ١٩٨٨ کیمیابارانکردنی شاری هەڵەبجە لەلایەن حکومەتی بەعسەوەو شەهیدبوونی (٥) هەزار هاوڵاتیی بێتاوان[٢].

---

[١] – مەعروف عەبدولغەنی مەحمود، ساڵی (١٢٩٢ك) لەبەغدا لەدایکبووە، دایکی لەعەشیرەتی (قەرەغول)ـە کەخێڵێکی گەورەی کوردن لەکوردستانی تورکیا، باوکیشی لەعەشیرەتی (جەباری)یە کەکەوتۆتە نێوان شاری کەرکوك و سلێمانی، خوێندنی سەرەتایی لە (ڕەسافە)ی بەغداو (ڕوشدیەی عەسکەری) خوێندووە، پاشان دەستی کردووە بەخوێندنی زانستە شەرعیەکان، ساڵی (١٩٠٨) چۆتە ئەستەنبوڵ و لەوێ گۆڤاری (العرب)ی دەرکردووەو هەر لەوێ بووە بەمامۆستا، پاش کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی چووە بۆ فەڵەستین و لەقودس کراوە بەمامۆستای ئەدەبی عەرەبی، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ عێراق و ڕۆژنامەی (الامل)ی دەرکردووە، ساڵی (١٩٣٧) بووە بەئەندامی پەرلەمان، ڕەسافی زۆرکات کەلێیان دەپرسی: ئوستاد چۆنی؟ دەیوت: (الحمدلله أنا كردي وافتخر بكرديتي) وە هەر کاتێك دەچووە لای مامۆستای گەورە (ئەمین زەکی بەگ) دەیوت: (بەقوربان بمنووسە لەکتێبی "المشاهیری اکراد"ەکە با ڕزگارم بێت لەدەست...)، لەدیوانە چاپکراوەکانی ڕەسافی: (ثلاثة دواوين)، (الرواية الرياء)، (دفع المحبة في ارتضاع).

[٢] – شاری هەڵەبجە لەنزیك سنوری ئێرانەو سەر بەپارێزگای سلێمانیە، دانیشتوانی ناو شاری هەڵەبجە ساڵی (١٩٨٨)، (٤١,٤٤٢) کەس بووە، بەرەبەیانی ١٩٨٨/٣/١٦ شارەکە بەڕۆکێتی ئاسایی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە تۆپبارانکرا، پاشان چەند فرۆکەیەك کە هەر پۆلێك لەشەش فرۆکە پێکهاتبوون شاریان بەبۆمبای کیمیاوی بۆمبارانکرد، کەوەك دواتر دەرکەوتووە گازی (مۆستاردو سارین و سیانید) بەکارهاتووە، ئەم کارەساتە دژ بەمرۆڤایەتیە بووە هۆی گیان لەدەستدانی زیاتر لە پێنج هەزار هاوڵاتی و ئاوارەبوونی

- ٢٠٠٦ لەخۆپیشاندانێکی شاری هەڵەبجەدا (مۆنۆمێنتی قوربانیانی هەڵەبجە) سوتێنرا.

## * ٣/١٧

- ١٧٩٠ کۆچی دوایی (بنیامین فرانکلین) داهێنەری دژە بروسکە.
- ١٩٤٧ دامەزراندنی پەیمانی باکووری ئەتڵەسی (ناتۆ).
- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی (م. مەلا عەلی عەبدولعەزیز) ڕابەری گشتی (بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان).

## * ٣/١٨

- ١٩٧٩ کۆچی دوایی (ئەریك فرۆم)[١].

---

ئەوانی دی و بریندارەکانیش بۆ نەخۆشخانەکانی ئێران و وڵاتانی ئەورووپا، بەپێی ڕاپۆرتێکی (کۆمەڵەی ژیانەوەی هەڵەبجە) تائێستا چارەنووسی (١٥٠) منداڵی هەڵەبجە نادیارەو زانیاریش هەیە کە لەوڵاتانی دراوسێ و هەندێ وڵاتی ترین، لەم چەند ساڵەی دواییدا سۆراغی هەندێکی کەمیان کراوە، تائێستاش ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی هەڵەبجە بەدەست دەرەنجامەکانی کیمیابارانەکەوە دەناڵێنن، چونکە کیمیاییەکە کاریگەری خراپی هەیە بۆ سەر مێشك و کۆئەندامی دەمارو لەدایکبوونی منداڵی ناتەواوو نەخۆشیەکانی پێست و کۆئەندامی هەناسەو چەندینی تر.

[١] – ئەریك فرۆم یەکێکە لەزانا گەورەکانی بواری دەروونناسی، لە ٢٣ی ئازاری (١٩٠٠) لەئەڵمانیا لەدایك بووە، ساڵی (١٩٣٢) کۆچی کردووە بۆ ئەمریکا ئەویش لەبەر ئەو فشارە زۆرەی کەنازیەکان بەرامبەری ئەنجامیان دەدا، لەزانکۆکانی ئەمریکادا بوو بەمامۆستاو لەهەمان کاتدا شیکاری دەروونیشی ئەنجام دەدا، لەدوا ساڵەکانی تەمەنیدا کۆچی کرد بۆ سویسراو لەوێ بەردەوام بوو لەچالاکیە فیکریەکانی، تا لە ١٨ی ئازاری (١٩٧٩) کۆچی دوایی کرد.

- ١٩٩٧ كۆچی دوایی (م. سەید نەجمەدین تەها) لەسلێمانی[١].
- ١٩٩٩ کۆچی دوایی هونەرمەند (قادر دیلان).

## * ٣/١٩

- ٢٠٠٢ کوژرانی سەرکردەی سەربازی چیچانی (خەتتاب).
- ٢٠٠٣ هێرشە سەربازیەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانان بەناوی (پرۆسەی ئازادی عیراق) دەستی پێکرد.
- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی (م. ئەکرەم عەنەبی) مامۆستای کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین.

## * ٣/٢٠

- ١٨٨٠ زانای فیزیایی ئیتالی (فۆڵت) هێزی کارەبای دۆزیەوە.
- ١٩٥٦ سەربەخۆیی وڵاتی (تونس) لەفەرەنسا.

---

[١] - مامۆستا سەید نەجمەدین تەها لە ١٩٣٠/٤/٢٨ لەدایك بووە، لەتەمەنی پێنج ساڵیەوە دەستی کردووە بەخوێندن و بۆ ئەم مەبەستە زۆر شوێنی کوردستان گەڕاوە، تا دواجار لە مزگەوتی (حسین بەگی نەفتچی) دادەمەزرێت، پاشان لەگەڵ (١٢) مەلای تر سەفەری حەج دەکەن و لەڕێگەی ئەردەنەوە دەچنە زیارەتی (بیت المقدس)، پاش گەڕانەوەی لەگوندی (تەپی سەفا) دەست دەکات بەدەرس وتنەوەو (١٠٠) قوتابی پێ دەگەیەنێت، ساڵی (١٩٧٨) دەگوێزرێتەوە بۆ مزگەوتی ئوسامە لە کۆمەڵگەی عەنەبی نزیك هەڵەبجەو سەدان لاو بەهرەمەندبوون لێی، ساڵی (١٩٨٦) خانەنشین کراوە، بەڵام لەسەرداوای خۆی و سووربوونی لەسەر بانگەواز دانراوەتەوە، پاش کارەساتی ١٩٨٨/٣/١٦ ئاوارەی ئێران بووەو لەمزگەوتی (ئاجیب الله) بۆتە ئیمام و مودەڕیس، لەحوزەیرانی (١٩٩٢) گەڕاوەتەوە بۆ مزگەوتی ئوسامەو دەستی بەتەدریس کردۆتەوەو (٥٤) کەسی تر لەسەر دەستی ئیجازە وەردەگرن، ساڵی (١٩٩٥) مزگەوتی ئوسامە دەبێتە خوێندنگەیەکی نموونەیی شەرعی و مامۆستا دەبێتە بەڕێوەبەری، لە ١٩٩٧/٣/١٨ لەسلێمانی بەنەخۆشی کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٨٨ شالاوی بەناو ئەنفالی ناوچەی قەرەداغ دەستی پێکرد.
- ٢٠٠٧ لەسێدارەدانی (تەها یاسین ڕەمەزان) جێگری سەرۆك كۆماری پێشووی عێراق (سەدام حسێن).

# * ٣/٢١

- سەری ساڵی کوردی و سەرەتای بەهار.
- ڕۆژی جیهانی ئاو.
- ڕۆژی جیهانی شیعر.
- ١٩٠٧ ڕۆژی جیهانی دایك.
- ١٩٤٦ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هاواری نیشتمان) لەمەهاباد.
- ١٩٤٦ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هەڵاڵە).
- ١٩٧٧ دەرچوونی گۆڤاری (عیراق) لەبەغداد.
- ١٩٧٩ دامەزراندنی دەنگی گەلی کوردستان[١].

---

[١] – لە ١٩٧٩/٣/٢١ دەنگی گەلی کوردستان کەزمانحاڵی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو لەنۆکان دامەزرا، کاتژمێر شەشی ئێوارەی ٢١ی ئازار بەناوی (ئێرە دەنگی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە) ڕادیۆکە کرایەوە، دواتر لەسەر داوای ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی و بەرەی (جوقد) لە ٢٠ی حوزەیرانی هەمان ساڵدا بڕیاری گۆڕینی ناوی ڕادیۆکە درا بۆ (دەنگی شۆڕشی عێراقی) پاش هەفتەیەکیش کرا بە (دەنگی شۆڕشی عێراق)، ماوەی یەك مانگ ڕادیۆکە لەنۆکان مایەوە، دواتر گواسترایەوە بۆ گردی (کوپان) لەتووژەڵە، لەسەرەتادا پەخشی ڕادیۆ یەك کاتژمێر بوو، (٤٥) خولەك سۆرانی و بادینی و (١٥) خولەکیش بەزمانی عەرەبی.

ڕادیۆکە بەهۆی جێگیرنەبوونی باری ئەمنی ناوچەکە چەند جارێك گواستراوەتەوە، تاوەکو لەساڵی (١٩٨٣)دا گواسترایەوە بۆ بەرگەڵوو، بۆماوەی پێنج ساڵ لەوێ مایەوە، لەمانگی ئەیلوولی (١٩٨٣)شدا ناوەکەی لە (دەنگی شۆڕشی عێراق)ەوە بوو بە (دەنگی گەلی کوردستان)، لەکاتی هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەر عێراق دەنگی گەلی کوردستان لەشاری

**- ١٩٩٠ ڕۆژی سەربەخۆیی (نامبیا) لەئەفریقیای باشوور.**

**- ١٩٩١ لەدرێـژەی ڕاپـەڕینی باشـووری کوردسـتاندا (شـاری کـەرکوك) ئازادکرا.**

## * ٣/٢٢

**- ١٩٤٥ دامەزراندنی کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی (الجامعة العربیة).**

**- ١٩٤٦ سەربەخۆیی وڵاتی (ئەردەن) لەبەریتانیا[1].**

**- ٢٠٠٤ شـــەهیدبوونی (شـــێخ ئەحمـــەد یاســـین)، دامەزرێنـــەری بزووتنەوەی حەماسی فەڵەستینی.**

---

سەقزەوە پەخشی بەرنامەکانی دەکرد، لەدوای ڕاپەڕینیش بە دوو پەخشی (٤١م) و (٧٥م) لـە ١٩٩١/٣/١٩ ڕادیۆکـە گوێزرایـەوە بـۆ سـلێمانی و لـەگردی عـەلی نـاجی پەخـشی دەستپێکردەوە، لەدوای کۆڕەویش پەخشی (٤١م) لەماوەت و پەخشی (٧٥م)یش لەقەسرێ دەستیان پێکردەوە، پاش دوو هەفتەش هـەر دوو ستافەکە لـە(گەلاڵـە) یەکیانگرتـەوەو تـا مانگی تشرینی دووەمی (١٩٩٢) لەوێ مایەوە، جێی ئاماژەیە ئێستا دەنگی گەلی کوردستان لە قەزای چوارتا بۆ ماوەی (٢٤) سەعات بەرنامەکانی پەخش دەکات.

[1] - شانـشینی ئـەردەنی هـاشمی، لـە ١٩٤٦/٣/٢٢ سـەربەخۆیی لەبـەریتانیا وەرگرتـووە، ڕووبـەری ئـەردەن (٨٨٩٤٦ کـم٢)یـەو لـەم ڕووەوە (١١٥)یـەمین وڵاتـی جیهانـە، ژمـارەی دانیـشتوانەکەی (٤٥٢٢٠٠٠) هاوڵاتیـە بـەپێی سـەرژمێری سـاڵی (١٩٩٧) وە لـەم ڕووەوە (١١٢)یەمین وڵاتی جیهانە، پایتەختی ئەردەن (عەممان)ەو سیستمی حوکمڕانی لەم وڵاتـەدا پاشایەتیە لەگەڵ دوو ئەنجومەنی یاسادانان، (٩٩,٢٪)ی ئـەردەن ڕەگـەزی عەرەبـە لەگـەڵ چەند کەمینەیەك لەناویاندا کورد کەڕێژەی (٠,١٪) پێك دەهێنێت، (٩٣٪)ی خەڵکی ئەردەن موسڵمانی سوننیە لەگەڵ کەمینەیەکی مەسیحی و ئایینـەکانی تـر، زمـانی فـەرمی دەوڵـەت زمانی عەرەبیەو دراوی وڵات (دینـار)ی ئەردەنیـە، گرنگترین شارەکانی: (زەرقـا، ئەریـەد، ئەلسەلت،...).

## * ٣/٢٣

**- ١٩٦٠ كۆچـی دوایـی زانـای نـاوداری كـورد (م.سـەعید نورسـی) لەتوركیا[١].**

---

[١] - مامۆستا نورسی لەساڵی (١٨٧٣) لەكوردستانی توركیا لەدایك بووە، نورسی ڕۆژی دووسەد لاپەڕەی خوێندۆتەوەو لای مامۆستا (محەمەد جەلالی) بروانامەی پێدراوە، لەماوەیەكی كەمدا ناوبانگی دەركردو خەڵكی بە (سەعیدی مەشهور) ناویان ئەبرد، لەتەمەنی شانزەساڵیدا چووە بۆ (ماردین)و لەمزگەوتی گەورەی شارەكەدا دەستی بەوانەوتنەوە كردووە، ساڵی (١٨٩٤) ڕۆیشت بۆ (وان)و لەقوتابخانەی (خورخور) نزیكەی بیست ساڵ دەرسی وتۆتەوەو زۆر زانا لەبەردەستیدا پێگەیشتوون، لەبەر زیرەكی و لێهاتووییەكەی لەزانستە شەرعی و هاوچەرخەكاندا نازناوی هەڵكەوتووی سەردەم (بدیع الزمان)ی لێنرا، نورسی لەگەڵ زۆرێك لەقوتابیەكانیدا بەشداری جەنگی جیهانی یەكەمی كردو دژی ڕووسەكان جەنگاوەو لەیەكێك لەشەڕەكاندا دەستگیر دەكرێت و ماوەی دوو ساڵ و چوار مانگ زیندانی دەكرێت، پاشان لەزیندان رایكردو لەڕێگەی ئەڵمانیەوە گەیشتەوە ئەستەنبوڵ و پێشوازی گەرمی لێكرا، لەساڵی (١٩١٨) هەڵبژێردرا بە ئەندامی (دار الحكمة الاسلامیة)، پاش داگیركردنی توركیا لەلایەن ئینگلیزەكانەوە لەساڵی (١٩٢٠)و دواتر هاتنە سەركاری ئەتاتورك، نورسی دەستگیركراو بردیان بۆ ئەستەنبوڵ، پاشان بۆ شاری (بووردوور) لەوێش حەوت مانگ مایەوە، دواتر بردرا بۆ (ئەسپارتە)و پاشان بۆ شاری (بارلا)، مامۆستا نورسی لە(بارلا) خەریكی خواپەرستی و نووسینی (پەیامەكانی نوور) بوو، گەسەرەڕای چاودێری حكومەت، قوتابیەكانی بەپەرۆشەوە دەیان نووسینەوەو بڵاویان دەكردنەوە، نورسی لەساڵی (١٩٣٥)دا گیراو لەبەندیخانەی (ئەسكی شەهر) زیندانی كراو دواتر درا بەدادگا، كە بوێرانە لەدادگادا وەڵامی تۆمەتەكانی دایەوەو بەرگری لەپەیامەكانی كرد، نورسی دوای یانزە مانگ زیندانی بردرا بۆ شاری (قەستەمونی)و لەخانویەكی بچوكدا بۆ ماوەی حەوت ساڵ لەژێر چاودێری پۆلیسدا مایەوە، ساڵی (١٩٥٦) دادگای ئافیون بڕیاریدا كە پەیامەكانی نور هیچ شتێكیان دژ بەیاسا نیەو ڕێگەدرا كە چاپ بكرێن، مامۆستا نورسی لەمانگی ئازاری (١٩٦٠) بەنەخۆشی كۆچی دوایی كرد.

## * ٣/٢٤

- رۆژی جیهانی قەڵاچۆکردنی نەخۆشی سیل.
- ٨٠٩ کۆچی دوایی خەلیفەی عەباسی (هارونە رەشید) لەبەغداد.
- ١٩٢٤ لەدایك بوونی شانۆکاری ئیتاڵی (دایوفۆ).
- ١٩٨٨ کیمیابارانی ناوچەی (قەرەداغ - دێوانە)ی سەر بەپارێزگای سلێمانی لەلایەن حکومەتی بەعسەوە.
- ٢٠٠٨ (یوسف رەزا جەیلانی) بوو بەسەرۆك وەزیری پاکستان.

## * ٣/٢٥

- ١٩٣٠ دەرچونی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی (رێ یا تازە) لەیەریڤان.
- ١٩٩٣ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هەنگ)ی منداڵان.
- ١٩٩٥ ئازادکردنی پاڵەوانی مشتەکۆڵەی جیهانی (مایك تایسۆن) لەزیندان.

## * ٣/٢٦

- ١٨٢٧ کۆچی دوایی مۆسیقاری بەناوبانگ (بتهۆڤن)[١]
- ١٩٧١ سەربەخۆیی وڵاتی (بەنگلادیش) لەپاکستان.

---

[١] - (لۆدڤیك ڤان بتهۆڤن) ساڵی (١٧٧٠) لە شاری (بۆن)ی ئەڵمانیا لەدایکبووە، یەکەمین کاری هونەری ئەگەڕێتەوە بۆ (١٧٨٣) لەسەرەتای لاویدا، هەر لەوکاتەدا سەردانی (ڤیەننا)ی کردو خۆی ناساند بەبلیمەترین مامۆستای کە (مۆزارت) بوو بەڵام زۆری نەخایاندو گەڕایەوە بۆلای مامۆستاکەی خۆی کەناوی (هایدن) بوو، بتهۆڤن (٩) سەمفۆنی و (٣٢) سۆناتای پیانۆو (٥) کۆنیشەرتۆی پیانۆو (١٠) سۆناتای پیانۆو کەمان، بتهۆڤن لەکۆتایی تەمەنیدا تووشی نەخۆشی کەڕی بوو کەنەیدەتوانی بەشداری لەئاهەنگەکاندا بکات، ساڵی (١٨٢٧) لەڤیەننا کۆچی دوایی کرد.

## * ٣/٢٧

- ڕۆژی جیهانی شانۆ.
- ١٩٢٤ کردنەوەی (کۆمەڵەی دامەزرێنەری عێراقی)[١].
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی سەرکردەی کورد (ئیحسان نوری پاشا)[٢].

---

[١] - لە ٢٧ی ئازاری (١٩٢٤) بەمەبەستی دانانی یاسای بنەڕەتی (قانون الاساسي) بۆ عێراق (کۆمەڵەی دامەزرێنەری عێراقی – الجمعية التأسيسية العراقية) کرایەوە، کۆمەڵەکە لەشاری بەغداد یەکەمین کۆبوونەوەی خۆی سازدا، دەسەڵاتدارانی بەریتانیا مەبەستیان بوو کە بەزووترین کات ئەو کۆمەڵەیە کۆببێتەوەو بڕیار لە یاسای عێراقی بدات، کەیەکەمین یاسا بوو لەمێژووی دەوڵەتی نوێی عێراقدا، پرۆژەی یاساکە لەلەندەن دارێژرابوو، بەبێ وەرگرتنی ڕای خەڵکی عێراق، لەساڵی (١٩٢٥) لەلایەن کۆمەڵەکەوە بەبێ هیچ گۆڕانێك پەسەندکرا.

[٢] - (ئیحسان نوری پاشا) یەکێکە لەشۆڕشگێڕەکانی کوردستانی تورکیاو لەشاری (بەتلیس) لەدایك بووە، زانکۆی سەربازی لەئەستەنبوڵ خوێندووەو لەئەفسەرە ئازاو لێهاتووەکان بووە، لەگەڵ (مستەفا کەمال ئەتاتورك) ڕێکەوتبوو کە هێزی ئینگلیز لەتورکیا دەربکەن و دەوڵەتێکی یەکگرتووی کوردو تورك دابمەزرێنن، پاش ئەوەی ئەتاتورك لەبەڵێنەکەی پاشگەزبۆوە، ئیحسان پاشا بەفەرمانی (حیزبی خۆیبوون) لەساڵی (١٩٢٧) دژی ئەتاتورك ڕاپەڕی و شۆڕشی ئاگری داغی بەرپاکردو تا ساڵی (١٩٣٠) بەردەوام بوو، پاشان بەهۆی ڕێکەوتنی سێ لایەنەی نێوان (ئێران و ڕوسیاو تورکیا) کۆتایی بەشۆڕشەکە هات و ئیحسان پاشا پەنای بۆ ئێران بردو لەگەڵ (١١٠) کەس لەهاوەڵەکانی چوونە شاری تەورێز، بەڵام لەلایەن شای ئێرانەوە بۆ ماوەی چوار ساڵ لەشاری کرماشان زیندانی کران، پاش ئەوە ئازادکران و ڕێگەیان پێدرا بگەڕێنەوە بۆ تاران، ئیحسان پاشا کتێبێکی بەناوی (تأريخ ريشه نژاد كرد) نووسی و لەساڵی (١٩٥٥) بڵاوی کردەوە، ئیحسان نوری پاشا چوار جار ماتۆڕسکیل لێی داوە !، کەدواجاریان لەئێوارەی ١٩٧٦/٣/٢٦ بوو، کەڕۆژی دواتر لە (نەخۆشخانەی سینا)ی تاران کۆچی دوایی کردو لەگۆڕستانی (بەهەشتی زەهرا) بەخاك سپێررا.

- ١٩٨٨ كۆچی دوایی هونەرمەندی شاری کەرکوک (عەلی عەزین).

- ٢٠٠١ تیرۆرکردنی مێژوونووس (مامۆستا مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) لەبەغدا[١].

- ٢٠٠٥ کۆچی دوایی (د. شاخەوان مەجید) مامۆستای کۆلیژی پەروەردەی وەرزشی زانکۆی سەلاحەدین.

## * ٣/٢٨

- ١٩٦٩ کۆچی دوایی سەرۆکی ئەمریکی (ئەیزەنهاوەر).

- ١٩٩٣ دەرچوونی یەکەم ژمارەی پاشکۆی (ئەدەب و هونەر)ی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ).

- ٢٠٠٤ کۆچی دوایی هونەرمەندی شێوەکار (م. سەروەت سەوز).

- ٢٠٠٤ کۆچی دوایی هونەرمەند (سمکۆ عەزین) لەسلێمانی.

## * ٣/٢٩

- ١٩٥٦ کۆچی دوایی (میرزا مارف)ی شاعیر[٢].

---

[١] - (مەلا جەمیل ڕۆژ بەیانی)، ناوی (محەمەد جەمیل)ەو کوڕی مەلا ئەحمەدی فوقانی ڕۆژبەیانییە، ساڵی (١٩١٣) لەگوندی (فوقانی) لەدایکبووە، بەمنداڵی قورئان و گەلێ کتێبی فارسی و تورکی خوێندووە، خوێندنی مەلایەتی لەکەرکووک و کفری و چەند شوێنێکی تر تەواوکردووە، بەتاوانی سیاسی چەند جارێك حوکم دراوەو دوورخراوەتەوە، ماوەی (١٥) ساڵ ئاوارەی دوور وڵات بووە، دوای گەڕانەوەی بووە بەئەندامی (کۆڕی زانیاری کورد)، (مەلا جەمیل) ئەدیب و مێژوونووسێکی بەتوانا بووەو چەندین کتێبی بەنرخی لە زمانی (تورکی و عەرەبی و فارسی)یەوە کردووە بەکوردی، هەروەها (تأریخی سلێمانی و وڵاتی) لەزمانی کوردییەوە گۆڕیوە بۆ زمانی عەرەبی، ساڵی (٢٠٠١) لەشاری بەغداد تیرۆرکرا.

[٢] - میرزا مارف کوڕی مەلا ئەحمەد موختارە، شاعیرو ئەدیبێکی کوردە، لەساڵی (١٨٩٥) لەسلێمانی لەدایکبووە، لەحوجرە خوێندویەتی و زۆربەی ژیانی بە (فەرمانبەرێتی)

- ١٩٨٧ عەلی حەسەن مەجید ناسراو بە(عەلی کیمیاوی) کرا بەلێپرسراوی یەکەمی حکومەتی بەعس لەباکووری عێراق (کوردستان).
- ١٩٩٦ کۆچی دوایی هونەرمەندی کورد (عایشە شان)[1].

# * ٣/٣٠

- ١٦٣١ دەرچوونی یەکەمین چاپکراوی خولی ڕێك وپێك بەناوی (گازات).
- ١٩٤٨ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (نزار) لەبەغداد.
- ١٩٧٧ کۆچی دوایی گۆرانی بێژی عەرەب (عبدالحلیم حافظ).

# * ٣/٣١

- ١٨٣٧ کۆچی دوایی (میر محەمەد)ی گەورەی پادشای (میرنشینی سۆران).
- ١٩٣٤ دامەزراندنی (حیزبی شیوعی عێراقی).

---

بەسەربردووە، بەرهەمەکانی پەندو ئامۆژگاری و شیعرو پەخشان و وەرگێڕانە، یەکەم بەرهەمی شیعری لەساڵی (١٩٢٥)دا بڵاوکردۆتەوە، کتێبێکی داناوە بەناوی (حقائق وجیزة) کەبریتیە لەفەلسەفەو پەند، ساڵی (١٩٥٦) لەسلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

[1] - هونەرمەندی گۆرانی بێژ (عایشە شان) لەساڵی (١٩٣٨) لەشاری دیاربەکر لەدایك بووە، لەسەردەمێکدا کەزۆربەی هونەرمەندە ناودارەکان لەماڵی باوکیدا کۆدەبوونەوەو تا بەرەبەیان گۆرانیان دەچڕی، عایشەش لەپشتی دەرگەوە گوێی لەدەنگ و ئاوازەکانیان دەگرت، خاتوو عایشە ساڵی (١٩٧٩) سەردانی کوردستانی عێراقی کردووەو لەشارەکانی هەولێرو دهۆك و کەرکوك و بەغدا بەگەرمی پێشوازی لێکراوەو، چاوی کەوتووە بەهونەرمەندە ناودارەکانی وەك (محەمەد عارف جەزیری، تەحسین تەها، گوڵبەهار، عیسا بەرواری)، لە ٢٩ی ئازاری (١٩٩٦) لەشاری (ئیزمیر)ی تورکیا بەنەخۆشی کۆچی دوایی کردووە.

**- ١٩٤٧ لەسێدارەدانی پێشەوا (قازی محمد) و هاوڕێكانی لەمەیدانی (چوراچرا) لەمەهاباد[1].**

**- ١٩٩١ دەست پێكردنی كۆڕەوە ملیۆنیەكەی بەهاری (١٩٩١)ی خەڵكی باشووری كوردستان.**

[1] - قازی محەمەد كوڕی قازی عەلی قاسم میرزا ئەحمەدە، ساڵی (١٩٠١) لەمەهاباد لەدایكبووە، زانستی ئیسلامی بەتەواوی وەرگرتووە، زمانی ئینگلیزی و ڕوسی زانیوە، ساڵی (١٩٢٧) لەكوردستانی ڕۆژهەلات خەباتی ڕاگەیاند، لە ٢٢ی كانوونی دووەمی (١٩٤٦) كۆماری كوردستانی لەمەهاباد ڕاگەیاندو بوو بەسەرۆك كۆمار؛ كۆماری مەهاباد (١١) مانگ بەردەوام بوو، بەلام بەهۆی پاشەكشەی هێزەكانی سۆڤیەت و دەستبەرداربوون لەبەڵێنەكانیان، حكومەتی ئێران كۆمارەكەی لەناوبردو پێشەواش لە ٣١ی ئازاری (١٩٤٧) لەمەیدانی چوارچرا لەمەهاباد لەسێدارەدرا. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە هەردوو پەراوێزی ٢٢/١و ١٢/١٧).

# مانگی نیسان (ئەپڕیل)

## * ٤/١

- سەری ساڵی ئاشوری.
- ڕۆژی درۆ![1].
- ١٥٧٨ (ولیەم هارڤی) سوڕی خوێنی مرۆڤی دۆزیەوە.
- ١٨٤٧ مۆرکردنی پەیمانی دووەمی (ئەرزڕۆم) کەبووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی میرنشینە کوردیەکان

[1] - لەڕۆژی یەکی نیسانی هەموو ساڵێکدا لەسەرتاسەری جیهاندا هەندێك کەس درۆیەك ئامادە دەکەن بۆ گاڵتەکردن بەکەسانی تر، ئەم ڕۆژە بەڕۆژی درۆی جیهانی یان (درۆی نیسان) دادەنرێت، وەك ئەوەی لەژیانماندا تەنها ئەو ڕۆژە درۆ بکەین!، ڕۆشنبیری میسری بەناوبانگ (دکتۆر ئەحمەد زەکی) لەیەکێك لەنووسینەکانیدا دەڵێت: یەکی نیسان ڕۆژی هەموو گەمژەکانەو بەئینگلیزیش پێی دەڵێن (All Fools day) لەفەرەنساوە گەیشتۆتە ئینگلتەرە، چونکە هیچ بنج و بناوانێکی بۆ گەلانی جەرمانی (کەئینگلیزەکان لەوانن) ناگەڕێتەوە، دەڵێن کاتی خۆی یەکی نیسان سەری ساڵ بوو، بەڵام پاشای فەرەنسا (شارلی نۆیەم) لەساڵی (١٥٦٤)دا بڕیارێکی دەرکرد کەدەبێ یەکی کانوونی دووەم لەجیاتی یەکی نیسان بکرێتە ڕۆژی سەری ساڵ، زۆربەی خەڵکەکە گوێڕایەڵی ئەم بڕیارەیان کردو پیرۆزبایی و دیاریەکانیان بەبۆنەی سەری ساڵەوە لەیەکی نیسانەوە گواستەوە بۆ یەکی کانوونی دووەم و لەسەریشی بەردەوام بوون، بەڵام کۆمەڵە خەڵکێکی کەم ئەم بڕیارەیان پەسەند نەکردو لەسەر نەریتەکەی جارانی خۆیان مانەوە، کاتێ یەکی نیسان دەهات لایەنگرانی بڕیاری نوێ گاڵتەیان بەخەڵکە کەمەکە دەکردو هەر لەسەر هەمان نەریتی کۆن دیاریان بۆ دەناردن کەپڕبوو لەگاڵتەجاڕی و گەمە پێکردن، بەتێپەڕبوونی کاتیش ئەم کەمینەیە خەبەریان نەما، بەڵام ئەم نەریتە ناوبانگی خۆی ون نەکردو بوو بەنەریتێکی جیهانی.

- ١٩٢٤ دەرچوونی گۆڤاری (ڕوناهی) لەشام[١]
- ١٩٣١ بڵاوبوونەوەی پارەی عێراقی بە (دینار).
- ١٩٦٠ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) لەسلێمانی[٢]
- ١٩٩٧ دووەمین کۆنگرەی (یەکگرتووی قوتابیانی ئیسلامی کوردستان) لەشاری هەولێر گرێدرا.
- ٢٠٠٠ کۆچی دوایی شاعیری کورد (حاجی ئیبراهیمی شاتری).
- ٢٠٠٢کۆچی دوایی ڕووناکبیری کورد (مامۆستا مەسعود محەممەد)[٣].

---

[١] – لە یەکی نیسانی (١٩٤٢) یەکەم ژمارەی گۆڤاری (ڕوناهی) لەشام لەلایەن میر (جەلادەت عالی بەدرخان)ەوە دەرچووە، (ڕوناهی) بەپیتی لاتینی و بەشێوە زاری کرمانجی بۆتان بڵاوکراوەتەوە، گۆڤارەکە تا ئاداری (١٨٤٥) بەردەوامبووەو (٢٨) ژمارەی لێ دەرچووە.

[٢]– لە یەکی نیسانی (١٩٦٠) یەکەم ژمارەی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) بڵاوکرایەوە، (کامەران موکری) شاعیر سەرنووسەری گۆڤارەکە بووە، گۆڤارەکە تاپایزی (١٩٦١) بڵاوکراوەتەوە (١٨) ژمارەی لێ دەرچووە.

[٣] – مەسعود محەمەد کوڕی زانای گەورەی کورد (مەلا محەمەدی کۆیە)یەو لەبنەماڵەی جەلی زادەیە، ساڵی (١٩١٩) لەدایکبووە، لای باوکی دەستی بەخوێندن کردووە لەقوتابخانە درێژەی بەخوێندن داوەو کۆلیژی (ماف)ی لەبەغداد تەواوکردووە، چەندین پۆستی حکومی لەئەستۆ گرتووە، لەوانە: (ئەندامی پەرلەمان و ئەندامی ئەنجومەنی ڕاژە (مجلس الخدمة)و وەزیری)، دواتر بۆتە ئەندامی (کۆڕی زانیاری کورد) لەبەغداد، مامۆستا (مەسعود محەمەد) بەدەیان کتێبی بەنرخی بەزمانی کوردی و عەرەبی نووسیوە، لەوانە (حاجی قادری کۆیی) لە (٣) بەرگدا، (زاراوەسازی پێوانە)، (چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی)، (الی العظیم غورباتشوف)، (لسان الکرد)و چەندینی تر، ژیاننامەی خۆی بەناوی (گەشتی ژیانم) بەچاپ گەیاندووە، لە یەکی نیسانی (٢٠٠٢) لە(نەخۆشخانەی ڕزگاری لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کرد.

٢٠٠٤ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ئاسۆ) لەسلێمانی.

## * ٤/٢

- ١٨٧٢ کۆچی دوایی (سامۆیل مۆرس) داهێنەری یەکەمین تەلەگرافی کارەبایی[١].

- ١٩٠٢ یەکەم سینەما لەجیهاندا کرایەوەو یەکەم فیلم پێشکەشکرا.

- ١٩٤٤ کۆچی دوایی شاعیری کورد (ناری)[٢].

- ١٩٥٩ مۆرکردنی (پەیمانی بەغداد).

- ١٩٧٤ کۆچی دوایی (جۆرج بۆمبیدۆ) سەرۆکی فەرەنسا.

- ٢٠٠٢ (د. بەرهەم سالح) سەرۆکی ئەوکاتەی حکومەتی هەرێم (ئیدارەی سلێمانی) لەهەوڵێکی تیرۆرکردن ڕزگاری بوو.

## * ٤/٣

- ڕۆژی جیهانی کتێبی منداڵ.

---

[١] - زاناو هونەرمەندی وێنەگری ئەمریکی (سامۆئیل مۆرس) لەساڵی (١٧٩١) لەدایکبووە، ساڵی (١٨١٠) لەزانکۆی (یێل) دەرچووەو هەر لەو زانکۆیەدا بووە بەمامۆستا، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی (ئەکادیمیای نەتەوەیی وێنەگرتنی ئەمریکا)، (یاسای مۆرس)ی داهێناوە بۆ ناردنی (بروسکە)، پاشان ئامێرێکی دروستکردووە کە بووەتە بناغەیەك بۆ (تەلەگراف)، (مۆرس) یەکەم هێڵی بێتەلی بۆ ناردنی بروسکە لەساڵی (١٨٤٤)دا لەنێوان (پاریس)و شاری (ڕوان)دا لەباکووری فەرەنسادا تاقیکردەوەو تیایدا سەرکەوت، لە (١٨٦١) بۆ یەکەمجار تەلەگرافی لەفەرەنسادا خستەکارو هەموو شارەکانی فەرەنسای بەپاریسەوە بەستەوە.

[٢] - ناری شاعیر لەساڵی (١٨٧٤) لەگوندی (کێڵگ)ی سەر بەشاری مەریوانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەدایکبووە، ناری یەکێکە لەشاعیرە ناودارەکانی کوردو دیوانەکەی بەناوی (دیوانی کاکە حەمەی ناری)یەوە لەساڵی (١٩٦٩) لەمەریوان بڵاوکراوەتەوە، لەنیسانی (١٩٤٤) کۆچی دوایی کردووە.

- ١٣٣٦ لەدایکبوورونی (تەیموری لەنگ).
- ١٩٣٩ کوژرانی (مەلیك غازی) پاشای عێراق.
- ١٩٤١ (ڕەشید عالی گەیلانی) حکومەتی (بەرگری نیشتمانی) لەعێراق دامەزراند.
- ١٩٩٧ کۆچی دوایی هونەرمەندی کورد (ئەحمەد شەماڵ).
- ٢٠٠٥ کۆچی دوایی (پاپا یوحەننا پۆلسی دووەم) پاپای ڤاتیکان.

## * ٤/٤

- ١٩٢٩ کۆچی دوایی (کارل بێنز) داهێنەری ماکینەی گازۆلین.
- ١٩٤٦ ڕۆژی سەربەخۆیی (هەنگاریا)[١].
- ١٩٥٩ بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەی (خەبات).
- ١٩٦٠ سەربەخۆیی (سەنیگال) لەفەڕەنسا.
- ١٩٨٦ کۆچی دوایی (حاجی مستەفای یاروەیسی).
- ١٩٩٤ دامەزراندنی (دەنگی یەککرتوو – ڕادیۆی هەولێر).

---

[١] – (هەنگاریا) یاخود (مەجەڕ) کۆمارێکە لەئەورووپای ناوەڕاستداو پایتەختەکەی شاری (بۆداپست)ە لەسەر ڕووباری (دانوب)، ڕووبەرەکەی (٩٣,٠٧١ کم٢)یەو دانیشتوانی نزیکەی (١١) ملیۆن کەسە، لەخاکی هەنگاریادا بەرزایی ناگاتە (١٠٠٠م)و گەورەترین دەریاچەی ئەورووپای ناوەڕاستی تیایە کە (بەلەتۆن)ە، مەجەڕیەکان لەسەردەستی (ستیڤنی یەکەم) بوون بەمەسیحی، لەساڵی (١٢٤٢) مەغۆلەکان داگیریان کرد، ساڵی (١٥٤١) کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان، لە (١٧١١) بنەماڵەی (هابسبورگ)ەکان توانیان (هەنگاریا) بخەنەوە ژێر دەستی خۆیانەوە، بەڵام هەر لەململانێدا بوون لەگەڵ هێزە بیانیەکاندا تا لەدوای جەنگی جیهانی دووەم لەساڵی (١٩٤٦) بوو بەکۆمارێکی سەربەخۆ، لە (١٩٤٨) کۆمۆنیستەکان بەکودەتایەك دەسەڵاتیان گرتە دەست و کردیان بە کۆمارێکی گەلی و چووە ناو (پەیمانی وارشۆ)وە، ساڵی (١٩٥٥) بەئەندامی (نەتەوە یەککرتووەکان) وەرگیرا.

- ٢٠٠٧ ڤستيڤاڵی ساڵيادی لەسێدارەدانی (پێشەوا قازی محەمەد) لەهەولێر بەڕێوەچوو.

# * ٤/٥

- ١٩٣١ (شەڕی ئاوباريك) لەنێوان شێخ مەحموودی حەفيدو هێزەکانی ئينگليزدا ڕوويدا.
- ١٩٨٠ ئەنفال و بێ سەروشوێنکردنی کوردە فەيليەکان لەلايەن ڕژێمی پێشووی عێراقەوە.
- ١٩٩١ دەرچوونی بڕياری ژمارە (٦٨٨)ی (ئەنجومەنی ئاسايش) تايبەت بەکێشەی کورد.

# * ٤/٦

- ١٨٦٨ شاری (تۆکيۆ) بوو بەپايتەختی (يابان).
- ١٨٩٦ يەکەمين خولی يارييەکانی ئۆلۆمپی لەشاری ئەسينای يۆنان دەستی پێکرد.
- ١٩٣٩ (مەليك فەيسەڵی دووەم) بوو بەپادشای عيراق[1].
- ١٩٨١ کۆچی دوايی شاعير (محەمەد ئەمين کاردۆخی) لەسلێمانی.
- ١٩٩٣ کۆچی دوايی (محەمەد ناسڕ داتۆسيتارۆ) ئەندامی ئەنجومەنی بنياتنەری (ڕابيتەی ئيسلامی جيهانی) و سەرۆکی (ئەنجومەنی باڵای بانگەوازی ئيسلامی ئەندەنوسی).

---

[1] - مەليك فەيسەڵی دووەم کوڕی مەليك غازی کوڕی مەليك فەيسەڵی يەکەمە، ساڵی (١٩٣٥) لەدايکبووە، ساڵی (١٩٣٩) لەتەمەنی (٤) ساڵيدا بووەتە پاشای عێراق، بۆيە (عەبدولئيلاه)ی خاڵی دەبێتە وەصی بەسەر عەرشەوەو کاروباری وڵات دەبات بەڕێوە، لەشۆڕشی ١٤ی تەموزی (١٩٥٨)دا خۆی و خاڵی دەکوژرێن.

- ٢٠٠٠ كۆچی دوایی سەرۆکی تونس (حەبیب بۆرقێبە).
- ٢٠٠٥ (مام جەلال تاڵەبانی) بوو بەسەرۆك کۆماری عێراق[١].

## * ٤/٧

- ڕۆژی تەندروستی جیهانی.
- ١٩١٨ (مارشاڵ ویلن) سەرکردەی سوپای بەریتانیا شاری کەرکووکم داگیرکرد.
- ١٩٤٧ دامەزراندنی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست.
- ١٩٤٧ کۆچی دوایی (هێنری فۆرد) داهێنەری ئۆتۆمبیلی (فۆرد).

---

[١] - جەلال تاڵەبانی لە (١٩٣٣) لەگوندی خەلەکانی نزیك دەریاچەی دوکان لەدایکبووە لەتەمەنی (١٣) ساڵیدا لە ڕیزەکانی یەکێتی قوتابیاندا کاری کردووە، ساڵی دواتر پەیوەند؛ بە(پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە کردووە، لەتەمەنی (١٨) ساڵیدا بەئەندامی کۆمیتە؛ ناوەندی پارتی هەڵبژێردراوە، ساڵی (١٩٥٩) کۆلیژی یاسای زانکۆی بەغدادی تەواوکردووە لەشەستەکاندا کاتێك ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی بووە لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانم سەرۆکی پارتیدا نێوانیان تێکچووەو لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەدی خەزوری و چەند کەسێکی ت بە(باڵی مەکتەبی سیاسی) ناویانگیان دەرکرد، ساڵی (١٩٧٥) لەگەڵ چەند هاوەڵێکیە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ی دامەزراندووەو لەوکاتەشەوە تائێستا سکرتێری گشتم (یەکێتی)یە، تاڵەبانی کاری ڕۆژنامەگەری کردووەو ئینگلیزیەکی باش دەزانێ و سەردانم زۆربەی وڵاتانی دونیای کردووە، لەدوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس لەعێراق، مام جەلال یەکێا بوو لە (٢٥) ئەندامەکەی (ئەنجومەنی حوکم)و بۆ ماوەی مانگێکیش سەرۆکایەتم ئەنجومەنەکەی لەئەستۆ بووە، دوای هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠٠٥) بەسەرۆك کۆماری عێراز هەڵبژێردراوە، کە یەکەمجارە کوردێك ئەو پۆستە وەربگرێ، لەسەرەتای ساڵی (٢٠٠٧ تووشی ماندووبوونێکی لەڕادەبەدەر هات و ناچاربوو بۆ ماوەیەك لەژێر چاودێری پزیشکید لەعەممانی پایتەختی ئەردەن بمێنێتەوەو پاشان بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی ڕوو لەئەمریکا کرد، تائێستاش (٢٠٠٨) لەپۆستی سەرۆك کۆماری عێراقدا ماوەتەوە.

- ١٩٤٨ دامەزراندنی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (W.H.O).

# * ٤/٨

١٨٦١ کۆچی دوایی (ئێلیشا ئۆتیس) پەرەپێدەری مەسعەدەی میکانیکی.

- ١٩٧٣ کۆچی دوایی شێوەکاری جیهانی (پیکاسۆ)[1].
- ١٩٧٨ کۆچی دوایی مامۆستا (أ.ب. هەوری).
- ٢٠٠٠ کۆچی دوایی مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد) لەلەندەن[2].

---

[1] - (پابلۆ پیکاسۆ)ی شێوەکار، لەساڵی (١٨٨١) لەشاری (مەلاگا)ی ئیسپانیا لەدایك بووە، باوکیشی وێنەکێش بووەو مامۆستا بوو لەقوتابخانەی کاری هونەرە دەستیەکان، پیکاسۆ دەساڵی سەرەتای تەمەنی هەر لە (مەلاگا) بردۆتە سەر، ساڵی (١٨٩٥) بەخێزانەوە دەچنە (بەرشەلۆنە)و پیکاسۆ دەبێتە قوتابی لەقوتابخانەی (لالۆنیا)و دوو ساڵی یەکەم بەیەك ساڵ دەبڕێت، لەتەمەنی (١٦) ساڵیدا لەسەر ئاستی ئیسپانیا باشترین وێنە دەکێشێ، لەساڵی (١٩٠٠) دەچێت بۆ فەرەنساو سوود لەئەزموونی شێوەکارانی ئەوێ وەردەگرێ، هەروەها دەکەوێتە ژێر کاریگەری هەلکۆڵینی ئەفریقی و دەمامکەکان و ئەم کاریگەریەش ساڵی (١٩٠٧) لە شاکارەکەی (ژنانی ئەفیۆن)دا ڕەنگ دەداتەوە، هەروەها پیکاسۆ ساڵی (١٩٠٧) کۆمەڵێك پەیکەری دروستکرد، پیکاسۆ هەر لەمنداڵیەوە خولیای کۆتری سپی بوو، وە بەڕەمزی ئاشتی دەزانی، بۆیە کاتێك لەنیسانی (١٩٤٩)دا (کۆنگرەی ئاشتی جیهانی) لەپاریس بەسترا، پیکاسۆ کۆترەکەی وێنەکردو کۆنگرە پەسەندیان کرد، لەو ڕۆژەوە تائێستا کۆتری سپی سمبولی ئاشتییە.

[2] - ئیبراهیم ئەحمەد، لەساڵی ١٩١٤ لەگەڕەکی دەرگەزێنی شاری سلێمانی لەدایکبووە، ناوەندی و ئامادەیی لەبەغداد تەواوکردووە، کۆلیژی یاسای زانکۆی بەغدادی تەواوکردووەو لێکۆڵینەوەی بڕوانامەکەی لەسەر پەیوەندی کوردو عەرەب لە (١٩٣٧) بڵاوکردەوە، ساڵی (١٩٤٦) ژنی هێناوەو دوو کوڕو شەش کچی هەبووە، لەساڵانی پەنجاکاندا بەگومانی چالاکی لەناو حیزبی شیوعی سێ ساڵ زیندانی کراوە، لەساڵانی (١٩٥٣-١٩٦٤) سکرتێری مەکتەبی

* ٤/٩

- ١٩٤٨ قەڵاچۆکردنەکەی (دێریاسین) لەسەردەستی جوولەکە لەفەلەستین.
- ١٩٨٨ دەستپێکردنی شاڵاوەکانی ئەنفالی سێ لەناوچەی گەرمیان.
- ١٩٩٠ کۆچی دوایی شاعیر شێخ عەلائەدین نەقشبەندی) ناسراو بە (بێوەی).
- ١٩٩٤ ئیعلانکردنی (یەکگرتووی قوتابیانی ئیسلامی کوردستان)[١].

---

سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە، لەساڵانی شەستەکاندا لەگەڵ جەلال تاڵەبانی سەرکردایەتی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی کردووە بەرامبەر بەباڵی مەلا مستەفا بارزانی لەکۆتایی ساڵانی شەستەکاندا چۆتە هەندەران و لەلەندەن نیشتەجێ بووە، ئیبراهیم ئەحمەد لەماوەی ساڵانی (١٩٣٩-١٩٤٩) گۆڤاری (گەلاوێژ)ی دەرکردووە، لە (١٩٥٨-١٩٦١) رۆژنامەی (خەبات)و پاشان رۆژنامەی (کوردستان)ی لەبەغداد دەرکردووە، لەساڵی ١٩٧٢ رۆمانی (ژانی گەل)و لە ساڵی ١٩٩٢ (درك و گوڵ)ی بڵاوکردەوە، لەنیسانی (٢٠٠٠) لەلەندەن کۆچی دوایی کردو لەسلێمانی بەخاك سپێردراوە.

[١] - رێکخراوی (یەکگرتووی قوتابیانی ئیسلامی کوردستان)، لە ١٩٩٤/٤/٩ راگەیەنرا، راگەیاندنی رێکخراوەکە قۆناغی سێیەمی کاریەتی، کەپێشتر بەدوو قۆناغی تردا تێپەڕیوە، کە قۆناغی نهێنی پێش راپەڕین و قۆناغی خۆرێکخستنەوەی دوای راپەڕین تا ساڵی (١٩٩٤)، (رێبوار عەلی) کەماوەیەك سکرتێری ئەم رێکخراوە بووە دەڵێت: (راگەیاندنی ئەم رێکخراوە بەتەنها مۆدێلێکی دوای راپەڕین نەبوو، بەڵکو بزاڤی قوتابیانەی رەسەن بوو کەلەژێر شەپۆلی تەوژمی ئیسلامی میانڕەودا کاری دەکرد)، لەخاڵە بەهێزەکانی ئەم رێکخراوە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی سەدان و هەزاران لاوی کوردە لەناوەندەکانی خوێندندا، هەروەها بەشداریکردن و بەدەستهێنانی پلەی دووەم لەهەڵبژاردنەکانی نوێنەرایەتی ناوەندەکانی خوێندندا، جێی ئاماژەیە لەقۆناغێکی نوێیدا (یەکگرتووی قوتابیان) لەکۆنگرەی پێنجەمی خۆیدا کە لەمانگی ئابی ساڵی (٢٠٠٥) لەشاری دهۆك

- ٢٠٠٣ ڕووخانی ڕژێمی دیکتاتۆری بەعس لەعێراق.

## * ٤/١٠

- ١٩٣١ کۆچی دوایی شاعیری لوبنانی (جوبران خەلیل جوبران).
- ١٩٨٥ تیرۆرکردنی (عەبدولخالق مەعروف) لەهەولێر.
- ٢٠٠٣ ئازادکردنی شاری کەرکوك پاش ڕووخانی ڕژێمی سەدام لەبەغداد.

## * ٤/١١

- ١٩٧٦ کۆچی دوایی شاعیری کورد (شێخ مەمدوح بریفکانی)[١].
- ١٩٩٠ (گۆرباتشۆف)ی سەرۆکی (یەکێتی سۆڤیەت) سیستمی نوێی جیهانی ڕاگەیاند کەبووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی (یەکێتی سۆڤیەت).

## * ٤/١٢

- ١٩١٩ دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلان (عصبة الامم).
- ١٩٤٥ کۆچی دوایی سەرۆکی ئەمریکی (فرانکلین ڕۆزفلت).
- ١٩٥٣ کۆچی دوایی (حەپسەخانی نەقیب) لەسلێمانی.
- ١٩٦١ چوونی یەکەم ئادەمیزاد بۆ بۆشایی ئاسمان (یوری گاگارین).

---

گرێدرا، کاری ڕێکخستن و ڕێکخراوەیی لێك جیاکردەوەو هەر لەم کۆنگرەیەشدا ناوی ڕێکخراوەکە گۆڕا بۆ (ڕێکخراوی گەشەپێدانی قوتابیانی کوردستان).

[١] – شاعیری کورد (شێخ مەمدوح بریفکانی) لەساڵی (١٩١١) لەگوندی (بادێ)ی نزیك شاری (دهۆك) لەدایکبووە، بۆخوێندن زۆر ناوچەی وەك (بریفکان و سپیندارێ و ئەتروش) گەڕاوە، شاعیرێکی بەتوانا بووەو هۆنراوەی (دڵداری و سۆفیگەری و سرووشت و نیشتمانپەروەری) هۆنیوەتەوە، لەنیسانی (١٩٧٦) کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٩٤ کۆچی دوایی (ڕەسوڵ مامەند) ئەندامی مەکتەبی سیاسی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان).
- ١٩٩٥ (پەرلەمانی باکوور) لەشاری (لاهای) ڕاگەیەنرا.
- ١٩٩٩ کۆچی دوایی نووسەری کورد (م. ڕەئوف ئەحمەد ئالانی).

## * ٤/١٣

- ١١٥٤ لەدایکبوونی زانای کورد (سوڵتان موزەفەرەدینی کەوکەبەری).
- ١٩٦٦ کۆچی دوایی سەرۆك کۆماری عیراق (عەبدولسەلام عارف)[١].

## * ٤/١٤

- ١٨٦٥ تیرۆرکردنی سەرۆکی ئەمریکی (ئەبراهام لنکۆڵن).
- ١٩٠٢ دەرچوونی ژمارە (٣١)ی ڕۆژنامەی (کوردستان) لەجنێف، کەدوا ژمارە بوو.
- ١٩١٢ نقوومبوونی کەشتی (تایتانیك)ی بەریتانی و خنکانی (١٥١٣) کەس.
- ١٩٨٨ دەست پێکردنی شاڵاوی بەدناوی ئەنفال لەلایەن حکومەتی پێشووی عێراقەوە، کە بە (ڕۆژی ئەنفال) ناسراوە.

---

[١] - عەبدولسەلام محەمەد عارف، ساڵی (١٩٢١) لەناوچەی (کەرخ)ی بەغداد لەدایك بووە، ساڵی (١٩٤٤) کۆلیژی سەربازی تەواوکردووە، بەشداری شۆڕشی چواردەی تەمموزی (١٩٥٨)ی کردووە بۆ ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی، لەحکومەتی کۆماریدا بوو بە جێگری سەرۆك وەزیران (عەبدولکەریم قاسم) و وەزیری ناوخۆ، لە ٨ی شوباتی (١٩٦٣)دا کودەتای کرد بەسەر حکومەتەکەی (عەبدولکەریم قاسم)داو دەستی بەسەر حوکمدا گرت و بوو بەسەرۆك کۆمارو پلەی سەربازی (موشیر)ی پێدرا، بەڕووداوی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکە لەباشوری عێراق لەساڵی (١٩٦٦) کۆچی دوایی کردووە، لەدوای خۆی (عەبدولڕەحمان عارف)ی کرایە سەرۆك کۆمار.

- ١٩٩٥ دەرچوونی بڕیاری ژمارە (٩٨٦)ی ئەنجومەنی ئاسایش، ناسراو بەبڕیاری (نەوت بەرامبەر بەخۆراك).

- ٢٠٠٨ (ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق) پرۆسەی بەناو ئەنفالی گەلی کوردی بە (جینۆساید) ناساند.

## * ٤/١٥

- ١٩٢١ کۆچی دوایی (مەحمود پاشای جاف).
- ١٩٨٠ کۆچی دوایی فەیلەسوفی فەڕەنسی (جان پۆل سارتەر)[1].

## * ٤/١٦

- ١٨٨٩ لەدایکبوونی هونەرمەندی کۆمیدی (چارلی چاپلن)[2].

---

[1] - سارتەر، فەیلەسوف و ڕۆماننوسی فەڕەنسی، ساڵی (١٩٠٥) لەپاریس لەدایك بووە، ساڵی (١٩٢٩) قوتابخانەی گشتی ناوەندی تەواو کردووە، ساڵی (١٩٣١) فەلسەفەی لەهامز خوێندووە، ساڵێك دواتر لەبەرلین خوێندویەتی، یەکەم ڕۆمانی (هێڵنج ١٩٣٨)و (کۆمەڵە چیرۆکی خۆشەویستی ١٩٣٩) دەنگیان دایەوەو بوونە مایەی ئەوەی وەکو نووسەرێك دانی پێدا بنرێت، لەکتێبە فەلسەفیەکەیدا (ئەگزیستانسیالیزم و نەبوون – بوون و نەبوون) (١٩٤٣)، مەرجەکانی مرۆڤ سەبارەت بەخۆی و جیهان و تاکەکانی تر ئاشکرا دەکات، یەکەم ژیننامەی لەکتێبێکدا بەناوی (پەیڤان) لەساڵی (١٩٦٤)دا بڵاوکردۆتەوە.

[2] - (چارلی چاپلن) ناوداری سینەما، لەساڵی (١٨٨٩) لەلەندەن لەدایك بووە، باوك و دایکی ئەکتەری شانۆ بوون و خۆیشی لەسەرەتای ساڵەکانی ژیانی بەشانۆگەری دەستی پێکرد، چارلی لە (٢١) ساڵیدا ڕۆیشتووە بۆ نیویۆرك و هەرلەوێ لەنمایشێکی کۆمیدیدا درەوشایەوەو لەساڵی (١٩١٣) بۆ یەکەم جار لەفیلمێکدا بەشداری کرد، لەساڵی (١٩١٨) بەهاوبەشی لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی بەناوبانگ کۆمپانیای (یونایتد ئارتیستن)ی بۆ بەرهەمهێنانی فیلم دروستکرد، لەفیلمەکانی چارلی چاپلن: (ژیانی سەگی، ٣٥ ملیمەتری ڕەش و سپی، ئاڵتون، کوڕە منداڵەکە، چینی بێکار، دەستکەوتی ڕۆژانە، سیرك، ڕۆشنایی شار)، چاپلن لە

- ١٩٤٨ دامەزراندنی (ڕێکخراوی ئەوروپی بۆ هاریکاری ئابووری).
- ١٩٨١ دامەزراندنی (زانکۆی سەلاحەدین) لەهەولێر.
- ١٩٨٧کیمیابارانی (بالیسان و شێخ وەسان) لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە.
- ١٩٩١ دانانی هێڵی (٣٦) بۆ پاراستنی (هەرێمی کوردستان) لەڕژێمی بەغداد.
- ١٩٩٣ یەکەم کاری خۆکوژی لە (ئیسرائیل) ئەنجامدرا.

## * ٤/١٧

- ١٩٤٦ ڕۆژی سەربەخۆیی (سوریا) لەفەڕەنسا.
- ١٩٥٢ سەربەخۆیی (کەمبۆدیا) لەفەرەنسا.
- ١٩٦٦ (عەبدولڕەحمان عارف) بوو بەسەرۆك کۆماری عیراق.
- ١٩٩٣ کۆچی دوایی سەرۆکی تورکیا (تورکۆت ئۆزاڵ).

## * ٤/١٨

- ١٩٥٥ کۆچی دوایی زانای بەناوبانگ (ئینیشتاین)[١].
- ١٩٨٠ ڕۆژی سەربەخۆیی (زیمبابۆی).

---

فیلمی (دیکتاتۆری گەورە)دا دەڵێت: (دوای ئەوەی سەرۆك پەلاماری تەواوی گەلانی جیهانیدا ڕایگەیاند دەیەوێ بەئاشتی لەگەڵیاندا بژی!).

[١] - زانای فیزیایی ئەمریکی و بەڕەگەز ئەڵمانی (ئەلبێرت ئینیشتاین)، لەساڵی (١٨٧٩) لەئەڵمانیا لەدایکبووە، ساڵی (١٩٠٢) بووە بەهاوڵاتی سویسرا، پاش هاتنی نازیەکان لە ئەڵمانیا لەساڵی (١٩٣٣) کۆچی کرد بۆ ئەمریکاو جارێکی تر نەگەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا، خاوەنی (بیردۆزی ڕێژەیی)یە کە سەلماندی (خێرایی ڕووناکی جێگیرەو پەیوەندی نیە بەو سەرچاوەی لێوەی دێت یان ئەو کەسەی دەیبینێت)، ساڵی (١٩٢١) خەڵاتی نۆبڵی لەفیزیادا وەرگرتووە، ساڵی (١٩٤٦) بوو بەسەرۆکی کۆمیتەی هۆشیاری زانیارانی ئەتۆم، لەنیسانی (١٩٥٥) لەئەمریکا کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٨٦ کۆچی دوایی مامۆستا (هێمن)ی شاعیر[1].

## * ٤/١٩

- ١٨٨٢ کۆچی دوایی (چارلس داروین).
- ١٩٢٤ کۆچی دوایی شاعیری ئینگلیز (بیرۆن).
- ١٩٥٧ کۆچی دوایی شاعیری کورد (محەمەد مەهری) لەئەستەنبولّ.
- ١٩٦٣ دامەزراندنی (کۆمەڵەی کورد) لەلوبنان.

## * ٤/٢٠

- ١٨٨٩ لەدایك بوونی سەرکردەی نازی (ئەدۆلف هیتلەر).

---

[1] - مامۆستا (هێمن)ی شاعیر، ناوی (سەید محەمەد ئەمینی کوڕی سەید حەسەن لەیخولئیسلام موکریانی)یە، ساڵی (١٩٢١) لەگوندی (لاجین)ی شاری مەهاباد لەدایك بووە، خوێندنی فەرمی لەمەهابادو خوێندنی ئایینیشی لەخانەقای شێخی بورهان وەرگرتووە، لەساڵی (١٩٤٢) بووەتە ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ك) و پاشان (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)، لەگەڵ هەژار موکریانی شاعیردا بوونەتە نزیکترین کەس لەپێشەوا (قازی محەمەد)ی سەرۆك کۆماری کوردستان، هێمن وەك شاعیرێکی ریالیزمی ڕەخنەگری هاتە مەیدانی ئەدەب، بەڵام لەدوای هاتنی بۆ کوردستان و لەدواییدا نیشتەجێ بوونی لەبەغداد، بووە شاعیرێکی خامەڕەنگین، شاعیر لەهۆنراوەیەکدا بەناوی (عیشق و ئازادی) بەسەرهاتی ژیانی ئاوارەیی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

گەلێکم ڕۆژگاری تاڵ و شیرین ڕابورد، ئاخۆ
مەرگ مەودا دەدا دیسان ببینم سەردەمێکی تر؟
ئەما (خانی) هەتا چیرۆکی عەشقی ئێمە داڕێژێ
دەنا هێشتا لەکوردستان دەژین (زین و مەم)ێکی تر

(هێمن) لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران گەڕایەوە ڕۆژهەلاتی کوردستان و لەورمێ نیشتەجێ بوو، وە گۆڤارێکی کوردی بەناوی (سروە) دەرکرد، بەردەوام بوو لەسەر کارە ڕۆژنامەنووسیەکەی تا لە ١٨ی نیسانی (١٩٨٦)دا هەر لەورمێ کۆچی دوایی کرد.

– ١٩٤٥ یەکەم (ئەنجومەنی ئاشتی) لەپاریس کرایەوە.

– ١٩٦٩ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (ڕزگاری) لەسلێمانی.

## * ٤/٢١

– ١٩١٩ یەکەم شۆڕشی (شێخ مەحمود) دژی ئینگلیز دەستی پێکرد.

– ١٩٢٦ ناونوسکردنی کچان بۆ یەکەم قوتابخانەی کچان لەسلێمانی.

– ١٩٣٨ کۆچی دوایی شاعیرو فەیلەسوفی ئیسلام (د. محەمەد ئیقبالی لاهوری)[١].

---

[١] – محەمەد ئیقبالی کوڕی نور محەمەدە، لەساڵی (١٨٧٧) لەشاری (سیالەکوت) لەهەرێمی (بنجاب) لەدایك بووە، چۆتە کۆلێژی حکومی لەشاری لاهورو بەشداری کۆتا تاقیکردنەوەی لەفەلسەفەدا کردووەو (ماستەر)ی بەپلەی باڵا (إمتیان) وەرگرتووە، لەهەمان کۆلیژدا بووە بەمامۆستای فەلسەفەو زمانی ئینگلیزی، ساڵی (١٩٠٥) چووە بۆ لەندەن و لەزانکۆی (کامبرج) وەرگیراوەو بڕوانامەی باڵای لەفەلسەفەو زانستی ئابوریدا وەرگرتووە، پاشان چووە بۆ ئەڵمانیاو لەزانکۆی میونخ بڕوانامەی دکتۆرای لەفەلسەفەدا وەرگرتووە، جارێکی تر گەڕاوەتەوە بۆ لەندەن و بەشداری لەکۆتا تاقیکردنەوەی مافناسیدا کردووەو پەیوەندی کردووە بەخوێندنگای زانیاری ئابووری و ڕامیاریەوە لەلەندەن و لەهەردوو بابەتەکەدا بۆتە پسپۆڕی تایبەتمەندو چەندین وتارو وانەی لە خوێندنگەو چەندینی تریشی لەزانکۆی کامبرج پێشکەش کردووە، ڕۆژهەڵاتناسەکان و زاناکانی فەلسەفە و ئایین زۆر گرنگیان بەوانەکانی داوە، زۆرینەی بەرهەمەکانی وەرگێردراونەتە سەر زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی و ئەڵمانی و ڕووسی، ساڵی (١٩٣٠) هەڵبژێردراوە بۆ سەرۆکایەتی (رابیتەی ئیسلامی)و بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی یاسادانان لەبنجاب و، لەیەکەم وتاریدا بۆ یەکەم جار بیرۆکەی دامەزراندنی پاکستانی خستۆتە ڕوو، نوێنەری کۆنگرەی موسڵمانان بوو لەکۆنگرەی (المائدة المستديرة) لەساڵی (١٩٣١)و (١٩٣٢)، زانکۆی ئەرستۆو زانکۆی ڕۆماو زانکۆی سۆربۆن و زانکۆی بەحریت و کۆڕی مەلیکی لەڕۆما ئاهەنگی ڕێزلێنانیان بۆ سازکردووە، حەوت دیوان بەزمانی فارسی و، سێ دیوانی بەزمانی ئوردو لەگەڵ چەند وتارێکی گرنگیشی بەزمانی ئینگلیزی

## * ٤/٢٢

- ڕۆژی گۆی زەوی
- ١٨٩٨ ڕۆژی ڕۆژنامەگـەری کـوردی بەدەرچـوونی یەکـەم ژمـارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) لەقاهیرە[1].

---

هەیە، لە ٢١ی نیسانی (١٩٣٨) کۆچی دوایی کردووەو خـەڵکێکی زۆر هاوبەشی ناشتنی بوون، زانایان و بیریاران و سەرۆکی دەوڵەتان وتاریان لەبارەیەوە خوێندەوە.
د. محەمـەد ئیقبـاڵ لـەو وانانـەی کەپێشکەشی کـردوون دەربـارەی (تازەکردنـەوەی بـیری ئایینی لەئیسلامدا) زۆر بەقوڵی و بەوردی ڕەخنەکانی لـەژیاری خۆرئـاواو بنـەڕەت و جـۆری بیرکردنـەوەی دەرخـستووە، ئیقبـاڵ کۆمەڵگـەی ئـەورووپایی بـەوە نـاوزەد دەکـات کـە یەکەبەرایەتیەکی دڕندانە دەیبزوێنێت، ژیارەکەشیان بەهۆی ململانێی نێوان بەها ئایینیـەکان و بـەها ڕامیاریەکانـەوە یەکلایـەنی گیـانی خـۆی لەدەسـتداوە، ئیقبـاڵی لاهـوری پێـی وایـە کەژیاری ڕۆژئاوا ناتوانێ وڵاتانی ئیسلامی بەختەوەر بکات و خۆشی ژیانیان بـۆ بگێڕێتـەوە، لەبەرامبەردا پێی وایە کەئیسلام توانای دروستکردنی باشـترین کۆمەڵگـەی هەیـەو دەتـوانێ ژیانی کۆمەڵایەتی ڕێکبخات و هەموو گرفتە ئابووریـەکان لابـداو لـەنێوان بیروبـاوەڕو کـردارو گیان و جەستەو مافی تاك و کۆمەڵدا بارودۆخی گونجـاو دروسـت بکـات...، (محەمـەد عـەلی جەناح) لەیەکـەم وتاریـدا لەسـاڵی (١٩٤٧)داو پـاش دامەزرانـدنی دەوڵـەتی پاکستان دانـی بەوەدانا کە بۆچوونەکانی محەمەد ئیقبال بەردی بناغەی دەوڵەتی پاکستان بوون.

[1] - کوردستان یەکەمین ڕۆژنامـەی کوردیە، یەکـەم ژمـارەی لـە ٣٠ی ذي القعدةی (١٣١٥) بەرامبـەر بـە ٢٢ی نیـسانی (١٨٩٨) لـەقاهیرە لەلایـەن (میقـداد بـەگ مەدحـەت بـەدرخان پاشا)ەوە دەرچوو، ژمارە (٣١)ی کوردستان کەدوا ژمارەیە لە ٦ی محرم (١٣٢٠) بەرامبـەر بە یـەکی نیـسانی (١٩٠٢) لـەجنێف دەرچـووە، کوردسـتان تاژمـارە (٢٤)پـانزە ڕۆژ جارێك بـووەو لـەژمارە (٢٥)ەوە تاژمـارە (٣١) بـووە بەمانگانـە، کوردسـتان بـە (٤) لاپـەڕەی (٢٥,٥٠- ٣٢,٥٠ سم) دەرچووەو بەزاری کرمانجی ژووروو (بۆتانی)و بەپیتی عـەرەبی چـاپ دەکرا، کەبەشی زۆری ژمارەکانی لەکتێبخانەی شاری (ماربۆرگ)ی ئەڵمانیا پارێزراون.

- ١٩٩٤ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (یەکگرتوو) زمانحالی (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان).

- ١٩٩٤ کۆچی دوایی سەرۆکی ئەمریکی (ڕیچارد نیکسۆن).

- ٢٠٠٣ (جەی گارنەر) نوێنەری ئەمریکا لەعێراق بۆ یەکەم جار لەگەڵ بەڕێزان (بارزانی)و (تاڵەبانی) لەهاوینەهەواری دوکان کۆبۆوە.

- ٢٠٠٦ لەیەکەم کۆبوونەوەی (ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق) بۆ جاری دووەم بەڕێز (جەلال تاڵەبانی) بەسەرۆك کۆمار هەڵبژێردرایەوە.

## * ٤/٢٣

- ڕۆژی جیهانی کتێب.

- ١٦١٦ کۆچی دوایی ڕۆماننووسی ئینگلیز (ولیەم شکسپیر)[١].

- ١٩٦٢ کۆچی دوایی شاعیری کورد (نەجمەدینی مەلا)[٢].

---

[١] - (ولیەم شکسپیر) لەساڵی (١٥٦٤) لەئینگلتەرا لەدایکبووە، لەتەمەنی (١٨) ساڵیدا ژیانی هاوسەری پێکهێناوەو بووەتە خاوەنی سێ منداڵ، شکسپیر بەهۆی سەرکەوتوویی لەبواری نووسین و نواندندا ساڵی (١٥٩٦) حکومەتی بەریتانیا نازناوی (جێنتڵمان)ی پێ بەخشی، شاکارەکانی بریتین لە (یۆلیۆس قەیسەر، هاملێت، ئۆتێللۆ، ماکبێس، شالێر) لە ٢٣ی نیسانی (١٦١٦)داو لەتەمەنی (٥٢) ساڵیدا بەنەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

[٢] - مامۆستا نەجمەدین کوڕی مەلا غەفوری مەلا عەلی مەلا برایمە، ساڵی (١٨٩٨) لەسلێمانی لەدایکبووە، لەتەمەنی (١٤) ساڵیدا لەحوجرە دەستی بەخوێندن کردووەو پاشان لە قوتابخانەکانی سلێمانی درێژەی بەخوێندن داوە، ماوەیەك لەشاری (ڕانیە) بووە بەفەرمانبەر، نەجمەدین مەلا ڕووناکبیرو ڕۆژنامەنووسێکی بەناوبانگ بووەو هاوکارێکی بەردەوامی ڕۆژنامەی (ژین)ی پیرەمێردو (زاری کرمانجی) حسێن حوزنی موکریانی بووە، لایەنێکی گەورەو گرنگی ئەم ناودارەی کورد کردنەوەی قوتابخانەی (کەشتی نوح)ە لەشەقامی سابونکەرانی شاری سلێمانی، کە بۆ ماوەی (٤٠) ساڵی تەواو بەڕێوەی بردووەو

- ١٩٩٦ كوژرانی سەرکردەی چیچانی (جەوهەر دۆدایڤ).

- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی سەرۆکی پێشووی ڕوسیا (بۆریس یەڵسن).

## * ٤/٢٤

- ١٩١٩ ڕاپەڕینی (گۆیان) لەزاخۆ دژی ئینگلیز.

- ١٩٧٤و ١٩٨٢ کارەساتی بۆمباران و وێرانکردنی قەڵادزێ.

- ١٩٩٥ کۆچی دوایی مامۆستا (شێخ محەمەدی بالیسانی) لەبەغداد[1].

---

لەو ماوەیەدا نزیکەی (٧) هەزار کەسی لەنەخوێندەواری ڕزگارکردووە، مامۆستا نەجمەدین مەلا بەتەنیایی ژیاوەو بەتەنیاییش مردووە، (مامۆستا مستەفا نەریمان) بەمجۆرە باسی مردنی نەجمەدین مەلا دەکات و دەڵێ: (مامۆستا نەجمەدین مەلا لەڕۆژی ١٩٦٢/٤/٢٣ کۆچی دوایی دەکات، بەڵام چونکە دەرگای قوتابخانەکەی کلیل دابوو لاشەکەی بۆگەنی کردبوو، دوو پشیلەکەشی لەبرسا لەنەرمەی سەرو گوێی مامۆستا تێریان خواردبوو، تا لەڕۆژی ١٩٦٢/٥/٥دا پێی زانرا، مامۆستا لەپێشدا تەرمەکەی لەگردی (مامەیارە) لەتەنیشت هاوڕێی دێرینی خۆی (پیرەمێرد)ی شاعیرەوە دەنێژرێت، هەرچەندە خۆی وەسیەتی کردبوو لەسەر شاخی (ئەزمەڕ) بنێژرێت، بەڵام لەڕۆژی ١٩٧٠/٣/٢دا، بەوپەڕی ڕێزەوە تەرمەکەی دەگوێزنەوە بۆ سەر لوتکەی ئەزمەڕ.

[1] - محەمەد شێخ تەها شێخ عەلی، ساڵی ١٩١٨ لەگوندی (بالیسان)ی نزیک شەقڵاوە لەدایکبووە، لەتەمەنی (٧)ساڵیدا دەستی کردووە بەخوێندن لەدوای ئەوەی دەبێت بەمامۆستا لەزۆر شوێن مامۆستایی و وانەبێژی و وتاربێژی دەکات، ماوەیەک لەهەولێرو کۆیە دەبێت و ماوەیەکیش دەچێتە بیارەو دواتر دەچێت بۆ بەغداد، لەمزگەوتی (حسن البارح) ڕۆڵی زۆری بینیوە، شێخ محەمەد یەکێکە لەزانا ناودارەکان و خاوەنی چەندین بەرهەمی چاپکراوو چاپ نەکراوە بەزمانی کوردی و عەرەبی لەبوارەکانی (تەفسیرو فیقهـ و پەروەردەیی و شیعرو وتار)، لەوانەی کەبەزمانی کوردی دایناون: (ڕۆڵە پەروەری، چرای ڕوناکی، دەنگی دەروون تەفسیری سورەتی نون، چۆن حەج دەکەیت، دەنگی ناو دڵمە تەفسیری جزمی عەممە، پرسارو وەڵام لەسەر ڕێبازی ئیمامی شافیعی، دەنگی جەوانی).

- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی (م. شێخ ئەنوەر ئیبراهیم) بەڕێوەبەری گشتی پێشووی پەروەردەی سلێمانی لەساڵانی (٢٠٠١-٢٠٠٥).

## * ٤/٢٥

- ١٩٢٠ کۆنگرەی (سان ڕیمۆ) یاسای داگیرکردنی عێراقی لەسەربازی ڕاستەوخۆوە گۆڕی بۆ یاسای (ئینتداب).
- ١٩٤٥ دامەزراندنی (ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان) لەجنێڤ.
- ١٩٥٣ لەبواری زانستی بایۆلۆجیدا ترشی (DNA) دۆزرایەوە.
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی (مەلا ئەسعەدی مەحوی)[1].

---

[1] - مەلا ئەسعەدی مەحوی، کوڕی شێخ خالیدی شێخ محەمەدی مەحوی مەلا عوسمانە ساڵی (١٨٩٨) لەگەڕەکی (چوارباخ)ی شاری سلێمانی لەدایك بووە، خوێندنی حوجرەی لای (خواجەفەندی) خوێندووە، ساڵی (١٩١٥) چۆتە قوتابخانەی ئامادەیی لەبەغداد، لەلای مەلا حسێنی پیسکەندی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، سەرەتا لەمزگەوتی خومخانەو دواتریش لەخانەقای مەحوی دەبێتە ئیمام و مودەڕیس، ساڵی (١٩٣٦) لەگەڵ چەند ڕووناکبیرێکدا (کۆمەڵەی برایەتی) دژی داگیرکەری ئینگلیز دادەمەزرێنن، مەلا ئەسعەدی مەحوی لەساڵانی (١٩٤١) بەدواوە زۆرجار گیرۆدەی گرتن و بەندیخانە دەبێ بەتایبەتی لەبەندیخانەکانی کەرکوك و سلێمانی، ساڵی (١٩٤٣) ناچار دەبێت سلێمانی بەجێ بهێڵێت و ڕوویکاتە شاری سەردەشتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، شاعیر هۆنراوەکانی زیاتر لەبواری خۆشەویستی نیشتمان و تەسەوفدا بووە، لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەمدا مەلا ئەسعەد ئەم شیعرەی بۆ وەتەن وتووە:

ئەترسم ئەی وەتەن، لەم جەنگەشا دیل و بێ بەش بین
وەکو دەوری جەهالەت هەر خەریکی حیلەو غەش بین
ئەمان ئەی نەوجەوانینە، دەخیلە فرسەتە هەستن
لەماصەی صولحی عالەم، بەڵکو ئێمەش خاوەن بەش بین

- ١٩٩٢ كردنەوەی بەشی كوردی ڕادیۆی دەنگی ئەمریكا[١].

- ١٩٩٤ دەرچوونی یەكەم ژمارەی گۆڤاری (گوڵان) لەهەولێر.

## * ٤/٢٦

- ١٨٩٧ لەدایكبوونی سەركردەی كورد (جەلادەت بەدرخان).

- ١٩٢٥ لەسێدارەدانی (شێخ سەعیدی شەمزینان).

- ١٩٣٠ كۆچی دوایی زانای كورد (ئەحمەد تەیمور پاشا).

- ١٩٥٠ دامەزراندنی (كۆمەڵەی مامۆستایان) لەهەولێر.

- ١٩٧٦ دامەزراندنی كۆمەڵەی خوێندكارانی كوردستان.

---

دزی عەیبە، بەسە كوشتن، زەمانی وەحشیەت تاكەی

لەبەر زوڵم و زەلالەت، بۆچی ئێمە پیس و ڕوو ڕەش بین

لەبەرهەمەكانی:

- بەشێك لەدیوانی (ئەسعەد مەحوی) ١٩٧٠- سلێمانی.
- عقائد الرحمانية، ١٩٤٩- بەغداد.
- تحسين البيانية، دەستنووس
- شرح علی عقائد الرحمانية، دەستنووس.

مەلا ئەسعەدی مەحوی لەساڵی (١٩٧٦) كۆچی دوایی كردووەو لەگردی سەیوان لەسلێمانی بەخاك سپێردراوە.

[١] - پاش شەڕی كەنداوی (١٩٩١) (كۆنگرەی نەتەوەیی كورد) لەئەمریكا هەوڵێكی زۆریدا تاتوانی لە ٢٥ی نیسانی (١٩٩٢) بەشی كوردی ڕادیۆی دەنگی ئەمریكا بكەوێتەكار، لەسەرەتادا بەشی كوردی تەنها (٥) كارمەندی هەبوو، وە تەنها (١٥) خولەك بەرنامەی هەبوو، پاش مانگی تشرینی دووەمی (١٩٩٢) ماوەی بەرنامەكان بوون بەیەك كاتژمێر بوو وە ژمارەی كارمەندەكانیشی (١١) كەس بوون، لەساڵی (٢٠٠٣) ماوەی بەرنامەكان بوو بە چوار كاتژمێر، بەشی كوردی دوو ماڵپەڕی هەیە بەشێوەی لاتینیو ڕێنووسی كوردی.

## * ٤/٢٧

- ١٥٢١ کۆچی دوایی گەشتیاری بەناوبانگی جیهانی (ماجەلان)[١].
- ١٧٩١ لەدایکبوونی (سامۆئیل مۆرس) داهێنەری تەلەگراف.
- ١٩٠٩ لابردنی (سوڵتان عەبدولحەمید) لەخەلافەتی عوسمانی.
- ١٩٦٠ سەربەخۆیی (توگۆ) لەفەرەنسا.
- ١٩٩٣ دەرچوونی یاسای چاپەمەنی لەلایەن (ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان)ەوە.
- ١٩٩٣ سەربەخۆیی (ئەریتریا).

## * ٤/٢٨

- ١٩١٨ ئینگلیزەکان هەردوو شارۆچکەی (کفری و خوورماتوو)یا داگیرکرد.
- ١٩٣٧ لەدایکبوونی سەرکردەی دیکتاتۆری عێراق (سەدام حسێن).

## * ٤/٢٩

- ١٩٢٠ یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) لەسلێمانی دەرچوو[٢].

---

[١] - کەشتی (ڤیکتۆریا) بۆ یەکەمجار بەدەوری دونیادا گەڕا، (فردیناند ماجەلان) پورتوگالی کاپیتانی ئەم کەشتیەبوو، ماجەلان لەساڵی (١٥١٩) گەشتەکەی دەست پێکرا سێ ساڵی خایاند، سەرەنجام ماجەلان لەو گەشتەیدا کوژراو (١٨) کەس لەسەرنشینا کەشتیەکە یەکەم کەسانێك بوون بەدەوری جیهاندا گەڕان.

[٢] - (پێشکەوتن) یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیە کە لەکوردستانی عێراق و بەتایبەتی لەسلێمانیدا، دوای جەنگی جیهانی یەکەم لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دەرچوو، (مێجەرسۆن) حاکمی سیاسی ئینگلیز لەشاری سلێمانی سەرنووسەرو سەرپەرشتیکاری ڕۆژنامەکە بوو پێشکەوتن ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بوو بەقەبارەی (٣٢*٢١سم)، یەکەمین ژمارەی لە ٢٩

- ١٩٤٥ كۆچی دوایی (مۆسۆلۆنی).

- ١٩٦٧ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (التآخی)لە بەغداد.

- ٢٠٠٥ مامۆستا (عەلی باپیر) ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی پاش (٢٢) مانگ زیندانی لەلایەن ئەمریکیەکانەوە ئازادکرا.

## * ٤/٣٠

- ١٧٨٩ (جۆرج واشنتۆن) بوو بەیەکەم سەرۆکی ئەمریکا.

- ١٨٦٩ (مەدحەت پاشا) کرا بە والی بەغدا.

- ١٩٢٣ شاری (سلێمانی) کرا بە پارێزگا.

- ١٩٤٥ (ئەدۆلف هیتلەر) خۆی کوشت.

- ١٩٧٣ کۆچی دوایی خۆشنووس (هاشم بەغدادی)[1].

---

نیسانی (١٩٢٠) دەرچووەو بەردەوام هەموو پێنج شەممەیەك تا ژمارە (١١٨)ی لە ٢٧ی ئەمووزی (١٩٢٢) بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دەرچووە، لەسەرووی لای ڕاستی لاپەڕە یەکی هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەکە لەتەنیشت ناوی ڕۆژنامەکەوە نووسراوە (هەموو شتێك بۆ پێشکەوتن دەنووسری)

پێشکەوتن ڕۆژنامەیەکی ڕەسمی بوو، بەڵام لەگشت بابەتەکانیدا تێکەڵ بەخەم و کاروباری گشتی، وێڕای ئەوەی بەفراوانی هەواڵی نێودەوڵەتی بڵاودەکردەوە کە لەئاژانسی ڕۆیتەرەوە وەری دەگرتن، ڕۆژنامەکە سیاسەتی ئینگلیزی بەرامبەر بەکورد دەخستەڕوو، کەسیاسەتێك بوو زۆر بەڵێنی بەکورد دەدا...، پێشکەوتن بەهۆی کشانەوەی ئینگلیز لەسلێمانی و لەسلیمکردنی کاروبارەکانی بە(شێخ مەحمود) وەستا، لەوەودوا ڕۆژنامەگەری تەواو کوردی بەدەرچوونی (بانگی کوردستان) لەدایك بوو.

[1] / هاشم بەغدادی یەکێکە لەخۆشنوسە بەناوبانگەکانی سەدەی ڕابردوو، لەساڵی (١٩٢١) لەبەغداد لەدایکبووەو بەبێباوکی لەلای باپیری پێگەیشتووە، هەر لەسەرەتای تەمەنیەوە هونەری خۆشنووسی لای (عارف الشیخلی)و (حاجی محەمەد عەلی سابیر) کە بەڕەچەڵەك کورد بووەو خەڵکی سلێمانی بووە خوێندووە، پاشان چووەتە لای مەلا عەلی فەزڵی کە

- ١٩٧٥ سەرکەوتنی شۆڕشی ڤێتنام.
- ١٩٩٨ کۆچی دوایی شاعیری گەورەی عەرەب (نزار قەبانی)[١].

---

زانایەکی بەرز بووەو هاشم لەبارەیەوە دەڵێت: ئەو قوتابیەی لەنوێژی بەیانیان دواکەوتبا مامۆستا خەتی بۆ چاك نەدەکردەوە، هەمیشە دەست نوێژی پێ هەڵدەگرتین و یەکەم جار ناوی (الله)ی پێ دەنووسین، لەساڵی (١٩٤٣) ئیجازەی خەتی لەلایەن ئەوەوە پێ بەخشرا، هەروەها مامۆستا هاشم لەساڵی (١٩٤٤) بڕوانامەی (دبلۆم)ی بەپلەی باڵا (إمتیان) لە (معهد تحسین الخطوط) لەقاهیرە وەرگرت، هەروەها لەتورکیا لەلای خۆشنووسی بەناوبانگی عوسمانی (حامید ئامێدی) کەکوردێکی خەڵکی دیاربەکرە، لەساڵی (١٩٥٠-١٩٥٢) دوو ئیجازەی لەویش وەرگرت.

مامۆستا هاشم لەماوەی ژیانیدا توانی (2435) دەستنووس و تابلۆی ئەسڵی و جۆراوجۆر کۆبکاتەوە، تەنانەت لەساڵی (١٩٦٣) خۆی چوو بۆ قودس بۆنەوەی تابلۆکانی خۆشنووس (شەفیق بەگ) لەسەر گومەزی (مسجد الاقصی) ببینێ و وێنەیان بگرێ، لەکارە گرنگەکانی ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان بوو لەوانە: (مزگەوتی حەیدەرخانە، شێخ عەبدولقادری گەیلانی، محمود البنیه)، لەکوردستانیش (مزگەوتی عبدالله لوتفی و سەردەرگای مزگەوتی خانەقا) لەسلێمانی.

[١] - نزار قەبانی، شاعیرێکی بەناوبانگی عەرەبەو ساڵی (١٩٢٣) لەدیمەشق لەدایکبووە، ساڵی (١٩٤٤) کۆلیژی ماف (حقوق)ی لەدیمەشق تەواوکردووە، پاشان کاری دبلۆماسی لە(قاهیرەو ئەنقەرەو لەندەن و مەدریدو پەکین) کردووە، لەساڵی (١٩٦٦) وازی لەکاری دبلۆماسی هێناوەو خانەیەکی بڵاوکردنەوەی دامەزراندووەو خۆی تەرخانکردووە بۆ بواری شیعر، وەتوانی (٤١) کۆمەڵە شیعر بڵاوبکاتەوە، کەیەکەمیان (قالت لي سامراء) بوو لە(١٩٤٤)، ساڵی (١٩٦٧) شعرەکانی قەبانی گۆڕانی بەسەردا هات لەشیعری خۆشەویستیەوە بۆ شیعری سیاسی و بەرەنگاربوونەوەو (هوامش علی دفتر النکسة)ی بڵاوکردەوە، لەگرنگترین بەرهەمەکانی: (قصتي مع الشعر)، (طفولة نهد)، (ثلاثية أطفال الحجارة)، (يوميات إمرأة لامبالية).

# مانگی ئایار ( مایو )

## * ٥/١

- ١٨٨٦ ڕۆژی کرێکارانی جیهان[1].
- ١٩٥١ خۆماڵیکردنی پاڵێوگەکانی نەوتی عێراق.
- ١٩٥٩ دەرچوونی ڕۆژنامەی (ئازادی) لە کەرکووک و بەغداد.
- ١٩٩٤ شەڕی ناوخۆ لەنێوان (یەکێتی و پارتی)دا هەڵگیرسا.
- ٢٠٠٦ کۆچی دوایی هونەرمەند (ئازاد خانەقینی) لەسلێمانی.

## * ٥/٢

- ١٥١٩ کۆچی دوایی شێوەکاری جیهانی (لیوناردۆ داڤنشی)[2].

---

[1] – لە ١ی ئایاری (١٨٨٤) خۆپیشاندانێکی کرێکاری لەشاری (شیکاگۆ) ڕوویداو، تیایدا داوای (٨) سەعات کاریان دەکرد لەڕۆژێکدا، لەم خۆپیشاندانەدا چەندین کرێکار گیانیان لەدەستداو پاشانیش ئەم یادە کرا بەڕۆژی پشتگیری کرێکاران، لەسەرەتای ساڵی (١٨٨٦)دا (فیدراڵیەتی ئەمریکا بۆ کار A.F.I.)، ڕۆژی یەکی ئایاری کردە ڕۆژێکی جیهانی بۆ داواکردنی دیاریکردنی کاتی کارکردنی ڕۆژانە بۆ (٨) سەعات، لەیەکی ئایاری (١٨٩١) لەخۆپیشاندانێکی کرێکاری لەفەرەنسادا چەندین کرێکار گیانیان لەدەستدا، لەساڵی ١٩١٩دا بڕیاردرا کاتی کارکردنی ڕۆژانەی کرێکاران بە (٨) سەعات دیاری بکرێت، پاشان لەساڵانی (١٩٤٧–١٩٤٨) لەفەرەنسا بڕیاردرا ڕۆژی یەکی ئایاری هەموو ساڵێك بکرێتە ڕۆژی پشودانی فەرمی.

[2] – لیۆناردۆ داڤنشی لەساڵی (١٤٥٢) لە (فلۆرەنسا) لەدایکبووە، ساڵی (١٤٧٢)دا دەبێتە ئەندام لە سەندیکای وێنەکێشان لەفلۆرەنسا، لەساڵی (١٤٨٢) زمانی لاتینی دەخوێنێت و حاکمی میلانۆ بانگهێشتی دەکات بۆ میلانۆو حەڤدە ساڵ لەوێ دەمێنێتەوەو دەبێتە

– ١٩٤١ شۆڕشی ڕەشید عالی گەیلانی لەعێراق.

– ١٩٥٦ دامەزراندنی ئێستگەی تەلەفزیۆنی لەبەغدا.

– ١٩٦٧ کۆچی دوایی (عاجز)ی شاعیر.

– ١٩٩٩ ڕێگـرتن لـە (مـەڕوە قاواقـچی) ئەنـدامی پەرلـەمانی تورکیـا لەچوونەژوورەوەی بۆ ناو هۆڵی پەرلەمان لەبەر سەرپۆشی سەری.

## * ٥/٣

– ڕۆژی جیهانی ئازادی ڕۆژنامەگەری.

– ڕۆژی خۆر.

– ١٤٨١ کۆچی دوایی سوڵتانی عوسمانی (محەمەد فاتیح)[١].

---

وێنـەکێش و ئەنـدازیاری کۆشـك، لیۆنـاردۆ لەسـاڵی (١٥٠٤) تـابلۆی (مۆنـالیزا)ی کێـشاوە کەبووە جێگەی توێژینەوە لای هونەر دۆستان و زاناو توێژەرە هونەرییەکانی جیهـان، جێـی ئاماژەیـە داڤنـشی جگـە لەوێنەکێـشان، سـەرقاڵی نووسـین و توێژینـەوە بـوو لـەبوارەکانی (بیناسـازی و میکانیـك و توێکـاری مـرۆڤ و ئـاژەڵ)، ژمـارەی تابلۆکـانی لیۆنـاردۆ کـەمن و لەحەڤدە تابلۆ تێناپەڕێت.

[١] – سوڵتان (محەمـەد فـاتیح) نازنـاوی (فـاتح)ی هـەڵگرتووە، ئـەویش بـەهۆی ڕزگـارکردنی شـاری قوسـتەنتیە (ئەسـتەنبوڵ)ی ئێـستا، سـوڵتان هـەر لەمنداڵیـەوە بـەهۆی ڕێنمـایی مامۆستاکەیەوە حەزی بەئەنجامدانی ئەو کارە دەکرد، بۆیە پلانێکی سەربازی زۆر سـەیری بەکارهێنا، ئەویش بەوەی کەشـتیە سـەربازیەکانی لەسـەر تایـەو پێـچکەی تایبـەت ڕاکێـشا بەناو شـاخ و دۆڵداو لەلایەکـەوە هێرشـی کـرد بـۆ سـەر قـەڵاکانی قوسـتەنتینیە کەهـەرگیز حسابیان بۆ نەکردبوو وەسەرەنجام فـەتحی کـرد، سـوڵتان بەهـەمان شـێوە لـەماوەی (٣٠) ساڵی حوکمەکەیدا وڵاتی (سرب و یۆنان و بۆسـنە)شـی فـەتح کـرد، ئیاڵیـەکان لەپلانگێڕیـدا بـوون بۆئـەوەی سـوڵتان محەمـەد فـاتیح شـەهید بکـەن، ئـەویش دوای ئـەوەی کەسـوڵتان بەنیازبوو دوای (قوستەنتینیە) فەتحی (ڕۆما)ش بکات، بۆیە لەڕێگەی پزیشکێکی ئیتاڵیـەوە کەبەڕواڵـەت بووبـووە موسـڵمان و خـۆی نـاو نـابوو (یـەعقوب)و لەئەسـتەنبوڵ ناوبـانگی

- ١٩٣٨ لەدایکبوونی زانای میسری (د. عومەر عەبدولڕەحمان).

- ١٩٤٣ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (ڕۆژا نوێ) بەپیتی لاتینی لەلایەن (کامەران بەدرخان)ەوە.

- ١٩٨٢ ڕوودانی خۆپیشاندانی قوتابیانی زانکۆی سەلاحەدین.

- ١٩٨٨ هێرشی بەناو ئەنفالی (٣) بۆ (چەمچەماڵ و دوکان).

- ١٩٩٧ دامەزراندنی (یەکێتی ئافرەتانی ئاشووری).

- ١٩٩٩ کۆچی دوایی (د. عوسمان محەمەد مستەفا) سەرۆکی بەشی فیزیا لەزانکۆی سەلاحەدین.

## * ٥/٤

- ڕۆژی هاتووچۆی جیهانی.

- ١٩٩٠ سەربەخۆیی وڵاتی لاتیڤیا[1].

---

دەرکردبوو، سولتانی دەرمانخوارد دەکرد بەوەی کە کەم کەم ژەهری دەکردە خواردنەکەیەوە، پاشان کەزانیان سولتان بەنیازە هێرش بکاتە سەر ئیتالیا، داوایان لەپزیشکەکە کرد کەژەهرەکە زیاد بکات، وە لەئەنجامدا سولتان لەماوەیەکی کەمدا شەهید بوو، پاشان لەڕێی سەفارەتی ئیتالیاوە لەئەستەنبولّ هەواڵەکە گەیشتە ئیتالیا، کەلەنامەیەکدا نووسیبووی: (هەڵۆی گەورە مرد)، پاشان لەهەموو ئەورووپادا بەفەرمانی پاپا کەنیسەکان سێ ڕۆژ زەنگی شادیان لێدا.

[1] - (کۆماری لاتڤیا)، پایتەختەکەی (ڕیگا)یەو ڕووبەرەکەی (٦٤,٥٨٥ کم٢)یەو لەم ڕووەوە (١٢٠)ەمین وڵاتی جیهانە، ژمارەی دانیشتوانەکەشی (٢,٤٧٢,٠٠٠) کەسەو لەم ڕووەوە (١٢٤)ەمین وڵاتی جیهانە، سیستمی فەرمانڕەوایی کۆماری فرەحیزبییە لەگەڵ یەك ئەنجومەنی یاسادانان، لاتڤیایی (٥٧,٨٪)ی ڕەگەزی ئەو وڵاتەیە لەگەڵ (٣١٪)ی ڕوسی و چەند کەمینەیەکی تر، پرۆتستا لوتری (٦٥٪)ی ئایینی خەڵکی وڵاتەو لەگەڵ کەمینەی ئەرسۆزۆکسی ڕوسیەو کاسۆلیك، زمانی فەرمی دەوڵەت (لاتڤیایی)یەو دراوی وڵات (لاتس)ە.

## * ٥/٥

- ١٨١٨ لەدایکبوونی کارل مارکس.
- ١٨٢١ کۆچی دوایی (ناپلیۆن پۆناپارت)[١].
- ١٩٢١ کۆچی دوایی (برزگرین) داهێنەری کامێرای سینەمایی.
- ١٩٨٩ کۆچی دوایی (عەدنان خەیروڵڵا).
- ٢٠٠٠ (ئەحمەد نەجدەت سیزەر) بوو بەسەرۆك کۆماری تورکیا.

## * ٥/٦

- ١٨٦١ لەدایکبوونی فەیلەسووفی هیند (تاگور).

---

[١] – (ناپلیۆن پۆناپارت)، ناسراو بە ناپلیۆنی یەکەم، ساڵی (١٧٦٩) لەشاری (ئەجاکیسۆ)ی سەر بە گۆرسیکا لەدایکبووە، لەساڵی (١٧٨٥)و لەتەمەنی (١٦) ساڵیدا کۆلێژی تەواو کردووەو بووە بەئەفسەری سوپای فەرەنسی، ساڵی (١٧٩٣) پلەی (ژەنەڕاڵ)ی وەرگرت، ساڵی (١٧٩٦) بوو بەسوپا سالاری لەشکری فەرەنسا لەئیتاڵیا، ساڵی (١٧٩٨) میسری داگیرکردو ساڵێك دواتر میسری بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ فەرەنساو ڕژێمی کونسولانی پێکهێناو خۆی بووە کونسولی یەکەم، ساڵی (١٨٠٤) لەبەر هەلومەرجی شۆڕشگێڕیەکانی ناونرا بە (ئیمپراتۆری فەرەنسا).

ناپلیۆن ساڵی (١٨٠٨) فەرەنسای گیرۆدەی جەنگێکی دوورودرێژ کرد لە (ئیبریا)، لاساری گەورەتری ئەوەبوو هێرشی کردە سەر ڕووسیا لەساڵی (١٨٠٧)، ساڵی (١٨١٤) بەهۆی یەکگرتنی زۆربەی دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەورووپاو ڕوسیا، ناپلیۆن و ئیمپراتۆریەتەکەی ڕوویان لەداڕمان کرد، ناپلیۆن لەهەمان ساڵدا دوورخرایەوە بۆ دوورگەی (ئەلبا) لەکەنارەکانی ئیتاڵیا، لەساڵی (١٨١٥) هەڵهات و گەڕایەوە بۆ فەرەنساو بەڕێزەوە پێشوازی لێکرا، وە بۆماوەی (سەد) ڕۆژ دەسەڵاتی گرتەوە دەست، بەڵام جارێکی تر لەلایەن دەوڵەتانی ئەورووپاوە لەدەسەڵات دوورخرایەوەو دەست بەسەرکرا لەدوورگەی (سانت هێلانە) لەباشووری ئۆقیانووسی ئەتڵەسی، هەر لەوێ لەساڵی (١٨٢٤) کۆچی دوایی کرد.

- ١٩٣٢ كۆچی دوایی نوسەرو ڕۆژنامەنووسی کورد (حسێن نازم)[1].
- ١٩٦٧ دەرچوونی ژمارە یەکی ڕۆژنامەی (برایەتی) لەبەغدا.
- ١٩٨٨ شالاوی ئەنفالی شارۆچکەی (تەق تەق) دەستی پێکرد.
- ٢٠٠٣ (پۆل بریمەر) بوو بەفەرمانڕەوای مەدەنی ئەمریکا لەعیراق.

*** ٥/٧**

- ١٩٦٥ کۆچی دوایی (قانیع)ی شاعیر[2].
- ١٩٨٧ کۆچی دوایی چیرۆکنووس (محەمەد مەولود مەم).

---

[1] – (حسێن نازم)، ساڵی (١٨٧١) لەدایکبووە، وەك بەڕێوەبەری ناحیەو قایمقام کاری کردووە، سەرباری کوردی، زمانی فارسی و تورکی بەباشی زانیوە، لەکاتی بزووتنەوەکەی شێخ مەحموددا ڕاوێژکاری شێخ بووە، لەساڵی (١٩٢٤) بووە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال) ئۆرگانی حکومەتەکەی شێخ مەحمود، سەرپەرشتی ڕۆژنامەی (ژیان)ی کردووە کەشارەوانی سلێمانی دەری دەکرد، تا ساڵی (١٩٣٢) کەکۆچی دوایی کردووە.

[2] – شاعیری کورد (قانع)، ناوی محەمەدی کوڕی شێخ قادری شێخ سەعیدی دۆلاشە، لە ١٨٩٨/٩/١٥ لەگوندی (ڕیشێن)ی شارەزوور لەدایکبووە، پاش (٤٠) ڕۆژ باوکی کۆچی دوایی دەکات و تازە پێ ڕەوکە دەبێت دایکیشی کۆچی دوایی دەکات، پاش ئەوە (ئاغا سەید حسێنی چۆڕی) دەیباتە لای خۆی نازی دەکێشێت و دەینێرێت بۆ حوجرە، لێرەوە سەرەتای خوێندەواری و فەقێیەتی قانع دەست پێدەکات، وەك خۆی دەڵێت:

هەزار ڕەحمەت لەئارامگاهی بەرزی سەیدی (چۆڕ)ی
کەمنداڵ بووم بەلوتفی خۆی مەساری ژینمی گۆڕی.

قانع لەسەرەتای تەمەنی لاویدا تووشی نەخۆشی تەنگەنەفەسی دەبێت و تادێت لێی زیاد دەکات، هەر بەو نەخۆشیە لە ١٩٦٥/٥/٧ کۆچی دوایی دەکات و لەگۆرستانی (شێخ عەبدولڕەحمان) کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای گوندی (لەنگەدێ)ی ناوچەی شلێر بەخاك دەسپێررێت.

- ١٩٨٨ دامەزراندنی (بەرەی کوردستانی) لەلایەن (ی.ن.ك) و (پ.د.ك) و (ح.ش.ع) و (پ. گەلی دیموکراتی کوردستان) و (حزبی سۆسیالیستی کوردستان).
- ١٩٩٥ (جاك شیراك) بوو بەسەرۆکی فەرەنسا.
- ٢٠٠٧ (نیکۆلا سارکۆزی) بەسەرۆکی فەرەنسا هەڵبژێردرا، لە (٥/١٦) سوێندی یاسایی خوارد.
- ٢٠٠٨ (دیمتری میدڤیدیڤ) بوو بەسەرۆکی ڕوسیا.

## * ٥/٨

- ڕۆژی جیهانی نەخۆشی (تالاسیمیا)[١].
- ١٩٥٤ دامەزراندنی (یەکێتی تۆپی پێی ئاسیا).
- ١٩٨٨ هێرشی ئەنفالی چوار بۆ ناوچەکانی (کۆیەو کەرکووك).

## * ٥/٩

- ١٩٤٥ کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی.
- ١٩٨٧ ڕاپەڕینی جەماوەریێ شاری ڕەواندز دژ بە ڕژێمی بەعس.

---

[١] - تالاسیمیا (Thalassemia)، نەخۆشییەکی کەم خوێنییە بریتییە لەکەموکوڕی لەبەرهەمهێنانی (هیمۆگلۆبین)، لەچەشنە ناتەواوییەکی بۆ ماوەیی لەباوانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ نەوەکان، نیشانەکانی: کەم خوێنییەکی سەخت و توونـد، لەگەڵ زەرد هەڵگەڕان و لاوازبوون، ماسولکەکان شل و خاو دەبن و نەخۆشەکە تووشی زەردوویی و زەرد هەڵگەڕانی پێست دەبێت، بەهۆی هەڵئاوسانی جگەرو سپڵ لەمنداڵدا نەخۆشەکە تووشی باژەڵە دەبێت و لەئەنجامی شێوانی مۆخی ئێسك، دەموچاوی منداڵەکە شێوەی منداڵێکی مەنگۆلی درێژبووەوە وەردەگرێت.

- ١٩٩١ کۆچی دوایی ڕۆماننووسی کورد (ڕەحیمی قازی)[١].

- ٢٠٠٧ تەقینەوەیەکی گەورە لەبەردەم (وەزارەتی ناوخۆ) لەهەولێر ڕوویدا.

## * ٥/١٠

- ڕۆژی لەدایکبوون.
- ١٩٤٦ کۆچی دوایی مەلا کاکە حەمەی سیف الله.
- ١٩٦١ دامەزراندنی ڕادیۆی دەنگی کۆماری مەهاباد لەشاری مەهاباد.
- ١٩٧١ دەرچوونی ڕۆژنامەی (دەنگی فەلاح).

## * ٥/١١

- ١٩٩٨ کۆچی دوایی شاعیر (مەلا مەسعود بیٚ بەش).

## ٥/١٢*

- ڕۆژی پەرستیارانی جیهان.
- ١٩٤٦ بلاوبوونەوەی ڕۆژنامەی (هاواری کوردستان) لە مەهاباد.
- ١٩٧٢ کۆچی دوایی سیاسەتمەداری کورد (شێخ لەتیفی حەفید).
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی (ئیسماعیل حەقی شاوەیس).

---

[١] - د. ڕەحیمی قازی، ئامۆزای (پێشەوا قازی محەممەد)ە، یەکەم نووسەرو ڕووناکبیری کوردە کەنامەی دکتۆراکەی بۆ باسی مێژووی کورد تەرخان کردووە، لە (باکۆ)ی پایتەختی ئازەربایجانی شۆرەوەی پێشکەشی زانکۆی (کیرۆف)ی کردووە، جگە لەوە گەلێ کتێب و وتاری بەنرخی لەبارەی مێژووی سیاسی کوردەوە نووسیوە، هەروەها ڕۆمانی (پێشمەرگە)ی لەسالی (١٩٦١) بلاوکردەوە، کە بەیەکەم ڕۆمانی مێژوویی کوردی دادەنرێت، کەخەباتی سەخت و ڕۆلی چەوساوەکانی کورد پیشان دەدات، لەمانگی ئایاری (١٩٩١) کۆچی دوایی کردووە.

## – ١٩٩٩ کۆچی دوایی زانای پایەبەرز (م. مەلا عوسمان عەبدولعەزیز)

---

[1] – مامۆستا مەلا عوسمان کوڕی مامۆستا مەلا عەبدولعەزیز، ساڵی (١٩٢٢) لەگوندی (پڕێسی سەروو)ی ناوچەی ئەوڕۆڵی نزیک شاری هەڵەبجە لەدایک بووە، بەمنداڵی لای باوکی دەستی کردووە بەخوێندن و لەسەر دەستی مامۆستا مەلا ساڵحی گەورە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ساڵی (١٩٥٤) لەگەڵ مامۆستا مەلا صالحی گەورە یەکەم ئەڵقەی کۆمەڵەی برایانی موسڵمان لەهەڵەبجە دروست دەکەن، لەساڵی (١٩٥٩) بەبڕیاری حکومەتی عەبدولکەریم قاسم لەگەڵ مامۆستا مەلا صالحی گەورەو مامۆستا مەلا عومەری برای کۆمەڵێک سەرۆک عەشیرەتی ناوچەکە بۆماوەی نۆ مانگ لە(ناسریە) دەست بەسەر دەکرێن ساڵی (١٩٧٤) سەردانی سعودیەی کردووەو چاوی بەمەلیک فەیسەڵی پادشای سعودیە کەوتووە، ساڵی (١٩٧٧) بۆماوەی دە مانگ زیندانی دەکرێت، ساڵی (١٩٨٧) بەشداری ڕاپەڕینی جەماوەری هەڵەبجەو شارەزوور دەکات دژ بەڕژێمی بەعس، پاشان ئاوارەی ئێران دەبێت و هەر لەوساڵەدا لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەزانایان و خەڵکی کوردستان (بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان) دادەمەزرێنن و خۆیشی دەبێت بەڕابەری گشتی بزووتنەوەکە، ساڵی (١٩٩١) بەشداری ڕاپەڕینە جەماوەریەکەی خەڵکی کوردستانی کردووە کە لەبەهاری ئەو ساڵەدا دژ بەدامودەزگاکانی ڕژێمی بەعس لەکوردستاندا بەرپاکرا، لەهەڵبژاردنی ساڵی (١٩٩٢) لەگەڵ بەڕێزان (مەسعود بارزانی)و (جەلال تاڵەبانی)و (د.مەحمود عوسمان)دا بە پاڵێوراوانی ڕابەری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد دیاری دەکرێت، مامۆستا مەلا عوسمان بەشداری چەندین کۆڕو سیمیناری هەرێمی و نێودەوڵەتی کردووەو ڕۆڵێکی لەبەرچاوی هەبووە لەناساندنی کێشەی گەلی کورد بەوڵاتانی ئیسلامی و گەلانی دنیا، ڕۆژی ١٢/٥/١٩٩٩ لەشاری دیمەشقی پایتەختی سوریا کۆچی دوایی دەکات و لەڕێوڕەسمێکی جەماوەری فراواندا تەرمەکەی دەهێنرێتەوە کوردستان و لەگۆڕستانی (گوڵان) لەهەڵەبجەی شەهید بەخاک دەسپێردرێت، لەبەرهەمەکانی مامۆستا مەلا عوسمان:

– تەفسیری قورئانی پیرۆز لە (١٥) بەرگدا.

– کتێبی (الاسئلة والاجوبة في اصول الفقه).

– وەرگێڕانی بەشێکی زۆر لەفەرموودەکانی (صحیح البخاري).

– علوم القران.

## * ٥/١٣

١٩٣٦ كۆچی دوایی زانای هەڵكەوتوو (شێخ عومەری قەرەداغی)[١].

١٩٨٧ ڕاپەڕینی هەڵەبجەو شارەزوور دژی ڕاگواستنی گوندەكانی شارەزوور.

- ١٩٩٥ كۆچی دوایی (م. احمد محمد ملط) جێگری ڕابەری گشتی كۆمەڵی برایانی موسڵمان.

---

[١] - (ئیبن قەرەداغی) یان شێخ عومەری خانەقا، ناوی شێخ عومەر شێخ محەمەد ئەمین شێخ مەعروفی غەفاری مەردۆخیە، ساڵی (١٨٨٦) لەسلێمانی لەدایكبووەو لای مامۆستا مەلا حسێنی پیسكەندی و مامۆستا شێخ نەجیبی قەرەداغی خوێندویەتی، تامەزرۆیی مامۆستا بۆ زانست بەڕادەیەك بووە كەسەرەڕای ئەوەی بەچاكی لەزانستەكان ئەو سەردەمەدا شارەزابووە، لای زانای جەبرزان (عیرفان ئەفەندی)یش حساب و ئەندازەو جەبرو فەلەك و میقات و ئورستولابی خوێندووە، ئیجازەی عیلمی لای مامۆستا شێخ نەجیبی قەرەداغی وەرگرتووە، ئیبن قەرەداغی لەگەڵ وانەوتنەوەدا قەڵەمەكەی بەبڕشت بووەو بەرهەمی زۆری لەشێوەی مەتن و شەرح و حاشیەكاندا پێشكەش كردووە، ساڵی (١٩٢٣) پاش نۆژەنكردنەوەی مزگەوتی خانەقای مەولانا لەو مزگەوتە نیشتەجێ بووەو زیاتر سەرقاڵی فتوادان و وانەبێژی و كاروباری موسڵمانان بووە، لەهەمان كاتدا ناوبانگی بەجیهانی ئیسلامیدا بڵاوبۆتەوە، هەربۆیە زاناو موفەسیری گەورەی میسری (محەمەد ڕەشید ڕەزا) لەساڵی (١٩٣٠)دا كۆپیەكی كتێبی (الوحي المحمدي)یەكەی خۆی بۆ دەنێرێ تا هەڵیبسەنگێنێت، ئەویش پەسەندنامەیەكی جوانی بۆ دەنوسێ، كە لەوكتێبەدا لەژێرناونیشانی (كتاب علامة الاكراد الشيخ عمر القرداغي المدرس بكردستان العراق في بلدة السليمانية) لە لاپەڕە (٣٥٥) چاپی سێیەمی ئەم كتێبەدا بڵاوكراوەتەوە، ئیبن قەرەداغی نووسراوەكانی لە مەتن و شەرح و حاشیەكان زیاد لە (٢٠) نووسراو دەبێت، لە ١٩٣٦/٥/١٣ لەشاری بەغداد كۆچی دوایی كردووەو لەگۆڕستانی (گردی سەیوان) لەسلێمانی بەخاك سپێردراوە.

– ٢٠٠٨كۆچـی دوایـی (سـەعد عەبـدوڵلا ئەلـصوباح) ئـەمیری پێـشوو (کوێت).

# * ٥/١٤

– ١٨١١ سەربەخۆیی پاراگوای لەئیسپانیا.

– ١٩٩٩ کۆچی دوایی زانای ناودار (شێخ عەبدولعەزیز بن باز).

# * ٥/١٥

– ڕۆژی جیهانی خێزان.

– ١٩٣٢ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هاوار) لەشام.[١]

– ١٩٤٨ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل.

– ١٩٥٤ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هەتاو) لە هەولێر.

– ١٩٦٢ دامەزراندنی (یەکێتی مامۆستایانی کوردستان).

# * ٥/١٦

– ڕۆژی گۆڕی بەکۆمەڵ لەعیراق.

– ١٤٠٦ کۆچی دوایی زانای بەناوبانگ (ئیبن خەلدون).

---

[١] – (میر جەلادەت بەدرخان) کەسەرۆکی (کۆمەڵەی خۆیبوون) بوو، بووە خاوەن ئیمتیا[illegible] دەرکردنی گۆڤاری (هاوار)ی وەرگرت و یەکەم ژمارەی لـەڕۆژی ١٩٣٢/١/١٥ دەرکـرد، هـا[illegible] لەسـاڵی یەکەمیـدا (٢٠) ژمـارەی لێ دەرچـووەو ئـەم ژمارانـەو لەگـەڵ سـێ ژمـارەی سـا[illegible] دووەمیدا بەپیتی هیجائی و لاتینی چاپ کراون، لەژمارە (٢٤)وە هەمووی تەنها لاتینیە. هاوار تا ئەوکاتە بەتەمەنترین گۆڤاری کوردی بوو کە یانزە ساڵ ژیاو تـا ١٩٤٣/٨/١٥ (٧ ژمارەی لێ دەرچووە.

- ١٩١٦ ڕێکەوتننامەی (سایکس بیکۆ) لەنێوان (بەریتانیاو فەڕەنساو ڕووسیا)دا ئیمزاکرا[1].
- ١٩٢٣ داگیرکردنەوەی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە.
- ١٩٩٣ پانزە هەزار موسڵمان لە(واشنتۆن)ی پایتەختی ئەمریکا خۆپیشاندانێکیان سازکرد بۆ پشتگیری لەموسڵمانانی بۆسنەوهەرسك.
- ١٩٩٦ کۆچی دوایی (د. فازڵ قەفتان) لەئەڵمانیا.

## * ٥/١٧

- ١٩٧١ کۆچی دوایی زانای کورد (شێخ مستەفای قەرەداغی)[2].
- ١٩٩١ کۆچی دوایی نووسەر (فاتیحی مەلا کەریمی مودەڕیس).
- ١٩٨٧ (ڕاپەڕینی ڕەواندز) وەك درێژەدانێك بەڕاپەڕینەکەی هەڵەبجە.
- ١٩٩٤ کۆچی دوایی (حەسەن کوێستانی) ئەندامی سەرکردایەتی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان).

---

[1] – ڕێکەوتننامەی سایکس بیکۆ لەبنەڕەتدا ڕێکەوتننامەیەکی نهێنی بوو لەساڵی (١٩١٦) لەنێوان (بەریتانیاو فەڕەنساو ڕوسیا)دا مۆرکرا، بۆئەوەی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەنێوان خۆیاندا دابەش بکەن، بەپێی ڕێکەوتننامەکە زۆربەی خاکی ئێستای کوردستانی عێراق و سوریا بۆ فەڕەنساو کوردستانی ئێستای تورکیاش بۆ ڕوسیا، دوای ئەوەی ڕوسیا لەپەیمانەکە کشایەوە بەریتانیا بەشەکەی فەڕەنسای لەویلایەتی موسڵ داگیرکرد، بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیە وڵاتانی ئیمپریالیزم توانیان یاری بەچارەنووسی کورد بکەن و بیخەنە ژێر دەستی خۆیان، دوای شۆڕشی بەلشەفی ڕوسیا لەڕێکەوتنەکە کشایەوەو حکومەتە تازەکەی سۆڤیەت ڕێکەوتننامەکەی بەهەموو جیهان ڕاگەیاند.

[2] – شێخ مستەفای شێخ نەجیبی قەرەداغی، زاناو شاعیرو نیشتمانپەروەرێکی کوردە، ساڵی (١٨٩١) لەشارۆچکەی قەرەداغ لەدایکبووە، لەساڵی (١٩١٢)ەوە خەریکی وانە وتنەوە بووەو چەندین زاناو مەلا لای ئەو خوێندویانەو ئیجازەی زانستی شەرعیان وەرگرتووە.

- ١٧_١٩٩٧/٥/١٩ پاش زنجیرەیەك سەركەوتن هێزەكانی (لۆران كابێلا) كۆتاییان بەدەسەڵاتی (٣٢) ساڵی (مۆبۆتۆسیسیكۆ)ی سەرۆكی زائیر هێناو كابێلا بوو بەسەرۆكی ئەو وڵاتەو ناوی وڵاتەكەی گۆڕیەوە بۆ ناوە كۆنەكەی (كۆماری كۆنگۆی دیموكراتی).

- ٢٠٠٤ تیرۆركردنی (عیزەدین سەلیم) سەرۆكی دەوری (ئەنجومەنی حوكم) لەشاری بەغداد.

- ٢٠٠٨ (نێچیرڤان بارزانی) سەرۆكی حكومەتی هەرێم لەلایەن كۆلێژی (واشنتۆن ئاند جیفرسۆن) لەئەمریكا دكتۆرای فەخری پێبەخشرا.

## * ٥/١٨

- ڕۆژی جیهانی مۆزەخانە.

- ١٤٥٣ كۆچی دوایی‌خۆشنووسی بەناوبانگی كورد (حامید ئامەدی)[1].

## * ٥/١٩

- ٩٠٣ كۆچی دوایی پێشەوا (ئەحمەدی كوڕی حەنبەل).

- ١٨٩٠ لەدایكبوونی (هۆشی منە) پێشەوای گەلی ڤێتنام[2].

---

[1] - حامید ئامەدی، ناوی (موسا عەزمی)یەو لە ١٨٩١/٢/١٦ لەشاری ئامەدی كوردستانی توركیا لەدایكبووە، باوكی كە بە (ئادەم ئامەدی)ناسراوە دەستێكی باڵای هەبووە لەهونەری خۆشنووسیدا، سەرەتا لای لەحوجرە خوێندویەتی و مامۆستای مزگەوتەكەی (سەعید ئەفەندی) زۆر هانیداوە بۆ خۆشنووسی، تابلۆكانی حامید لەزۆربەی وڵاتە ئەوروپی و عەرەبیەكاندا نمایش كراون، زۆربەی خۆشنووسە بەناوبانگەكانی جیهانی ئیسلامی خۆیان بەقوتابی (ئامەدی) دەزانن، لەوانە: (هاشم بەغدادی، یوسف ذنون، علی الراوی).

[2] - (هۆشی منە) پێشەوای سیاسی ڤێتنام و دامەزرێنەری (پارتی كۆمۆنیستی چین)و سەرۆك كۆماری ڤێتنامی باكوور بووە، ساڵی (١٨٩٠) لەناوچەی (نام دان)ی ناوەڕاستی ڤێتنام لەدایكیووە، لەكاتی جەنگی جیهانی یەكەمدا لە (پاریس) جێگیر بووەو نووسینەكانی

**١٩٨٩ (شێخ ئەحمەد یاسین) لەلایەن زایۆنیەکانەوە دەسگیرکراو بۆ ماوەی نۆ ساڵ زیندانی کرا.**

**١٩٩٢ یەکەم هەڵبژاردنی (پەرلەمانی) لەهەرێمی کوردستانی عێراق.**

**٢٠٠٢ کردنەوەی (تەلەفزیۆنی پەروەردەیی) لەسلێمانی.**

**٢٠٠٢ سەربەخۆیی (تەیموری خۆرهەلات) لە ئەندەنوسیا.**

## * ٢٠/٥

**١٩٠٢ ڕۆژی سەربەخۆیی (کوبا) لەئەمریکا.**

**١٩١٩ ڕاپەڕینی گەلی کورد دژی ئینگلیز بەڕابەرایەتی شێخ مەحمود.**

**١٩٩٦ ڕازیبوونی حکومەتی عێراق بەجێبەجێکردنی بڕیاری (٩٨٦).**

**٢٠٠٦ ڕاگەیاندنی کابینەی نوێی حکومەتی عێراقی بەسەرۆکایەتی (نوری مالکی).**

---

(کارل مارکس)ی خوێندۆتەوە، پشتگیری شۆڕشی ئۆکتۆبەری (١٩١٧)ی ڕووسیای کردووە، لە (١٩٢٠)دا چۆتە ناو (پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسا)وە، لەساڵی (١٩٢٣) ڕوویکردە مۆسکۆو دوو ساڵ لەوێ مایەوە، دوای کودەتای (١٩٢٧)ی (جان کای) دژی کۆمۆنیستەکان لەچین ڕووەو (هۆنگ کۆنگ) هەڵات و، لەوێ لە (١٩٣٠) (پارتی کۆمۆنیستی هندی چینی) دامەزراندو سەرکردایەتی بەرەی ڤێتنامیەکانی گرتە دەست، لە (١٩٤٥) ئیمپراتۆری ڤێتنامی (باوداوی) لابردو سەربەخۆیی ڤێتنامی ڕاگەیاند، بەڵام دوای گەڕانەوەی فەرەنسیەکان بۆ هندی چینی (هۆشی منە) دەستی دایە بەربەرەکانی دژی دەسەڵاتی فەرەنسا تا لە (١٩٥٤)دا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەڕووخانی دوا قەڵای فەرەنسا (دیان بیان فۆ) ڤێتنام بوو بەدووبەشەوە، (ڤێتنامی باکوور) بەسەرۆکایەتی (هۆشی منە)و ڤێتنامی باشوور بەسەرۆکایەتی (باوداوی)، هۆشی منە لە (١٩٦٠)دا بوو بەسەرۆک کۆماری ڤێتنامی باکوور، دواجار توانی ڤێتنام بەرەو سەرکەوتنی یەکجارەکی بەرێت دژی داگیرکەری ئەمریکی، کەدەیویست جێی فەرەنسا بگرێتەوە لەهندی چینیدا، ساڵی (١٩٦٩) کۆچی دوایی کردووە.

# * ٥/٢١

- ١٨٨٩ دامەزراندنی کۆمەڵی (ئیتیحادو تەرەقی) لەتورکیا.
- ١٩٠٤ دامەزراندنی یەکێتی تۆپی پێی نێودەوڵەتی (فیفا) لەپاریس[1].
- ١٩٣٥ کۆچی دوایی (جین ئادامز) خاوەنی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی[2].
- ١٩٩٠ کۆچی دوایی شاعیری کورد (هیجران).
- ١٩٩٦ کۆچی دوایی هونەرمەند (عوسمان چێوار) لەسلێمانی.

---

[1] - لە ٢١ی ئایاری ساڵی (١٩٠٤) لەبارەگای یەکێتی فەڕەنسی بۆ یاریە وەرزشیەکان و بەئامادەبوونی یەکێتیەکانی تۆپی پێی فەڕەنساو بەلجیکاو سویسراو هۆڵەنداو ئیسپانیاو سویدو دانیمارك، (یەکێتی تۆپی پێی نێودەوڵەتی) دامەزراو بە (FIFA) ناودەبرێ کەکورتکراوەی ئەم دەستەواژەیەیە ( Federation International de Football Association)، بارەگای ڕێکخراوەکەش لەشاری (زیوریخ)ی سویسرایە، لە ٢٢ی ئایاری هەمان ساڵیشدا (ڕۆبێر جۆرانی) فەڕەنسی بەسەرۆکی یەکێتیەکە هەڵبژێردرا، یەکێتی تۆپی پێی نێودەوڵەتی گەورەترین دەزگای تۆپی پێیە لەجیهانداو سەرپەرشتی ئەم پێشبڕکێیانە دەکات: (جامی جیهانی مۆندیال، جامی جیهانی لاوان، جامی جیهانی تازەپێگەیشتوان، جامی جیهانی ئافرەتان، جامی جیهانی هۆڵەداخراوەکان، تۆپی پێ لەئۆلۆمپیادەکان، جامی کیشوەرەکان، جامی جیهانی یانەکان)، دوایین سەرۆکی فیفاش (جۆزیف سیپ بلاتەر)ی سویسریە کە لەساڵی (١٩٩٨)ەوە ئەو پۆستەی وەرگرتووەو تاکو ئێستاش بەردەوامە.

[2] - خاتوو جین ئادامز لە ١٨٦٠/٩/٦ لەویلایەتی ئیلی نوینزی ئەمریکا لەدایك بووە، پاش تەواوکردنی خوێندن لەکۆلیژی (راکفلێر) ساڵی (١٨٨١) چۆتە پەیمانگای پزیشکی ژنان لەفیلادلفیا، پاش گەشتەکەی بۆ ئەوروپا ساڵی (١٨٨٩) ڕێکخراوی (هول هاوس) لەشیکاگۆ دامەزراند، ساڵی (١٩١٥) سەرۆکایەتی کۆنگرەی جیهانی ژنانی لەشاری (هاگ) هۆڵەندا لەئەستۆ گرت، ساڵی (١٩٣١) بوو بەخاوەنی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی و (١٩٣٥) لەشیکاگۆ کۆچی دوایی کرد.

- ١٩٩٨ (سۆهارتۆ)ی سەرۆکی ئەندەنوسیا دەستی لەکارکێشایەوە.

- ١٩٩٩ کۆچی دوایی مامۆستا (حاجی خەلیل) لەهەولێر.

٢٠٠١ کۆچی دوایی (شازاد جەمیل صائیب) وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری حکومەتی هەرێمی کوردستان (ئیدارەی سلێمانی).

## * ٥/٢٢

- ١٧٩٢ کۆچی دوایی زانای ناودار (محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب).

- ١٨٨٥ کۆچی دوایی ڤیکتۆر هۆگۆ[1].

- ١٩٨٦ کۆچی دوایی مامۆستا (عومەر تەلمیسانی) ڕابەری گشتی کۆمەڵی (برایانی موسڵمان).

- ٢٠٠٣ بە بڕیاری (١٤٨٣)ی ئەنجومەنی ئاسایش گەماڕۆی ئابووری لەسەر عێراق هەڵگیرا.

## * ٥/٢٣

- ١٩٧٠ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هەولێر).

- ١٩٨٩ کۆچی دوایی شاعیری کورد (لەتیف لوتفی).

- ١٩٩٧ هەڵبژاردنی (محەمەد خاتەمی) بەسەرۆك کۆماری ئێران.

## * ٥/٢٤

- ١٩٨٤ کۆچی دوایی شاعیر (حەبیب عەلی میرانی).

---

[1] - شاعیرو ئەدیبی فەرەنسی (ڤیکتۆر هۆگۆ) لەساڵی (١٨٠٢) لەدایك بووە، لەتەمەنی (١٤) ساڵیدا قەسیدەیەکی (٣٠٠) بەیتی هۆنیوەتەوە، ساڵی (١٨٢٢) یەکەم کۆمەڵە شیعری بڵاوکردۆتەوە، ساڵی (١٨٤١) بووە بەئەندامی ئەکادیمیەی فەرەنسا، لەبەناوبانگترینی ڕۆمانەکانی: (بێ نەوایان، کلۆڵان، نۆتەردام، کرێکارەکانی دەریا)، لەبەرهەمە شیعریەکانی: (گەڵای پایز، بیرکردنەوە، تیشك و سێبەر، خۆرە لاتی، چیرۆکی قەرنەکان).

## * ٥/٢٥

- ١٩٢٦ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (زاری کرمانجی) لەڕەواندز لەلایەن حسێن حوزنی موکریانی[١].
- ١٩٦٣ دامەزراندنی ڕێکخراوی (یەکێتی ئەفریقیا).
- ٢٠٠٨ (میشال سلێمان) لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی لوبنانەوە بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا.

## * ٥/٢٦

- ١٧٩٩ لەدایکبوونی شاعیرو ئەدیبی ڕووسی (ئەلیکسەندەر پوشکین).
- ١٩١٩ ڕزگارکردنی هەڵەبجە لەئینگلیزەکان لەلایەن شێخ مەحمودەوە .
- ١٩٦٧ کۆچی دوایی فەیلەسوفی ئەڵمانی (مارتن هایدگەر).
- ١٩٩٩ دامەزراندنی (ڕێکخراوی ئازادی لاوانی کوردستان).
- ٢٠٠١ یەکەم هەڵبژاردنی شارەوانیەکان لەناوچەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان (ئیدارەی هەولێر) ئەنجامدرا.

---

[١] – زاری کرمانجی یەکەمین گۆڤاری کوردیە، بەواتایەکی تر، یەکەمین گۆڤارە لەشارێکی کورددا لەعێراق دەربچێت، یەکەمین ژمارەی لە ١٩٢٦/٥/٢٥دا دەرچووە، دوایین ژمارەی کە ژمارە (٢٤) بوو لە ١٩٣٢/٧/٣١دا دەرچووە، لەژێر ناوی گۆڤارەکەشدا نووسراوە (گۆڤارێکی ئیجتیماعی، تأریخی، فەنی، ئەدەبی، مانگانەیە)، گەلێ وتاری لەبواری جۆراوجۆری مێژوویی و کۆمەلایەتی و ئەدەبی و زانستی و تەنانەت سیاسیش بلاو دەکردەوە، هەروەها هەواڵی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی بلاوکردۆتەوە، گۆڤارەکە بایەخی زۆری بەوتاری مێژوویی دەدا، (نزار جەرجیس)یش پێی وایە (زاری کرمانجی) گۆڤاری هەڵوێستەکان بووەو داکۆکی لەهەموو شتێك دەکرد کە لەبەرژەوەندی کورددا بووبێت، وە دژی زوڵم و ستەم خەباتی کردووە، پێدەچێت هەر ئەم هەڵوێستانە گۆڤارەکەیان ڕاگرتبێت، واشی لە(حوزنی) کرا بچێت لەپەنا پەردەوە (ڕووناکی) لەهەولێر دەربکات.

## * ٥/٢٧

- ١٣٣٢ لەدایکبوونی زانای بەناوبانگ (ئیبن خەلدون).
- ١٩٦٤ کۆچی دوایی سەرۆکی هیندستان (جەواهیر لال نەهرۆ).
- ١٩٦٩ قەزای (دهۆك) بوو بەپارێزگا.
- ١٩٨٧ کیمیابارانی دۆڵی (سماقوڵی، نازەنین، خەلەکان).
- ١٩٨٨ کۆچی دوایی (ئێرنست روسکا) داهێنەری مایکرۆسکۆبی ئەلکترۆنی.
- ١٩٩٤ کۆچی دوایی (م. مستەفا سەید ئەحمەد بەرزنجی – نەریمان)[١].
- ٢٠٠٦ دامەزراندنی (کۆمەڵەی زانستە سیاسیەکانی کوردستان).

## * ٥/٢٨

- ١٩٩٥ کۆچی دوایی هونەرمەند (تەحسین تەها) لەهۆڵەندا.

---

[١] – مامۆستا مستەفا سەید ئەحمەد بەرزنجی ناسراو بە (نەریمان) لەساڵی (١٩٢٥) لەکفری لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەکەرکوك و خانەی مامۆستایانی لەبەغداد تەواو کردووە، پاشان بووەتە مامۆستا لە(سەرقەڵاو کەلارو کفری و کەرکوك و کوت و بەغداد)، ساڵی (١٩٧٩) حەجی ماڵی خوای کردووە، لەسەر داوای بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی وەزارەتی پەروەردە، لەنێوان ساڵانی (١٩٧١– ١٩٨٥) بەشداری لەدانان و وەرگێڕانی (١٧) کتێبدا کردووە، لەدانراوەکانی: (هاواری لاوان (شیعر) ١٩٥٣– عەلی ئەفەنی (شانۆگەری) ١٩٥٥– مامۆستای نەمر (ژیننامە) ١٩٧٦– توێژینەوەیەك لەپێنج بەهرەی نەجمەدین مەلا ١٩٧٩– ڕێنووسی کوردی لەڕەگ و ڕیشەوە ١٩٨١– فەرهەنگی ئەدیب و نووسەرانی کورد ١٩٨٦– شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٨٧– بیبلیۆگرافیای دووسەد ساڵەی کتێبی کوردی ١٩٨٨)، جگە لەچەندین بابەتی تر کەلەگۆڤارو ڕۆژنامەکانی سەردەمی خۆیدا بڵاوی کردونەتەوە، لە ١٩٩٤/٥/٢٧ لەشاری بەغداد کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٩٨ یەکەم سیمناری دیالۆگی (عەرەبی – کوردی) لەقاهیرەی پایتەختی میسر کۆتایی هات.

## * ٥/٢٩

- ١٤٥٣ سوڵتان (محەمەد فاتیح) شاری قوستەنتینیەی ڕزگارکرد.
- ١٥٥٥ دابەشکردنی کوردستان بەپێی ڕێکەوتننامەی (ئوماسیە)ی نێوان دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی.
- ١٨٢٩ کۆچی دوایی (هێمفری دەیڤی) داهێنەری گڵۆپی دەیڤی.

## * ٥/٣٠

- ١٩٣٨ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (نزار).
- ١٩٨٤ کۆچی دوایی (خاڵە ڕەجەب).

## * ٥/٣١

- ڕۆژی جیهانی قەدەغەکردنی جگەرەکێشان.
- ١٩١٠ سەربەخۆیی (ئەفریقیای باشور) لەبەریتانیا[1].
- ١٩٣٤ بۆمبارانی شاری سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە.

---

[1] – کۆماری ئەفریقیای باشور، پایتەختەکەی (بریتۆریا)یەو لە ٣١ی ئایاری (١٩١٠) سەربەخۆیی لەبەریتانیا وەرگرتووە، ڕووبەرەکەی (١,٢٢١,٠٣٧ کم٢)یەو لەم ڕووەوە (٢٤)ەمین وڵاتی جیهانە، وەژمارەی دانیشتوانی وڵات (٤٢,٤٤٦,٠٠٠) کەسە بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٩٧) کەلەم ڕووەوە (٢٧)ەمین وڵاتی جیهانە، سیستمی فەرمانڕەوایی کۆماری فرەحیزبیە لەگەڵ دوو ئەنجومەنی یاسادانان، ڕەش پێست زۆرینەی ڕەگەزی وڵات پێك دەهێنێت کە (٧٦,١٪)ەو دوای ئەو سپی پێست (١٢,٨٪) و پێست ڕەنگ (٨,٥٪)، ئایینی دانیشتوان (٧٨٪) مەسیحیەو (١,٨٪) هندیەو (١,٢٪) موسڵمان..، زمانی فەرمی دەوڵەت (ئەفریقی)یەو دوای ئەو ئینگلیزی، دراوی وڵاتەکەش (ڕاند)ە.

**- ٢٠٠١ ڕاگەیاندنی (کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان).**

**- ٢٠٠٤ کۆچی دوایی (دارۆی شێخ نوری شێخساڵح) ئەندامی مەکتەبی سیاسی (یەکێتی نیشتمانیی کوردستان).**

**- ٢٠٠٨ دامەزراندنی (ڕەوتی چاکسازی نیشتمانی عێراقی) بەسەرۆکایەتی (ئیبراهیم جەعفەری).**

# مانگی حوزەیران (یونیو)

## * ٦/١

- ١٩٢٦ کۆچی دوایی (شوکری فەزلی) لەبەغدا[١].
- ١٩٥٢ ڕۆژی منداڵانی جیهان.
- ١٩٧٠ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (ڕۆژی کورد).
- ١٩٧٢ خۆماڵیکردنی نەوتی عێراقی.
- ١٩٧٥ دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان).
- ١٩٨٢ کۆچی دوایی مامۆستا (عەبدوڵلا جەوهەر).
- ٢٠٠٤ یەکەم کابینەی وەزاری دوای ڕووخانی ڕژێمی (سەدام حسێن) لەعێراقدا بەسەرۆکایەتی (ئەیاد عەلاوی) ڕاگەیەنرا، هەروەها (غازی عەجیل یاوەر) بە سەرۆك کۆماری عێراق دیاریکرا.
- ٢٠٠٨ دامەزراندنی کەناڵی ئاسمانی (گەلی کوردستان)

## * ٦/٢

- ١٩٣١ کۆچی دوایی (شێخ ئەمینی خاڵ) لەسلێمانی.

---

[١] - (شوکری فەزلی)، کوڕی مەحمود ئاغای ئەحمەد ئاغایە، لەگەڕەکی (فەزل)ی بەغدا لەخێزانێکی کورد لەدایك بووە، لەحوجرەو قوتابخانە میریەکاندا خوێندویەتی، یەکێکە لەشاعیرە بەناوبانگەکانی ئەدەبی کوردی ، شیعرو نووسینی بەچوار زمانی (کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی) لەگۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو کاتەدا بڵاوکردۆتەوە، سەرنووسەری ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) بووە کە لەبەغداد دەردەچوو، لەساڵی (١٩٢١)ەوە پۆستی (سەرۆك نووسەرانی دیوانی ئەنجومەنی وەزیران)ی پێ سپێر دراوەو تاکو کۆچی دوایی لەساڵی (١٩٢٦)دا لەو پۆستەدا مایەوە، یاساکانی عێراق و دادگاکانی بەغدادی لەزمانی تورکیەوە گۆڕیوە بۆ زمانی عەرەبی.

- ١٩٤٦ ڕۆژی سەربەخۆیی (ئەڵمانیا).

- ١٩٩٧ کۆچی دوایی هونەرمەندی شانۆکار (کەمال سابیر).

- ١٩٩٨ کۆچی دوایی (مامۆستا مەلا صاڵحی شارەزووری)[1].

- ٢٠٠١ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (کۆمەڵ) زمانحاڵی (کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان).

## * ٦/٣

- ١٩٤٠ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (خورماڵ).

- ١٩٦٣ کۆچی دوایی شاعیری تورکی (نازم حیکمەت).

- ٢٠٠١ کۆچی دوایی ئەکتەری سینەمایی (ئەنتۆنی کوین)[2].

---

[1] - مامۆستا مەلا صالح ئەبوبەکر، لەساڵی (١٩٠٨) لەشارۆچکەی بیارەی سەر بەپارێزگای سلێمانی لەدایکبووە، خوێندنی زانستی شەرعی لەمەدرەسەی بیارە لای مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس)و ناوچەکانی تری کوردستان لای (م. مەلا باقی و م.سید عارف و م. مەلا محەمەدی خورماڵ) خوێندووەو ئیجازەی مەلایەتی لەخزمەتی (مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس)دا وەرگرتووەو لەزۆربەی گوندەکانی شارەزووردا مەلایەتی کردووە، ساڵی (١٩٥٠) بەیەکجاری چووەتە (سەیدصادق)و خۆی بەردی بناغەی مزگەوتی گەورەی سەیدصادقی داناوەو بووەتە پێش نوێژو وتارخوێنی ئەو مزگەوتەو بەبێ موچە نزیکەی (٢٥) ساڵ خزمەتی ناوچەکەی کردووە، مامۆستا مەلا صالح بەدرێژایی ژیانی بەرەنجی شانی خۆی ژیاوەو سەری بۆ هیچ کەس و ڕژێمێك نەوی نەکردووە.

[2] - هونەرمەند (ئەنتۆنی کوین) پاڵەوانی فیلمی (شێری بیابان) بوو کەبەسەرکەوتوویی ڕۆڵی کەسایەتی (عومەر موختار)ی بینی، هەروەها لەفیلمی (الرسالة)دا -ئینگلیزیەکەی- ڕۆڵی کەسایەتی (حەمزە) دەبینێ، وە بەهۆی ئەم دوو فیلمەوە ئەنتۆنی کوین لەناو جیهانی ئیسلامیدا ناسراوو خۆشەویست بوو، (کوین) ساڵی (١٩٣٦) لەشانۆی مەکسیکیەوە دەستی پێکردو بەهۆلیۆدا خۆی گەیاندە هەموو سینەماکانی جیهان، وە لەماوەی تەمەنیدا لە (١٠٠) فیلمی سینەمایی بەشداری کردووەو چەندین خەڵاتی هونەری بەدەستهێناوە.

## ٦/٤ *

- ١٩٥٤ هەڵبژاردەی ئەڵمانیا بەئەنجامی (٣-٢) لەهەڵبژاردەی سویسرای بردەوەو بۆ یەکەم جار جامی جیهانی بەدەستهێنا.
- ١٩٨٩ کۆچی دوایی ڕابەری شۆڕشی ئێران (ئیمام خومەینی).
- ١٩٩٢ یەکەمین کۆبوونەوەی (ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان) بەسەرۆکایەتی (جەوهەر نامیق سالم) لەهەولێر.

## ٦/٥ *

- ڕۆژی جیهانی پاراستنی ژینگە.
- ١٨٩٩ کۆچی دوایی شاعیری ئیسپانی (لۆرکا).
- ١٩٦٧ هێرشی زایۆنیەکان و هەڵگیرسانی جەنگی (عەرەب - ئیسڕائیل).
- ١٩٧٠ ڕۆژی سەربەخۆیی (دوورگەکانی تۆنگا) لەبەریتانیا.
- ١٩٨٥ کۆچی دوایی شاعیری کورد (موخلیص)[1].

## ٦/٦ *

- ١٩١١ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (ڕۆژی کورد) لە ئەستەنبوڵ.

---

[1] - (موخلیص)، ناوی حاجی مەلا خەلیل کوڕی فەقێ ڕەسوڵی حاجی مستەفا سنجاوییە شاعیرێکی بەتوانای کوردە، ساڵی (١٩١٠) لەناوچەی (کەندیناوە) لەدایکبووە، خوێندنی فەقێیەتی تەواوکردووەو بووە بە (مەلا)، دوا ئەوەی حەجی ماڵی خوای کردووە لە(شەقڵاوە) جێگیربووە، لەتەمەنی (٢٠) ساڵیەوە هۆنراوەی نووسیوەو سەر بەقوتابخانەی شیعری نالییە، کە بریتییە لە هۆنراوەی (ئایینی و پیاهەڵدان و سرووشت و دڵداری و نیشتمانپەروەری، جگە لەهۆنراوە (١٠) نامیلکەی بەنرخی داناوە، موخلیص سۆفیەکی پاکی ڕێبازی (نەقشبەندی) بووەو ئیجازەی ئیرشادی پێدراوە.

**- ١٩١٣ دەرچوونی یەکەم ژمارەی هەفتەنامەی (ڕۆژی کورد) بەسەرپەرشتی (عەبدولکەریم سلێمان) لەسلێمانی.**

**- ١٩٨٢ داگیرکردنی (باشوری لوبنان) لەلایەن ئیسرائیلەوە.**

**- ١٩٨٨ دەسگیرکردن و بێ سەروشوێنکردنی (مامۆستا ناصری سوبحانی) لەسنە[1].**

---

[1] - مامۆستا ناصری سوبحانی لەساڵی (١٩٥١) لەگوندی (دوریسان)ی سەر بەشاری پاوە لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەگوندەکەی خۆی و شاری پاوە تەواوکردووە، پاشان دەستی کردووە بەخوێندنی زانستە شەرعیەکان و لای زانا گەورەو ناودارەکانی پاوەو سنەو مەریوان خوێندویەتی، هەر لەسەرەتای لاویەوە بەزیرەکی و بلیمەتی دەرکەوتووە، ساڵی (١٩٨٠) پەیوەندی کردووە بەکۆمەڵی برایانی موسڵمانەوە، مامۆستا سوبحانی لەگەڵ مامۆستا (ئەحمەدی موفتی زادە)و ژمارەیەکی زۆر لەزاناو سیاسەتمەدارانی کوردستان لەچەندین هەوڵی دانوستاندا لەگەڵ بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی بەشداربووەو داکۆکی لەکێشەکانی گەلی کورد بەتایبەتی و ئەهلی سوننە بەگشتی کردووە، ساڵی (١٩٨١) کەشورای ناوەندی ئەهلی سوننەت (شمس) پێکهێنرا مامۆستا یەکێك بوو لەبەشدارە چالاکەکان و لەکۆنگرەی یەکەمدا بوو بەنوێنەری کرماشان، ساڵی (١٩٨٢) پاش ئەوەی بەرپرسانی ئێرانی کەوتنە دژایەتیکردنی (شمس) ناوچەکەی خۆی بەجێهێشت و بەشێوەیەکی نهێنی کەوتە چالاکی کردن لەشارەکانی ئێراندا، ساڵی (١٩٨٣) سەردانی پاکستانی کردووە، لەبەهاری (١٩٨٨) بەشداری لەکۆنگرەیەکی ئیسلامیدا کردووە لەتورکیا کەتایبەت بوو بەکێشەی کوردو وتارێکی بەنرخی خوێندەوە، لە ١٩٨٨/٦/٦ لەشاری سنە لەکاتی میوانداریدا دەستگیرکراو پاش چەند ڕۆژێك لەشاری (قوروە)ی سنە گۆڕەکەیان نیشانی کەسوکاریداو ئاگاداریان کردنەوە کەنابێت تەرمەکەی دەربهێننەوە.

مامۆستا سوبحانی بەشایەتی زۆرێك لەزاناو کەسایەتیە ئیسلامیەکان ئەهلی ئیجتیهاد بوو، لەهەموو بوارەکانی (تەفسیرو فەرموودەو فیقە و فەلسەفەو دەعوەو حەرەکەت) بۆچوون و ئیجتیهاداتی بەهێزی هەبوو، هەروەك خاوەنی نزیکەی هەزار کاسێتی تۆمارکراوە لەو بوارانەی کەئاماژەمان پێکردن.

## * ٦/٧

- ١٨٢٧ کۆچی دوایی مەولانا خالیدی نەقشبەندی[1].
- ١٩٤٤ سەربەخۆیی (ئیسلەندا) لەدانیمارك.

---

[1]- ڕێبەرو زانای گەورە مەولانا خالیدی نەقشبەندی، لە ١٧٧٩/١/١٩ لەقەرەداغ لەدایکبووە، سەرەتا لەحوجرە خوێندویەتی و دواتر لەناو شاری سلێمانی درێژەی بەخوێندن داوە، لەتەمەنی چوارده ساڵیدا بۆ خوێندن زۆربەی گوندەکانی کوردستان گەڕاوەو ساڵی (١٧٩٩) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، پاشان لەلایەن (ئیبراهیم پاشای بابان)ەوە دووجار وەزیفەی ئایینی لەسلێمانی خراوەتە بەردەم بەڵام ڕەتی کردۆتەوە، ساڵی (١٨٠٨) بەئومێدی بەدەست خستنی ڕێبەرێکی تەصەوفی دەستی داوەتە سەفەرو بەوڵاتی فارسدا تێپەڕی بەرەو وڵاتی هیندستان، لەشاری (دەهلی) بەخزمەتی (شێخ عەبدولای دەهلەوی) گەیشتووەو پاش ساڵێك گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و بەرایی بانگهێشتەکەی بۆ تەریقەتی نەقشبەندی لە شاری سنەوە دەستی پێکرد، ساڵی (١٨١١) مەولانا پاش گەشتێکی دووردرێژ گەیشتەوە سلێمانی (پایتەختی میرنشینی بابان) و پێشوازیەکی گەرمی لێکرا، پاش چەند ڕۆژێك چووە بۆ بەغدادو (سەعید پاشا)ی والی عوسمانیەکان و (داود پاشا)ی جێنشینی هاتوونەتە سەر تەریقەتی نەقشبەندی، پاش پێنج ڕۆژ گەڕاوەتەوە بۆ بۆ سلێمانی تادرێژە بەکارەکەی بدات، وە لەسلێمانی خەڵکێکی زۆر لەدەوری ڕێبازەکەی کۆبوونەوە، وەتوانی پەل بهاوێت بۆ وڵاتانی دراوسێی وەك (عێراق و تورکیاو سوریاو فەلەستین و داغستان)و خەلیفەی تێدا دانان، کەبەپێی سەرچاوەکان ژمارەی خەلیفە کوردەکانی شێخ خۆی لە (٣٤) خەلیفەو هی بیانیەکانیشی خۆی لە (٣٣) خەلیفە دەدات و ژمارەی پەیڕەو موریدانیشی لەنێوان دوانزە بۆ بیست هەزاردا بووە، و یەکەم کەس کەپایەی بەرزی خەلافەتی پێ بەخشراوە (شێخ عوسمان سیراجەدینی تەوێڵە) بووە، ساڵی (١٨١٦) (مەحمود پاشا)ی میری بابان مزگەوتێکی گەورەی لەشاری سلێمانی بۆ دروست کرد، مەولاناخالید لەساڵی ١٨٢٠ شاری سلێمانی بەجێ هێشتووە، (بۆ زانیاری زیاتر لەوبارەوە سەیری پەراوێزی ١٠/٢٠ بکە)، مەولانا خالید (٧) ئیجازە نامەی بەخشیوە و (٧) نامیلکەی لەبابەتی جۆراوجۆردا نووسیوە.

- ١٩٥٤ كۆچی دوایی (ئالان تیۆرینگ) یەکەمین داهێنەری کۆمپیوتەر.

- ١٩٩٨ کۆچی دوایی سەرۆکی نەیجیریا (جەنەراڵ محەمەد سانی لەپاچا).

٧ _ ٢٠٠٠/٦/٩ کۆنگرەی هەورامانناسی لە(سنە).

## * ٦/٨

- ١٩١٤ دامەزراندنی (یەکێتی تۆپی پێی بەرازیل).

- ١٩٤١ سەربەخۆیی سوریاو لوبنان.

- ١٩٨٢ کۆچی دوایی (محەمەد ئەمین کاردۆخی).

- ١٩٩٠ هەڵبژاردەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بەئەنجامی (١-٠) لەهەڵبژاردەی لە رژەنتینی بردەوەو بووە پاڵەوانی مۆندیالی جیهان.

## * ٦/٩

- ١٨٧٠ کۆچی دوایی ڕۆماننووسی ناوداری ئینگلیز (چارلس دیکنز).

## * ٦/١٠

- ١٨٣٦ کۆچی دوایی (ئەندریە ماری ئەمپێر)[١].

---

[١]- (ئەندریە ماری ئەمپێر) لە ١٧٧٥/١/٢٢ لەشاری (لیۆن)ی فەرەنسا لەدایك بووە، فیزیازانێکی فەرەنسیەو بەدامەزرێنەری زانستی کارۆموگناتیسی دادەنرێت، ئەمپێر لە ساڵی (١٨٣٦) لەتەمەنی ٦١ ساڵیدا لە مارسیلیای فەرەنسا کۆچی دوایی کردووە، لەساڵی (١٨٤٨)دا یەکەی پێوانەی تەزووی کارەبایان بەناوی ئەوەوە ناونا (ئەمپێر).

ئەمپێر یەکەم کەس بوو ئەوەی سەلماند: کەکاتێ تەزوویەکی کارەبا بەکۆیلێکدا تێدەپەڕێت، تەلی کۆیلەکە وەك تولێکی موگناتیسی لێدێت، لەدواییدا هەر ئەم سیفەتەش بووە بنچینەی چەندین داهێنانی گەورە لەبوارەکانی کارەبادا وەك داهێنانی تەلەگراف و تەلەفۆن و ئۆتۆمبیلی کارەبایی، هەروەها ئەمپێر ئامێرێکی بۆ پێوانەی تێپەڕبوونی تەزووی کارەبا دروستکرد کە پێی دەوترێت (گلڤانۆمیتەر).

**– ١٩٣٤ هەڵبـــژاردەی ئیتاڵیـــا بەئـــەنجامی (٣-١) لەهەڵبـــژاردەی چیکۆسلۆڤاکیای بردەوەو جامی جیهانی بەدەستهێنا.**

**– ١٩٧٠ دامەزراندنی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان)، کەدواتر بوو بە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان).**

**– ١٩٩٧ دەرچوونی ژمارە سفری گۆڤاری (خاك) لەسلێمانی.**

**– ٢٠٠٠ (حافز ئەسەد)ی سەرۆکی سوریا لەتەمەنی ٧٩ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، لە ٦/١٣ بەخاك سپێردرا.**

## * ٦/١٢

**– ١٩٩١ (بۆریس یەڵسن) بوو بە سەرۆك کۆماری ڕووسیا.**

## * ٦/١٣

**– ٢٠٠٠ کۆچی دوایی نووسەری کورد (د. عەلی باباخان) لەپاریس.**

**– ٢٠٠١ کۆچی دوایی ڕۆماننووسی مەغریبی (محەمەد زەفزاف)[1].**

## * ٦/١٤

**– ١٩١٧ دامەزراندنی یەکەم (دائیرەی ئەوقاف) لەبەغداد.**

**– ١٩٤٦ کۆچی دوایی (جۆن لۆجی بێرد) داهێنەری تەلەفزیۆن.**

**– ١٩٩٩ دامەزراندنی (کۆمەڵەی هاریکاری جیهانی لەپێناو فیدرالیزم بۆ کوردستان).**

---

[1] – محەمەد زەفزاف، ساڵی (١٩٤٥) لە (سوق الاربعای ڕۆژئاوا) لەمەغریب لەدایکبووە مامۆستای دواناوەندی بوو لە (دارولبەیزا)، زەفزاف بەخەڵاتێك ڕێزی لێنرا کەبووە خەڵاتێکی ئەدەبی و هەموو سێ ساڵ جارێك پێشکەش دەکرێت، ڕۆمان نووسێکی بەتوانایە خاوەنی ژمارەیەك چیرۆك و ڕۆمانی بەهێزەو ئاشنایەتی لەگەڵ کوردو ئەدەبی کوردیدا هەبووە، لەحوزەیرانی (٢٠٠١) کۆچی دوایی کردووە.

- ٢٠٠٥ (کاك مەسعود بارزانی) بوو بەسەرۆکی هەرێمی کوردستان[١].

# ٦/١٥ *

١٨٦٩ ڕۆژی ڕۆژنامەگـەری عێـراق بەدەرچـوونی یەکـەم ژمـارەی ڕۆژنامەی (الزوراء).

- ١٩٣٠ هەڵگیرسانی شۆڕشی (ئاگری داغ) لەتورکیا.

- ١٩٥٢ کۆچی دوایی شاعیر (موفتی پێنجوێنی).

---

[١] - (مەسـعود مـستەفا بـارزانی)، لـە١٦ی ئـابی (١٩٤٦) لەشـاری مـەهابادی ڕۆژهـەڵاتی کوردستان لەدایکبووە، هەر لەوڕۆژەی کـە(پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان)ی تیادامـەزراوە، بەهۆی مانەوەی مستەفا بارزانی باوکی لەیەکێتی سۆڤیەت، مەسعود بـارزانی لای بنەماڵـەی باپیری ژیاوە، کە دەستڕۆیشتوویەکی زێباری بوون، بارزانی کوڕ لەسـاڵانی (١٩٧٦-١٩٧٩) لەگەڵ باوکیدا لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ماوەتەوە، لـەدوای کۆچـی دوایـی بـاوکی پۆستی سـەرۆکایەتی پـارتی وەرگرتـووە، سـاڵی (١٩٨٨) دوای ئـەوەی پـارتی و یـەکێتی و چـەند حزبێکـی تـر (بـەرەی کوردسـتانی)یـان دامەزرانـد، بەهاویەشـی لەگـەڵ تاڵـەبانی سەرۆکایەتی بەرەی کردووە، لەدوای ڕاپەڕینەکەی بەهاری (١٩٩١) گەڕاوەتـەوە کوردسـتان و لەهەڵبژاردنی ئایاری (١٩٩٢)شدا یەکێك بوو لەو چوار کەسەی کە پاڵێورابوون بۆ پۆسـتی ڕابەری بزووتنەوەی ڕزگـاریخوازی گـەلی کـورد، لەسـاڵانی (١٩٩٤-١٩٩٨) پـارتی و یـەکێتی شەری ناوخۆیان لەدژی یەکتری کرد، لە ١٧ی ئەیلوول (١٩٩٨) بارزانی و تاڵەبانی بەناوبژی ئـەمریکا ڕێکەوتننامـەی ئاشـتیان لەواشـنتۆن ئیمزاکـرد، لـەدوای پرۆسـەی ئـازادی عێـراق لەساڵی (٢٠٠٣)، مەسعود بارزانی بوو بەیەکێك لە (٢٥) ئەندامەکەی ئەنجومەنی حوکم و بۆ مـاوەی مـانگێکیش سـەرۆکایەتی ئەنجومەنەکـەی لەئەسـتۆ گرتـووە، لـەحوزەیرانی (٢٠٠٥) لەلایـەن (ئەنجومـەنی نیـشتمانی کوردسـتان)ەوە هەڵبـژێردرا بـە (سـەرۆکی هـەرێمی کوردسـتان)و تائێـستاش لەپۆسـتەکەیدا مـاوە، هاوکـات لەگـەڵ پۆسـتی سـەرۆکی پـارتی دیموکراتی کوردستان.

## * ٦/١٦

- ١٩٥٠ دروستکردنی یاریگەی (ماراکانا) لەبەڕازیل[١].
- ١٩٦٧ کۆچی دوایی (حاجی محەمەدی شاتری).
- ١٩٨٨ کۆچی دوایی ڕۆژنامەنووسی کورد (عومەر جەلال حەوێزی).

## * ٦/١٧

- ١٩٧٢ دەرچوونی ڕۆژنامەی (دیدی نوێ) لەبەغداد.
- ١٩٩٨ کۆچی دوایی (شێخ محەمەد متەوەلی شەعراوی)[٢].

---

[١] - یاریگەی (ماراکانا) لەشاری (ڕیۆدی جانیرۆ)ی بەڕازیل لەساڵی (١٩٥٠) دروستکراوە، گەورەترین یاریگایە لەجیهانداو شوێنی دانیشتنی (١٢٥) هەزار کەس دەبێت.

[٢] - شێخ محەمەد متەوەلی شەعراوی لە ١٦ی نیسانی (١٩١١) لەپارێزگای (الدمقلیە)ی میسر لەدایك بووە، بەمنداڵی قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە، پاشان پەیوەندی کردووە بە پەیمانگای ئیسلامی (الزقازیق)و خوێندنی ئامادەیی تەواوکردووە، پاشان لەکۆلیژی زمانی عەرەبی لەئەزهەر وەرگیراوە، لەساڵی (١٩٤١) بڕوانامەی جیهانی بەدەستهێناوە، پاش تەواوکردنی خوێندن لەپەیمانگای (طنطا)ی ئاینی بەمامۆستا دامەزراوە، ساڵی (١٩٦٢) کراوە بەپشکنەری زمانی عەرەبی لەئەزهەر، ساڵی (١٩٦٤) کراوە بە یاریدەدەری نووسینگەی شێخی ئەزهەر، ساڵی (١٩٧٢) کراوە بەسەرۆکی خوێندنی باڵا لەکۆلیژی شەریعە لە (جیددە)، ساڵی (١٩٧٦) پۆستی وەزارەتی ئەوقافی میسری وەرگرتووە، ساڵی (١٩٨٠) بووە بەئەندام لە (کۆڕی لێکۆڵینەوە ئیسلامیەکان)، ساڵی (١٩٨٧) هەڵبژێردرا بەئەندامی (کۆڕی زمانی عەرەبی)، ڕابیتەی عالەمی ئیسلامی پلەی ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری پێ بەخشی، شێخ شەعراوی بایەخی بەشیعر دەدا بەتایبەتی شیعری (ئەحمەد شەوقی)، هەروەها خۆی چەند پارچە شیعرێکی هەیە.

شێخ شەعراوی جگە لەوتارو موحازەرە جەماوەریەکانی، چەندین کتێبی دەربارەی ئیسلام لەبوارە جیاجیاکاندا نووسیوە، لەوانە: (المعجزة الکبری، المرأة في القران، شبهات وأباطیل

## * ٦/١٨

- ١٨٨٢ کۆچی دوایی (دیمترۆڤ).
- ١٩١٩ شەڕی دەربەندی بازیان دژی ئینگلیز.
- ١٩٦٢ کۆچی دوایی شاعیری کورد (ئەسیری)[١].
- ١٩٩٧ (د. نەجمەدین ئەربەکان) بەڕەسمی دەستی لەپۆستی سەرۆک وەزیرانی تورکیا کێشایەوە[٢].

---

خصوم الاسلام والرد عليها، مئة سؤال وجواب في الفقه الاسلامي، أهل الكهف، القضاء والقدر، عقيدة المسلم، السحر والسحرة، مريم والمسيح، من مشاهد يوم القيامة، خواطري حول القران الكريم "کەیەکێکە لەگرنگترین کتێبەکانی"، معجزة القران "کەوەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی").

[١] – ئەسیری، ناوی عەبدولخالق شێخ حسێن نەقشبەندیە، سالّی (١٨٩٥) لەکەرکوك لەدایکبووە، بۆخوێندن زۆر شوێن گەڕاوە، لەوانە سلێمانی و بانەو سەقزو سنەو کرماشان و هەمەدان، دواتر چووە بۆ ئەستەنبولّ پاشان گەڕاوەتەوە بۆ کەرکوك، ئەسیری شاعیرێکی هەلّکەوتوو و زانایەکی پێگەیشتوو بووە، زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی زانیوە، دوو فەرهەنگی بەرهەم هێناوە کەیەکەمیان فەرهەنگێکی کوردیەو ئەوی تریان فەرهەنگێکی (کوردی – عەرەبیە)، لەحوزەیرانی (١٩٦٢) کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی (شێخ محێدین) لەکەرکوك بەخاك سپێرراوە.

[٢] – دوای ئەوەی حیزبی ڕەفاهی ئیسلامی لەهەلّبژاردنەکانی سالّی (١٩٩٥)ی تورکیا بەڕێژەی (٢١٪) زۆرینەی دەنگەکانی بەدەست هێنا، (د. نەجمەدین ئەربەکان)ی سەرۆکی حیزبەکە لەگەلّ (تانسو چیلەر)ی سەرۆکی حیزبی ڕێگای ڕاست حکومەتێکی ئیئتیلافی پێکهێناو خۆی بوو بەسەرۆك وەزیرو چیلەر بەجێگری سەرۆك وەزیر، بەلاّم لەناوەڕاستی سالّی (١٩٩٧) لەژێر فشاری سوپای تورکیادا ئەربەکان وازی لەپۆستەکەی هێناو لەمانگی کانوونی دووەمی (١٩٩٨)یشدا بەپێی بڕیاری پەرلەمان حیزبی ڕەفاه هەلّوەشێنرایەوەو ڕێگەی چالاکی سیاسی قەدەغەکرا لەئەربەکان و پێنج لەسەرکردەکانی ئەو حیزبە بۆ ماوەی

## * ٦/١٩

- ١٩٤٧ لەسێدارەدانی چوار ئەفسەرەکەی حکومەتی مەهاباد کەبریتی بـوون لـە (عیـزەت عەبدولعـەزیز، مـستەفا خۆشـناو، خـەیروڵڵا عەبدولکەریم، محەمەد قودسی).
- ١٩٥٠ کۆچی دوایی شاعیرو ڕۆژنامەنووسی کورد (پیرەمێرد)[1].

---

پێنج ساڵ، (ئەربەکان) ساڵی (١٩٢٦) لەشاری (سنوب) لەدایکبووە، ساڵی (١٩٤٨) کۆلێژی ئەندازیاری کیمیایی تەواوکردووە، پاشان دکتۆرای لە (ئەندازەی میکانیکی تانك)دا بەدەست هێناوە لەئەڵمانیای ڕۆژئاوا، ساڵی (١٩٧٤) بووەتە جێگری سەرۆك وەزیرانی تورکیا لەسەر لیستی (حیزبی سەلامەی نیشتمانی) کەخۆی ڕێبەرایەتی دەکرد، ئەربەکان یەکێك بوو لەدامەزرێنەرانی حیزبی ڕەفاهی ئیسلامی کەپاش هەڵوەشاندنەوەی حیزبی سەلامە لەمانگی تەمووزی ساڵی (١٩٨٣) لەلایەن (ئەحمەد تەگدال)ەوە دامەزرا، دواتر ئەربەکان بوو بەکەسی یەکەمی حیزبەکە، ساڵی (١٩٩٣) حیزبی ڕەفاه زۆرینەی دەنگی هەڵبژاردنی شارەوانیەکانی بەدەستهێنا بەتایبەت لەهەردوو شاری گەورەی (ئەنقەرەو ئەستەنبوڵ).

[1] - پیرەمێرد (حاجی تۆفیق بەگ کوڕی مەحمود ئاغای هەمزاغا)، لەساڵی (١٨٦٧) لەسلێمانی لەدایك بووە، زانستەکانی شەرعی و زمانی لەمزگەوت و قوتابخانە کۆنەکانی وڵاتی خۆی و لەبانەی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا خوێندووە، زمانی کوردی و تورکی و فارسی زانیوە، ساڵی (١٨٨٢) بووە بە (کاتب نفووس) لەسلێمانی، لەساڵی (١٨٨٦)یشدا بووە بە کاتب ئەوەلی دادگای شارباژێڕ، ساڵی (١٨٩٥) بووە بەجێگری داواکاری گشتی لەکەربەلادا، ساڵی (١٨٩٩) بەهاوڕێیەتی شێخ سەعیدی حەفید (باوکی شێخ مەحمود) چووە بۆ تورکیا، ساڵی دواتر هەر لەگەڵ شێخ سەعیدا حەجی ماڵی خوای کردووە، لەساڵی (١٨٩٩)دا بووە بەئەندامی ئەنجومەنی باڵای مەعاریف لەئەستەنبوڵ و نازناوی (بەگ)ی پێدراوە، لەهەمان کاتدا کەوتە خوێندن لەمافداو بڕوانامەی تێدا وەرگرت، پاش ڕاگەیاندنی دەستوور لەساڵی (١٩٠٨)، کەوتە کاری پارێزەرایەتی و ڕۆژنامەگەری و، لەکۆمەڵە نیشتمانیە کوردیەکانی

- ١٩٦١ سەربەخۆیی (کوەیت) لەبەریتانیا.

- ١٩٧٠ دامەزراندنی (کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد).

## * ٦/٢٠

- ١٩٦٣ کۆچی دوایی مێژوونووسی کورد (م. مەلا ئەنوەری مائی).

- ١٩٦٩ کۆچی دوایی قورئان خوێن (شێخ محەمەد سدیق مەنشاوی)[1].

---

ئەستەنبوڵدا بەشداربوو، ڕۆژنامەی (رسملی کتاب)ی بەتورکی و کوردی دەرکردو لەزۆری دیکەشدا بەشداری کردووە، ساڵی (١٩١٨) بەقایمقام و دواتر بەموتەسەڕیف دامەزراوە.

لە ١٩٢٥/١٢/٣٠ گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و لەژمارە یەکەوە لەڕۆژنامەی (ژیان)دا کاری کردووەو لە (١٩٣٢)دا بووەتە سەرنووسەری و لە ساڵی (١٩٣٤)یشدا بووەتە خاوەنی ڕۆژنامەکە، کاتێك هەوڵی ئەوەدرا چاپخانەکەی لێ بستێنن و (ژیان) دابخەن، خانووەکەی ڕەهن کردو چاپخانەیەکی تایبەت بەخۆی هێنا بۆ سلێمانی، پاشان درێژەی بەدەرکردنی ڕۆژنامەکەیداو بەناوی (ژین)و زنجیرەکەی نەپچڕاند، واتە یەکەمین ژمارەی (ژین) کە لە ١٩٣٩/١/٢٦دا دەرچووە، دەستەواژەی ساڵی چواردەهەم و ژمارەی (٥٥٤)ی لەسەرە، دوایین ژمارەی (ژین) لەکاتی مردنی پیرەمێرددا لە ١٩٥٠/٦/١٩ ژمارە (١٠١٥)ی لەسەرە.

لەتەك ڕۆژنامەگەریدا، بەشداریکردنی پیرەمێرد لەئەدەبی کوردی بەهایەکی لەبن نەهاتووی هەیە، سەرباری هۆنراوەکانی و دەرکردنی گەلێك کتێب لەوانە حەکایەت و ڕۆمانی مێژوویی و فۆلکلۆری و (٤٨٠٠) پەندیشی لەشێوەی هۆنراوەدا نووسیوە، هەروەها بەیەکەم کەس دادەنرێت کەنەریتی ئاگرکردنەوەی سەر لوتکەی شاخەکان زیندوو کردۆتەوە لەبۆنەی نەورۆزدا، شیعرەکەشی دەربارەی نەورۆز بووەتە سروودێکی نەتەوەیی و تاکو ئێستا ڕۆڵەکانی کورد لەبۆنەی نەورۆزدا دەیڵێنەوە.

[1] - مامۆستای قورئان خوێن شێخ محەمەد سدیق مەنشاوی، لەساڵی (١٩٢٠) لەپارێزگای (سوهاج)ی میسر لەدایکبووە، لەتەمەنی (٨) ساڵیدا هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە، ساڵی (١٩٥٣) لەئێزگەی قاهیرە قورئانی تۆمارکردووە، دوو جار هەوڵی لەناوبردنی دراوە، مەنشاوی هاتووچۆی دەسەلاتدارانی نەکردووەو بەردەوام داواکانیانی ڕەتکردۆتەوە،

- ٢٠٠٣ دامەزراندنی (ڕێکخراوی عێراقی بۆ هەماهەنگیکردنی مافەکانی مرۆڤ).

- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی شاعیری ناوداری عێراقی (نازك مەلائیکە).

## * ٦/٢١

- ١٩٣٠ تیرۆرکردنی سمایل خانی شکاك (سمکۆ) لەشاری سنە[١].

- ١٩٥٥ لەدایکبوونی یاریزانی فەڕەنسی (میشیل پلاتینی)[٢].

---

مەنشاوی لەژیانیدا سێ جۆر خەتمی تۆمارکردووە، دوانیان بەشێوەی تەرتیل و سێیەمیان بەشێوەی تیلاوە، لەگەڵ نزیکەی پەنجا کاسێتی تۆمارکراو کە لەمزگەوت و بۆنەکان و شەوانی ڕەمەزاندا پێشکەشی کردوون.

[١] - سمایل ئاغای شکاك (سمکۆ) لەساڵی (١٨٧٥) لەدایکبووە، سمکۆ لەسالانی (١٩٨١-١٩٢٢) لەناوچەکانی باشورو ڕۆژئاوای دەریاچەی ورمێ لەڕۆژهەلاتی کوردستان دەسەلاتێکی کوردی دامەزراند، لەجەنگی جیهانی یەکەمدا سمکۆ هێزێکی گەورەی بۆخۆی پێکەوەناو هەردوو سنوری عوسمانی و ئێرانی بەزاند، ئێران لەشوباتی (١٩٢٠) بۆماوەیەك هێزەکانی سمکۆی شکاند، بەلام دواتر لەساڵی (١٩٢١) سمایل خان هێزێکی گەورەتری کۆکردەوەو ڕۆژنامەیەکیشی لەسابلاخ دەرکردووە، حکومەتی ئێرانی لە ٩ی ئابی (١٩٢٢) هێزەکانی سمکۆیان شکاندو خۆیشی لەعێراقەوە چوو بۆتورکیا بۆلای هەریەك لەشێخ مەحمودو سەید تەهای نەهری، لەبەهاری (١٩٢٥) سمکۆ گەڕایەوە بۆ ئێران و سەرۆکایەتی بنەماڵەی عەبدۆییەکانی خێڵی شکاکی وەرگرت و شۆڕشی هەلگیرساندەوە، بەلام ساڵی (١٩٣٠) حکومەتی ئێرانی بەناوی دانوستانەوە بانگهێشتیان کردو لەڕێگەدا بۆسەیان بۆداناو لەنزیك شاری شنۆ شەهیدیان کرد.

[٢] - میشیل پلاتینی ڕەگەز فەڕەنسی، یەکێك لەیاریزانە بەناوبانگەکانی هەڵبژاردەی فەڕەنسا بووە، درێژییەکەی (١٧٩) سانتیمەترو کێشی (٧٥) کگم بووە، شوێنی یاریکردنی ناوەڕاستی یاریگە بووە، لەڕیزی یانەکانی (جیۆف و نانسی و سانت ئیتیان و یۆفۆنتۆس) یاری کردووە، لەسالانی (١٩٨٣و ١٩٨٤و ١٩٨٥) گۆلکاری خولی ئیتالیا بووە، لەسالانی

- ١٩٧٠ هەڵبژاردەی بەرازیل بەئەنجامی (٤-١) لەهەڵبژاردەی ئیتاڵیای بردەوەو جامی جیهانی بەدەست هێنا.

- ١٩٩٣ کۆچی دوایی مامۆستا (شێخ عەبدوللەتیف بەرزنجی)[1].

- ٢٠٠٥ کۆچی دوایی هونەرمەند (عوسمان عەلی خەیات).

## *٦/٢٣

- ١٨٩١ کۆچی دوایی زانای بەناوبانگی فیزیایی (ولیەم ئێدوارد وێبەر) لەئەڵمانیا، کە(یەکەی لێشاوی موگناتیسی) بەناوی ئەوەوە ناونرا (وێبەر wb).

- ١٩٧١ کۆچی دوایی شاعیری کورد مەلا حەسەنی قازی (شاهۆ)[2].

---

(١٩٨٣و ١٩٨٤و ١٩٨٥) خەلاتی تۆپی زێڕینی بەدەست هێناوە، بەپێی پۆلێنی فیفا لەساڵی (١٩٨٥) باشترین یاریزانی جیهان بووە، لەکۆی (٧٢) یاری نێودەوڵەتی (٤١) گۆڵی تۆمارکردووە.

[1] - شێخ عەبدوللەتیف شێخ عەبدوڵا بەرزنجی، ساڵی (١٩٤٢) لەگوندی (کورەداوێ)ی شارباژێڕ لەدایکبووە، ساڵی (١٩٦٤) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ساڵی (١٩٧٤) بڕوانامەی ماستەری لە (أصول الفقه)دا وەرگرتووە، ساڵی (١٩٨٦) چۆتە شاخ و بووە بەرابەری (بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی)، دواتر لە(بزووتنەوەی ئیسلامی)دا بووە بەئەندامی مەکتەبی سیاسی، ساڵی (١٩٩٣) بەکارەساتی ئۆتۆمبیل کۆچی دوایی کردووە.

[2] - شاهۆ، ناوی (مەلا حەسەن مەلاعەبدولقادر مەلا ئەورەحمان)ە، ساڵی (١٨٨٢) لەبیارە لەدایکبووە، خوێندنی ئەو کاتە تەواو دەکات و پاشان دەچێت بۆ ئەستەنبوڵ، دوای گەڕانەوەی دەبێت بە قازی لەهەڵەبجە، هەروەها لەچەند شوێنێکی تر دەبێتە کاربەدەستی میری، شاهۆ پیاوێکی زیرەك و زاناو قسەخۆش بووە، زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی زانیوە، لەحوزەیرانی (١٩٧١) کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی (بیارە) بەخاك سپێردراوە.

- ١٩٧٢ لەدایکبوونی یاریزانی فەڕەنسی (زەینەدین زیدان)[1].
- ١٩٨٨ بۆ جاری دووەم پەیمانگای تەکنیکی سلێمانی کرایەوە.
- ١٩٨٩ کۆچی دوایی دامەزرێنەری پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست (موشیل عەفلەق).

## * ٦/٢٤

- ١٩٥٧ دروستکردنی یاریگەی (نوکامب) لەئیسپانیا[2].
- ١٩٧٦ یەکگرتنەوەی هەردوو بەشەکەی (ڤێتنام).
- ٢٠٠٠ کۆچی دوایی مامۆستا (مەلا سەید عەزیز نەقشبەندی).
- ٢٠٠٧ دەرچوونی بڕیاری لەسێدارەدان لەدادگای باڵای تاوانەکانەوە بۆ (عەلی کیمیاوی و سوڵتان هاشم و حسێن ڕەشید).

## * ٦/٢٥

- ١٩٤٢ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (باسەڕە).
- ١٩٥٩ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (نەورۆز) لەسلێمانی لەلایەن مامۆستا (کەمال میرزا کەریم).

---

[1] – زیدان، درێژی (١٨٥ سم)و کێشی (٨٠ کگم)و لەناوەڕاستی یاریگە یاری دەکات، لەڕیزی ئەم یانانەدا کاری کردووە: (سان هنری مارسێل، ڤالۆنس، کان، بۆردۆ، یۆڤێنتۆس، ریال مەدرید)، خەلاتی تۆپی زێڕینی لەساڵی (١٩٩٨) بەدەست هێناوە، لەکۆی (١٠٨) یاری نێودەوڵەتی (٣١) گۆڵی تۆمارکردووە، لەمۆندیالی (٢٠٠٦) دوای بەشداری لەیاری کۆتایی لەنێوان فەڕەنساو ئیتاڵیا وازی لەیاری هێنا.

[2] – یاریگەی (نوکامب) لەشاری بەرشەلۆنەی ئیسپانیا دروستکراوەو یاریگەی یانەی (ئێف سی بەرشەلۆنە)یە، شوێنی دانیشتنی (٩٩) هەزار کەس دەبێت و داهاتی ساڵانەی نزیکەی (٢٥) ملیۆن دۆلارە.

- ١٩٧٤ سەربەخۆیی (مۆزەمبیق) لەپورتوگال.
- ١٩٧٨ هەڵبژاردەی ئەرجەنتین بۆ یەکەم جار بووە پاڵەوانی مۆندیالی جیهان پاش ئەوەی بەئەنجامی (٣-١) لەهەڵبژاردەی هۆڵەندای بردەوە.
- ١٩٨١ تیرۆرکردنی سیاسەتمەداری کورد (ساڵح یوسفی).
- ١٩٩١ سەربەخۆیی (کرواتیا) لەبەریتانیا.
- ٢٠٠٧ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە) لەسلێمانی.
- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی خانمە گۆرانی بێژی ئێرانی (مەهەستی)[١].

# * ٦/٢٦

- ڕۆژی جیهانی نەهێشتنی ماددە بێهۆشکەرەکان.
- ١٩٦٠ سەربەخۆیی وڵاتی (مەدەغەشقەر) لەفەڕەنسا.
- ١٩٧٢ کۆچی دوایی هونەرمەندی کورد (حەسەن زیرەك) لەئێران[٢].

---

[١] - مەهەستی ناوی (خەدیجە ئیفتیخار دەدە)یەو ساڵی (١٩٤٧) لەئێران لەدایکبووە، یەکەمین کاری گۆرانی و ئاوازی مەهەستی لەبەرنامەی (گلهای رنگارنگ) گوڵە ڕەنگاو ڕەنگەکاندا بوو کە لەساڵانی شەستەکاندا لەڕادیۆی میللی ئێران پەخش دەکرا، پاش سەرکەوتنی لەکارەکەیدا (هایدە)ی خوشکیشی هێنایە ناو بواری هونەرەوە، مەهەستی خاوەنی (٣٥) ئەلبوومی مۆسیقیە، لەوانە: (هوای یار، ئاشفتە، مسافر، گل امید)، مەهەستی پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران چۆتە بەریتانیاو دواتر لەئەمریکا گیرسایەوە، لەتەمەنی (٦٠) ساڵیدا هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد.

[٢] - (حەسەن زیرەك) کوڕی عەبدوڵلایە، هونەرمەندێکی بەناوبانگی گەلی کوردە، ساڵی (١٩٢١) لەشاری (بۆکان)ی خۆرهەڵاتی کوردستان لەدایکبووە، ساڵی (١٩٥٣) لەئێستگەی کوردی لەبەغداد وەك (گۆرانی بێژ) دامەزراوەو (٥٦) گۆرانی تۆمارکردووە، هەفتەی جارێك ڕاستەوخۆ لەڕادیۆکەدا ئاهەنگی گێڕاوە، لەشارەکانی (کەرکوك و هەولێرو سلێمانی) ئاهەنگی قەشەنگی گێڕاوە، ساڵی (١٩٧٢) بەنەخۆشی (شێرپەنجە) کۆچی دوایی کردووە.

**- ١٩٩١ سەربەخۆیی (سلۆڤینیا) لەیۆگسلاڤیا.**

**- ٢٠٠٧ (گۆردن براون) بوو بەسەرۆك وەزیری بەریتانیا.**

## * ٦/٢٧

**- ١٩٧٧ سەربەخۆیی (جیبۆتی) لەفەرەنسا.**

**- ١٩٨٥ کۆچی دوایی نووسەر (بورهان قانع) لەسلێمانی.**

**- ١٩٩٥ لەکودەتایەکی سپیدا (حمد بن خلیفة الثاني) کوڕی ئەمیری (قەتەر) باوکی لەسەرکارلاداو، خۆی بەئەمیری وڵات ناساند.**

## * ٦/٢٩

**- ٧٦٢ بناغەی شاری بەغداد لەلایەن خەلیفەی عەبباسی (ئەبو جەعفەری مەنصور) دانرا.**

**- ١٧١٢ لەدایکبوونی نووسەری فەرەنسی (جان جاك ڕۆسۆ).**

**- ١٩٢٥ لەسێدارەدانی شێخ سەعیدی پیران و هاوەڵەکانی لەدیاربەکر[١].**

---

[١] - شێخ سەعیدی پیران لەساڵی (١٨٦٥) لەقەزای (بابو)یۆ ویلایەتی (ئالارنج) لەدایکبووەو شێخی تەریقەتی نەقشبەندی بووە، پاش هاتنە سەرکاری (مستەفا کەمال ئەتاتورك) لەتورکیا، شێخ سەعید خۆی ئامادەکرد بۆ سەندنەوەی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد هاوکات بۆ نەهێشتنی ئەو ستەمەی کە لەموسڵمانان دەکرا، شێخ سەعید لەساڵانی (١٩٠٨-١٩٢٣) لەکاتی دامەزراندنی کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردیەکاندا چالاکی ڕامیاری کردووە، شێخ بەخۆی و (٤٠٠) چەکدارەوە زیاتر لە چوار مانگ پروپاگەندەی بۆ شۆڕشەکەی کرد، وە لەسەرەتای مانگی ئازاری ساڵی (١٩٢٥) شۆڕشی دژی تورکیای کەمالی بەرپاکرد، لەسەرەتادا سەرکەوتنی بەدەستهێناو بەرەو دیاربەکر ڕۆیشت و ویستی ئازادی بکات و دەوڵەتی کوردی تیا ڕابگەیەنێت، بەڵام پاشان نەیتوانی بەرامبەر بە تفاقی زۆری لەشکری کەمالیەکان خۆی ڕابگرێ و شۆڕشەکەی لەناوبراو شێخ سەعیدیش دەستگیرکراو بەتاوانی ناپاکی (خیانة) لەحوزەیرانی (١٩٢٥) لەگەڵ (٥١) کەس لەهاوەڵانی لەسێدارەدرا.

**- ١٩٦٧ هێزەکانی (ئیسرائیل) باشوری شاری قودسیان داگیرکرد.**

**- ١٩٧٦ سەربەخۆیی (سیشیل) لەبەریتانیا.**

**- ١٩٨٦ هەڵبژاردەی ئەرجەنتین بەئەنجامی (٣-٢) لەهەڵبژاردەی ئەڵمانیای بردەوەو جامی مۆندیالی بەدەستهێنا.**

**- ١٩٨٨ کۆچی دوایی شاعیری کورد (ئەحۆل).**

**- ١٩٩٢ کوژرانی سەرۆکی جەزائیر (محمد بن زیاف).**

## * ٦/٣٠

**- ١٩٢٠ هەڵگیرسانی شۆڕشی بیست لەعێراقدا.**

**- ١٩٤٩ کۆچی دوایی شاعیری لوبنانی (خەلیل مەتران).**

**- ١٩٦٠ سەربەخۆیی کۆنگۆی دیموکراتی (زائیر) لە بەلجیکا[١].**

**- ١٩٦٦ هەڵبژاردەی ئینگلتەرا لەهەڵبژاردەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوای بردەوەو جامی جیهانی بەدەستهێنا.**

---

[١] - کۆماری کۆنگۆی دیموکراتی وڵاتێکی ئەفریقاییە، لە ١٩٦٠/٦/٣٠ سەربەخۆیی لەبەلجیکا وەرگرتووە، ساڵی (١٩٧١) ناوەکەی گۆڕا بۆ (زائیر)، بەڵام لەمانگی ئایاری (١٩٩٧)دا هێزەکانی (لۆران کابێلا) کۆتاییان بەدەسەڵاتی (مۆبۆتۆسیسیکۆ)ی سەرۆکی زائیر هێناو ناوی وڵاتەکەشیان گۆڕییەوە بۆ (کۆماری کۆنگۆی دیموکراتی)، پایتەختی وڵات ناوی (کینشاسا)یەو ڕووبەری وڵات (٢,٣٤٤,٨٨٥ کم٢)، کە لەم ڕووەوە دوانزەهەمین وڵاتی جیهانە، ژمارەی دانیشتوانەکەشی (٤٦٦٧٤٠٠٠) هاوڵاتیە بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٩٧) وە لەم ڕووەوە (٢٥)ەمین وڵاتی جیهانە، سیستمی فەرمانڕەوایی (کۆماری دیموکراتی ڕاگوزاری)، ڕەش پێستەکانی قەبیلەکانی بانتو (٨٠٪)ی دانیشتوان پێك دەهێنن و سودانی (١٨٪)، ئاینی دانیشتوان (٤٢٪) کاسۆلیك، (٢٥٪) پرۆتستانت، (١٥٪) مەسیحی تر، (٢٪) موسڵمان، زمانی (فەڕەنسی) زمانی فەرمی دەوڵەتەو دراوی وڵات (زائیری نوێ)یە.

# مانگی تەمووز (یولیۆ)

## * ٧/١

- ١٨٦٧ سەربەخۆیی (کەنەدا) لەبەریتانیا[١].
- ١٩٢٥ بۆ یەکەم جار سینەما لەسلێمانی کرایەوە.
- ١٩٣٦ دامەزراندنی ئیزگەی ڕادیۆی عێراق لەبەغداد.
- ١٩٤٦ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (چەمچەماڵ).
- ١٩٦٠ دامەزراندنی (پارتی دیموکراتی کورد) لەلوبنان.
- ١٩٧٦ دەرچوونەوەی ڕۆژنامەی (خەبات) لەژمارە (٥٢٧)ەوە، بەکوردی و عەرەبی.
- ١٩٩٦ دامەزراندنی تەلەفزیۆنی یەکگرتوو - کەناڵی سلێمانی.
- ١٩٩٩ کۆچی دوایی مێژوونووسی کورد (تاهیر ئەحمەد حەوێزی).
- ٢٠٠٢ دامەزراندنی دادگای تاوانی نێودەوڵەتی.
- ٢٠٠٣ کردنەوەی فڕۆکەخانەی هەولێری نێودەوڵەتی.

---

١ - (کەنەدا)، وڵاتێکی جوانی سرووشتیە لەبەشی باشووری کیشوەری ئەمریکای باکووردا، ڕووبەرەکەی (٩,٩٧٦,١٣٩ کم٢)یەو دووەم وڵاتی جیهانە لەگەورەییدا، دانیشتوانی نزیکەی (٣٢) ملیۆن کەسەو لە (١٠) هەرێم پێکهاتووە، پایتەختەکەی شاری (ئۆتاوا)یەو دراوی فەرمی (دۆلاری کەنەدی)یە، کەنەدا زەوی بەپیتی هەیە بۆ کشتوکاڵ و بەناوبانگترین وڵاتی جیهانە لەبەرهەمی (گەنم)دا، دانیشتوانی لەچەند ڕەگەزێکی جیاواز پێکهاتوون، لەوانە: (فەڕەنسی و بەریتانی و سکوتلەندی و ئیرلەندی و ئەڵمانی)، کەنەدیەکان بۆ سەربەخۆیی دەستیان بەتێکۆشان کرد، سەرهەڵدانی (بزووتنەوەی یەکگرتن خوازەکان) بووە هۆی دەرچونی (یاسای ئەمریکای باکووری بەریتانی) لەساڵی (١٨٦٧) کەسەربەخۆیی (کەنەدا)ی لێکەوتەوە، کەنەدا لەساڵی (١٩٤٥) بوو بە ئەندامی (نەتەوە یەککرتووەکان).

## * ٧/٢

- ١٧٧٨ كۆچی دوایی نووسەری فەڕەنسی (جان جاك ڕۆسۆ)[١].

- ١٩٦١ ڕۆماننووسی ئەمریکی (ئەرنست هەمەنگوای) خۆی کوشت.

- ١٩٦٢ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (بڕوا) لەلایەن (کەمال میرزا کەریم).

- ١٩٨٢ موسڵمان بوونی بیریاری فەڕەنسی (ڕۆجیە گاردی)[٢].

---

[١] - ڕۆسۆ ساڵی (١٧١٢) لەشاری جنێفی سویسرا لەخێزانێکی بەڕەگەز فەڕەنسی لەدایك بووە، پاش بەسەربردنی ژیانێکی پڕ ناڕەحەتی ڕۆسۆ توانی جۆرێك لەپەیوەندی لەگەڵ نوخبەی کۆمەڵی پاریسی دروست بکات، ڕۆسۆ بەشداری لەپێشبڕکێیەکی زانستی کرد لە ئەکادیمیای (دیجۆ) لەساڵی (١٧٥٠)داو خەڵاتی بەدەستهێنا کەبووە هۆی ناساندنی ڕۆسۆ لەسەرتاسەری ئەورووپادا، ساڵی (١٧٦٢) هەردوو کتێبە بەناوبانگەکەی (پەیمانی کۆمەڵایەتی و ئیمیل)ی بڵاوکردەوەو ساڵی (١٧٦٧) (فەرهەنگی موزیکی) بڵاوکردەوە، پاش بڵاوبوونەوەی ئەم دوو کتێبە پەرلەمانی پاریس بڕیاری سوتاندنی ئەو دوو کتێبەی داو حوکمی زیندانی بەسەر ڕۆسۆدا سەپاند، کەئەمەش ڕۆسۆی ناچارکرد ڕووەو سویسرا هەڵبێت، پاش گەڕانەوەی بۆ فەڕەنسا لەساڵی (١٧٧٨) کۆچی دوایی کرد.

[٢] - ڕۆجیە جان شارل گارودی، لەشاری مارسیلسای فەڕەنسا لەدایکبووە، لەقۆناغە سەرەتاییەکانی خوێندنیەوە زیرەکی و بلیمەتی پێوە دیاربووە، بۆیە لەسەر ئەرکی حکومەت خوێندنی تەواو کردووە، ساڵی (١٩٣٦) پلەی شەرەفمەندێتی مامۆستایەتی لەفەلسەفەدا وەرگرت، لیسانسی لەئەدەبدا وەرگرتووە، دکتۆرای ئادابی لەزانکۆی سۆربۆن لەپاریس وەرگرتووە، مەدالیای شەرەفی جەنگی وەرگرتووە لەساڵی (١٩٤٠) بەهۆی دژایەتیکردنی هیتلەرو نازیە فاشیەکان، ئەندامی پەرلەمانی فەڕەنسی و ئەندامی پیرانی فەڕەنسا بووە بۆ ماوەی (١٤) ساڵ، سەرۆکی لیژنەی باڵای ڕۆشنبیری نیشتمانی بووە، بۆ ماوەی (١٣) ساڵ سکرتێری حیزبی شیوعی فەڕەنسا بووە، لەتەمووزی (١٩٨٢) (ڕەمەزانی ١٤٠٢ك) لەڕێکخراوی ڕۆشنبیری لەجنێف موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، گارودی خاوەنی

## * ٧/٣

- ١٩٨١ بۆ یەکەم جار هەواڵی نەخۆشی (ئایدز) بڵاوکرایەوە.

- ١٩٩٢ دامەزراندنی (حیزبی شیوعی کوردستان) پاش سەربەخۆبوونیان لە(حیزبی شیوعی عێراقی).

## * ٧/٤

- ١١٨٧ سەرکەوتنی سەلاحەدینی ئەیوبی بەسەر صەلیبەکاندا لەشەڕی (حەتین) لەقودس.

- ١٧٧٦ سەربەخۆیی (ئەمریکا) لەبەریتانیا[١].

---

(٥٣) پەرتووك و نوسراوە لەوانە: (إنذار الى الأحياء، كيف صار الإنسان غنسانا؟، القضية الإسرائيلية، البديل، من اكون في إعتقادكم؟، أذمة الماركسية الراهنة، وعود الإسلام،...) هەروەها بەهۆی نووسینی کتێبی (الأساطير المؤسسة للسياسة الأسرائيلية) دادگای فەڕەنسا بڕی (٢٠) هەزار دۆلار غەرامەی (گارودی) کرد.

[١] - ئەمریکا وڵاتی کۆچبەرانە، تەنانەت هیندیە سورەکانیش لەسەردەمی پێش مێژوودا لەکیشوەری ئاسیاو سیبیریاوە هاتوون، ئەمریکای ئەمڕۆ لەچەندین ڕەگەزی نەتەوە جیاوازەکانی جیهان پێکهاتووە، دانیشتوانی ئەمریکا پێکهاتووە لە (١٩٧) ملیۆن سپی پێستی ئەورووپی و کەمینەیەکی (٣٤) ملیۆنی ڕەش پێستی بەڕەگەز ئەمریکی و (٣٠) ملیۆن مەکسیکی و ئەمریکی لاتین و (٩) ملیۆن ئاسیایی و (٢) ملیۆن لەڕەگەزی تر، تائێستا (٤٣) سەرۆك سەرکردایەتی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکای کردووە، کە چوار ساڵ جارێك هەڵدەبژێررێت، جگە لەسەرۆك کۆمار دوو ئەنجومەنی (نوێنەران و پیران) هەیە کە دوو ساڵ جارێك بەهەڵبژاردن نوێ دەکرێنەوەو دەسەڵاتەکانی سەرۆك سنوردار دەکەن، لەئەمریکا جیاوازی کۆمەڵایەتی و ئابوری زۆر زەقە، بۆ نمونە (١٠٪)ی دەوڵەمەندەکانی ئەمریکا خاوەنی (٧٠٪)ی سامانی ئەو وڵاتەن، لەبەرامبەردا (٣٠) ملیۆن هاوڵاتی ئەمریکی هەژار هەیە، کەتەنها خاوەنی (١٪)ی ئەو سامانە نەتەوەییەن، ئەمریکا نەتەوەیەکی دیندارەو

- ١٩٤٦ سەربەخۆیی (فلیپین) لەئەمریکا.
- ١٩٩٢ ڕاگەیاندنی یەکەمین کابینەی (حکومەتی هەرێمی کوردستان)[1].
- ١٩٩٧ کەشتی ئاسمانی (پاپ ڤایندەر)ی ئەمریکی لەسەر مەریخ نیشتەوە.

---

لەدەستوردا نەتەوە لەژێر پارێزگاری خوادایەو، دراوی نەتەوەیی دۆلار دروشمی (بڕوامان بەخوایە)ی پێوەیە، لەئەمریکا (٣٠٠) هەزار کڵێسا هەیەو (٦٠٪)ی ئەمریکاییەکان سەردانی کڵێسا دەکەن، زۆربەی ئاینەکانی جیهان لەئەمریکا هەیە، مەسیحیەکان بەپلەی یەکەم کە (١٨٠) ملیۆنیان پرۆتستانت و (٦٠) ملیۆنیان کاسۆلیکن، هەروەها (٦) ملیۆن جولەکەو (٥) ملیۆن موسڵمان لەو وڵاتەدا هەیە.

[1] – لەدوای هەڵبژاردنی ١٩ی ئایاری (١٩٩٢)، بۆ یەکەم جار پەرلەمانی کوردستان لە ١٩٩٢/٦/٤ کۆبۆوەو یەکەم کابینەی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستانیش بەسەرۆکایەتی بەڕێز (د. فوئاد مەعسوم) لە ١٩٩٢/٧/٤ پێك هێنرا، ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان زیاتر لە (٤) ملیۆن کەسەو زۆرینەیان کوردن و لەگەڵ کەمایەتی عەرەب و تورکمان و ئاشووری، هەرێمی کوردستان بەشێوەیەکی گشتی ناوچەیەکی شاخاویەو لەلایەن وڵاتەکانی عێراق و ئێران و تورکیاو سوریاوە دەورەدراوە، زۆرینەی دانیشتوانی کوردستان موسڵمانن کەنزیکەی (٩٠٪) پێك دەهێنن لەگەڵ کەمایەتیە ئایینیەکانی تری وەك (مەسیحی و یەزیدی و کاکەیی و..)، دووەم کابینەی حکومەت لەنیسانی (١٩٩٣) لەلایەن بەڕێز (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)یەوە پێکهێنرا، باری ئابووری کوردستان لەدوای جێبەجێکردنی بڕیاری (٩٨٦)ی ئەنجومەنی ئاسایش بەرەوپێش چوونێکی باشی بەخۆیەوە بینی، بەڵام زۆری نەخایاند شەڕی ناوخۆی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان حکومەتی هەرێمی کرد بە دوو پارچەوە، حکومەتێك لەهەولێر لەلایەن پارتیەوە پێکهێنراو، حکومەتێکیش لەسلێمانی لەلایەن یەکێتیەوە، پاشتر لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراق، هەردوو حکومەتەکە لەساڵی (٢٠٠٥) یەکیان گرتەوەو بەسەرۆکایەتی بەڕێز (نێچیرڤان بارزانی) پێنجەم کابینەی حکومەت پێکهات.

## * ٧/٥

- ١٩٤٤ كۆچی دوایی شاعیر مامۆستا (عەبدولواحید نوری).
- ١٩٦١ كۆچی دوایی مامۆستا (مەلا سەعید صدقی كابان).
- ١٩٦٢ سەربەخۆیی (جەزائیر) لەفەڕەنسا.
- ١٩٩٨ كۆچی دوایی (حیلمی عەلی شەریف) لەبەغداد[1].

## * ٧/٦

- ١٨٨٥ (لویس پاستۆر) بۆ یەكەم جار توانی كوتانی دژی نەخۆشی (دەردەسەگ) بەكاربهێنێ.
- ١٨٩٣ كۆچی دوایی نووسەری فەڕەنسی (مۆپاسان)[2].

---

[1] – حیلمی عەلی شەریف، لەساڵی (١٩٣١) لەگوندی دەرگەزێنی شاری سلێمانی لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەسلێمانی و دواناوەندی لەبەعقوبە تەواوكردووەو بەشداری لەبزووتنەوەی قوتابیاندا كردووە، دوای ئەوەی (پارتی دیموكراتی كوردستان) مۆڵەتی فەرمی وەرگرت، لەرۆژنامەی (خەبات)دا كاری كردووە، بەشداری شۆڕشی ئەیلولی كردووە، لەشەستەكاندا بووە بەئەندامی مەكتەبی سیاسی پارتی، ساڵی (١٩٦٧) بووە بەخاوەن ئیمتیازو سەرپەرشتیاری گۆڤاری (النور)، لەناوەڕاستی حەفتاكاندا كۆلێژی زانستە سیاسیەكانی تەواو كردووە، شەوی ١٩٩٨/٧/٥\٤ كۆچی دوایی كردووەو لە(گردی سەیوان) لەسلێمانی بەخاك سپێرراوە.

[2] – (هێنری رینیە ئەلبێرگی دی مۆپاسان)، یەكێكە لەداهێنەرانی (كورتە چیرۆك) لەفەڕەنسا، ساڵی (١٨٥٠) لەناوچەی (نۆرماندی) لەدایكبووە، پاشان بۆخوێندن ڕوویكردۆتە پاریس، ساڵی (١٨٨٠) یەكەم چیرۆكی نووسی بەناوی (تۆپی چەوری) كەباسی ڕووداوەكانی جەنگی (١٨٧٠)ی نێوان (فەڕەنساو پرووسیا) دەكات، هەر لەو ساڵەدا دیوانێكی شیعری و شانۆگەرییەكی نووسیوە، لە (١٠) ساڵی كۆتایی تەمەنیدا، نزیكەی (٢٨٠) كورتە چیرۆك و (٧) ڕۆمانی نووسیوە، ساڵی (١٨٩٣) بەنەخۆشی كۆچی دوایی كردووە.

- ١٩٢٣ بەفەرمی (یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەت) دامەزرا.
- ١٩٦٤ سەربەخۆیی (مالاوی) لەبەریتانیا.
- ١٩٧٥ سەربەخۆیی (دوورگەکانی قەمەر) لەفەڕەنسا.

## * ٧/٧

- ١٩٣٧ بەریتانیا کتێبە سپیەکەی دانا کەتایبەت بوو بەدابەشکردنی فەلەستین.
- ١٩٧٨ سەربەخۆیی (دوورگەکانی سولەیمان) لەبەریتانیا.

## * ٧/٨

- ١٨٨٢ کۆچی دوایی شاعیری ئینگلیزی (شیللی).
- ١٩٧٢ (غەسانْ کەنەفانی) فەلەستینی تیرۆرکرا.
- ٢٠٠٣ چاپکردنی دراوی نوێی عێراقی[١].

---

[١] - بەپێی باری ڕامیاری و خواستی دەسەڵاتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق لە ١٩٣٠/٣/١٧ تاکو ٢٠٠٣/٧/٨ (١٤) جار دراوی عێراقی لەچاپدراوە، بەم شێوەیە:
دوای هاتنی ئینگلیزەکان بۆ عێراق لە ١٩٣٠/٣/١٧ (ئەنجومەنی نوێنەران) پێشنیازی (هلتۆن یۆنگ)ی پەسەند کرد بەپێکهێنانی لیژنەیەك بۆ دروستکردنی دراوی عێراقی، بەپێی یاسای ژمارە (١٤)ی ساڵی (١٩٣١)، لە ١٩٣٢/٤/١ یەکەم دراوی عێراقی دەرچوو کەوێنەی مەلیك فەیسەڵی لەسەر بوو، وە لە ١٩٣٤/١١/٢٩ چاپی دووەم دەرچوو کەوێنەی مەلیك غازی لەسەربوو، لەسەردەمی مەلیك فەیسەڵی دووەمدا (٥) جار دراوی عێراقی کە (دینار) بوو بەناوی (حکومەتی عێراقی)یەوە چاپکراو وێنەی (مەلیك فەیسەڵ)ی لەسەربوو لەساڵەکانی (١٩٤١، ١٩٤٢، ١٩٥٠، ١٩٥٢، ١٩٥٥)، لە ١٩٥٩/٢/٥ چاپی هەشتەمی دراوی عێراقی دوای شۆڕشی (١٤)ی تەمووز لەلایەن (بانکی ناوەندی عێراقی)یەوە دەرچوو، لە ١٩٥٩/٧/٨ چاپی نۆیەم دەرچوو، چاپی دەیەم لە ١٩٦٨/٩/٢٨ دەرچوو، کە بۆ یەکەم جار بوو دراوی عێراقی لایەنی ئاوەدانکردنەوەو مێژووی عێراقی لەسەر ڕووەکانی بێت، لە

## * ٧/٩

- ١٤٠١ (تەیموری لەنگ) بەغدادی داگیرکرد.
- ١٨١٦ سەربەخۆیی ئەرجەنتین لەئیسپانیا.
- ١٩٤٨ کۆچی دوایی نووسەری کورد (محەمەد ئەمین زەکی بەگ)[١].

---

١٩٦٩/٧/٢٧ چاپی پانزەیەم دەرچوو، چاپی دوانزەیەم لە (١٩٧٦) دەرچوو کە (٢٥ دیناریەکە لەرووی یەکەمی وێنەی (سێ ئەسپ)و لە ڕووەکەی تری (کۆشکی عەبباسی لەسەربوو، چاپی سیانزەیەم لەدوای ساڵی (١٩٩٠) ڕژێمی ڕووخاوی (سەدام حسێن دەریکردو وێنەی خۆی لەسەر دانا کە بە (دیناری چاپ) ناسرا، دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدا چاپی چواردەیەمی دراوی عێراقی چاپکراوی بەریتانی لە (٢٠٠٣/٧/٨) چاپکراو لە ٢٠٠٣/١٠/١٥ کەوتەکار، کە (١٥٠) دینار بەرامبەر (١)دیناری چاپی سویسری بوو.

[١] – ئەمین زەکی بەگ کوری عەبدولڕەحمان مەحمود، ساڵی (١٨٨٠) لەگەڕەکی گۆیژە شاری سلێمانی لەدایك بووە، سەرەتای خوێندنی لەحوجرە دەست پێکردووە، پاشان قوتابخانەی سەرەتایی و ڕوشدیەی عەسکەری تەواوکردووە، دوای ئەوەش قوتابخانەی عەسکەری لەبەغداد تەواو دەکات و، بۆخوێندنی زیاتر دەچێتە ئەستەنبوڵ و قوتابخانەی (حەربی) تەواودەکات و دەبێت بەئەفسەر لەسوپای عوسمانیدا، پێش دەستپێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤–١٩١٨) لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی تردا نێردراوە بۆ فەڕەنسا، ساڵێك لەوێ ماوەتەوەو سەردانی چەند وڵاتێکی ئەورووپی کردووە، لەتەمووزی (١٩٢٥) بووە بەنوێنەری شاری سلێمانی لەپەرلەمانی عیراقی ئەوکاتەدا، تاڕۆژی کۆچکردنی لە ١٩٤٨/٧/٩ وەك ئەندامی (ئەنجومەنی پیران)ی عیراقی ماوەتەوە، هەر لەساڵی (١٩٢٥)دا کتێبێکی بەناوی (تقریر عن الجیش العراقی) لەبەغدا بڵاوکردۆتەوە، لەماوەی ساڵانی (١٩٢٥–١٩٤٢) زیاد لە دە جار پۆستی وەزیری لەعێراقدا وەرگرتووە، ساڵی (١٩٣١) کتێبە بەناوبانگەکەی (کوردو کوردستان)ی دەرکردووە، هەروەها کتێبی (مشاهر کرد) لەدوو بەرگدا (مێژووی شاری سلێمانی)و (مێژووی وڵات و میرنشینەکانی کورد)و چەند نووسراوێکی تر بەکوردی و تورکی و عەرەبی.

- ١٩٨٣ کۆچی دوایی گۆرانی بێژی کورد (حەسەن جەزراوی).

- ٢٠٠٦ یاری کۆتایی جامی جیهانی ٢٠٠٦ی ئەڵمانیا لەنێوان فەڕەنساو ئیتاڵیا بەسەرکەوتنی ئیتاڵیا کۆتایی هات.

- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی (د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف) لەسلێمانی.

## * ٧/١٠

- ١٩٩٩ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (پشووی کوردستانی نوێ).

- ٢٠٠٣ دەستگیرکردنی (م. عەلی باپیر) لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە.

## * ٧/١١

- ڕۆژی جیهانی دانیشتوان.

- ١٨٤٨ لەدایکبوونی بیریاری ئیسلامی (محەمەد عەبدە)[١].

---

[١] - محەمەد عەبدە بیریاری میسری و قوتابی سەید جەمالەدینی ئەفغانی، لەساڵی (١٨٤٨) لەمیسر لەدایکبووە، سەرەتا لەشاری (طنطا) دەستی بەخوێندن کردووەو دواتر لەزانکۆی ئەزهەر وەرگیرا لەساڵی (١٨٥٦)، بەڵام پاش دووساڵ وازی لەئەزهەر هێنا بەهۆی شێوازی وانەوتنەوەی ئەو ناوەندە، پاش ئەوە دەستی کرد بەخوێندنەوەی هزری و فەلسەفی، ساڵی (١٨٧٦) جارێکی تر وەك مامۆستا گەڕایەوە (ئەزهەر)، پاش داگیرکردنی میسر لەلایەن بەریتانیاوەو بەتۆمەتی یارمەتیدانی شۆڕشگێڕان بۆماوەی سێ ساڵ لەوڵات دوورخرایەوە، پاش ئەوە پەیوەندی کرد بە مامۆستاکەی (سەید جەمالەدینی ئەفغانی)و لەپاریس گۆڤاری (العروة الوثقى)یان دەرکرد، عەبدە پاش چوونی بۆ ئینگلتەراو بەیروت گەڕایەوە میسرو لەساڵی (١٨٨٨) چەند پۆستێکی داوەری وەرگرت، پاشتریش گەیشتە پلەی موفتی گەورەی میسر، محەمەد عەبدە بەهزرە ڕیفۆرمیەکانی لەهەوڵی بەرگری لەئیسلامدا بوو، وە زۆرداری ناوخۆو ئیمپریالیزمی دەرەکی بەهۆکاری دواکەوتوویی موسڵمانان دەزانی، لەڕوانگەی عەبدەوە شەرع و عەقڵ پەیوەندیەکی گونجاویان هەبوو، هەروەك لەنێوان ئایین و سیاسەتدا پەیوەندیەکی قووڵی دەبینی، گرنگترین بەرهەمەکانی بریتین لە: (شرح نهج البلاغة، رسالة التوحيد، الاسلام مع العلم والمدنية، تفسير المنار، دروس من القران، ...).

- ١٩٢١ سەربەخۆیی (مەنگۆلیا) لەچین.
- ١٩٥٢ کۆچی دوایی مێژوونووسی کورد (محەمەد عەلی عەونی)[1].
- ١٩٦٢ بۆ یەکەم جار لەجیهاندا پەخشی تەلەفزیۆنی ئاسمانی کرا لەڕێگەی مانگی دەستکرد.

## * ٧/١٢

- ١٩٧٥ کۆچی دوایی شاعیرو زانای کورد (شێخ موراد زەنگەنە).
- ١٩٩٨ کۆچی دوایی مامۆستا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار)[2].

---

[1] – محەمەد عەلی عەونی، ساڵی (١٨٩٧) لەشاری (سویرەك)ی سەر بەپارێزگای دیاربەکر لەدایك بووە، پلەی یەکەم و دووەمی خوێندن لەتورکیا تەواو دەکات و بۆ فێربوونی زانستی ئایینی و عەرەبی دەچێتە میسرو خوێندن لە (ئەزهەر) تەواو دەکات، پاشان لەگەڵ بنەماڵەی بەدرخانیەکاندا بەشداری دەکات لەدامەزراندنی (کۆمەڵەی خۆیبوون)، لەبەر هەڵوێستی سیاسی دەسەڵاتدارانی ئەو کاتەی تورکیا نەیانهێشتووە بگەڕێتەوە بۆ تورکیاو لەمیسر نیشتەجێ بووە، (محەمەد عەلی عەونی) کتێبی (شەرەفنامە)ی وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی عەرەبی، لەگەڵ وەرگێڕانی بەشی زۆری نووسینەکانی (ئەمین زەکی بەگ) بۆ عەرەبی، هەروەها گەلێك نووسراوی بەنرخی لەسەر کوردستان نووسیوە، لەوانە (القضیة الکردیة) بەناوی (بلەچ شێرکۆ)، لە ١١ی تەموزی (١٩٥٢) لەقاهیرە کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێش نێژراوە.

[2] – مامۆستا ئیبراهیم ئەمین باڵدار، ساڵی (١٩٢٠) لەسلێمانی لەدایکبووە، لەساڵانی چلەکان بووە بەمامۆستای سەرەتایی، بۆ یەکەم جار لەمێژووی گەلی کورددا (ئەلف و بێی کوردی) داناوە بۆ پۆلی یەکەمی سەرەتایی کە زیاتر لەنیو سەدە منداڵانی کورد لەسەری فێردەکران، پاشان گوێزراوەتەوە بۆ وەزارەتی پەروەردە لەبەغدادو دواتر چووە بۆ ئەمریکاو لەوێ ماستەری وەرگرتووەو لەزانکۆی بەغداد بووە بەمامۆستا، لە تەمووزی (١٩٩٨) لەبەغداد کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٩٨ فەرەنسا بۆ یەکەم جار بووە پاڵەوانی جیهان، دوای ئەوەی بەئەنجامی (٣-٠) لەبەرازیلی بردەوە.

# * ٧/١٣

- ١٩٨٩ تیرۆرکردنی (د. عەبدولڕەحمان قاسملۆ) سکرتێری (پ.د.ک)ی ئێران لەڤییەننا.
- ١٩٩٥ کۆچی دوایی زانای کۆمەڵناسی عێراقی (د. عەلی وەردی).
- ٢٠٠٣ دامەزراندنی (ئەنجومەنی حوکم) لەعێراق.

# * ٧/١٤

- ١٧٨٩ شۆڕشی فەرەنسا.
- ١٩١٩ ڕاپەڕینی ئامێدی.
- ١٩٥٨ شۆڕشی چواردەی تەمموزی عێراق و ڕووخانی ڕژێمی پادشایەتی[1].

---

[1] - سەردەمی پاشایەتی لەعێراق لە(مەلیك فەیسەڵی یەکەم)ەوە دەست پێ دەکات کەلەساڵی (١٩٢١) بوو بەپاشای عێراق، وە کۆتایی دێت بە کوڕەزاکەی (مەلیك فەیسەڵی دووەم) لەساڵی (١٩٥٨)، ئەویش بەهۆی ئەو شۆڕشەی کە ئەفسەرانی ئازادیخواز (ضباط الاحرار) پێی هەستان کەبریتی بوون لە (١٥) ئەفسەر بەسەرۆکایەتی زەعیم ڕوکن (عەبدولکەریم قاسم) و عەقید ڕوکن (عەبدولسەلام عارف)، وەتوانیان لە ١٤ی تەمووزی (١٩٥٨)دا کۆتایی بەدەسەڵاتی پادشایەتی بهێنن و (عەبدولکەریم قاسم) وەك سەرکردەی هێزە چەکدارەکان بەیانی شۆڕشی بڵاوکردەوەو خۆی وەك سەرکردەی یەکەمی شۆڕشەکە ناساند، وە هەر لەو ڕۆژەدا هەریەك لە (مەلیك فەیسەڵی دووەم)و (عەبدولئیلاه)ی خاڵی کوژران و تەرمەکانیان بەناو بەغدادا ڕاکێشرا، (نوری سەعید)یش کە سەرۆك وەزیرانی ڕژێمی پاشایەتی بوو، پاش هەڵهاتنی لەکۆشکەکەی خۆی کەلە گەڕەکی (کەرخ) بوو، خۆی دەشارێتەوەو ڕۆژی دواتر ئاشکرادەبێت و دەکوژرێت و تەرمەکەی دەبرێت بۆ وەزارەتی

- ١٩٧٤ کۆچی دوایی هونەرمەند (ڕەشۆڵ).

**٧/١٥ ***

- ١٠٩٩ شاری قودس کەوتە ژێردەستی خاچپەرستەکان.
- ١٩٠٤ کۆچی دوایی نووسەری ڕووسی (چیخۆف).
- ١٩٤٨ دەرچوونی بڕیاری ژمارە (٥١)ی ئەنجومەنی ئاسایش سەبارەت بەفەلەستین.
- ١٩٥١ کۆچی دوایی نووسەری کورد (میر جەلادەت بەدرخان).
- ١٩٨٩ کۆچی دوایی زانای خواناسی کورد (شێخ محەمەدی خاڵ)[١].

---

بەرگری و شەو بەدزیەوە دەنێژرێت، بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی تەرمەکەی دەردەهێنرێتەوەو بەهەمان شێوەی مەلیك و خاڵی ڕایدەکێشن، بەم جۆرە دەسەڵاتی پاشایەتی لەعێراقدا کۆتایی پێهات، بەڵام دواتر بەهۆی ناکۆکی لەنێوان سەرکردەکانی شۆڕشدا عێراقی کۆماری نەگەیشتە کەناری ئارام.

[١] - شێخی خاڵ، شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەلی حاجی شێخ ئەمینی خاڵە،ساڵی (١٩٠٤) لەناو بنەماڵەیەکی دینداری شاری سلێمانیدا چاوی هەڵهێناوە، سەرەتا لای باپیری خوێندویەتی، زانستە شەرعیەکانیشی لەلای هەرسێ زانای بەناوبانگی ئەوکاتە (شێخ عومەری قەرەداغی)و (شێخ جەلالی قەرەداغی)و (مەلا حسێنی پیسکەندی) وەرگرتووە، ساڵی (١٩٣١) بەفەرمانی ڕەسمی کراوە بە پێشنوێژو وانەبێژی مزگەوتەکەی باپیری (شێخ ئەمینی خاڵ)، ساڵی (١٩٣٩) لەتاقیکردنەوەیەکی وەزارەتی دادا بۆ پۆستی قازیێتی بەیەکەم دەرچووەو، بەفەرمانی شاهانە بووە بەقازی هەڵەبجەو تا ساڵی (١٩٦٧) لەپیشەکەیدا ماوەتەوە، لەو ماوەیەدا لەهەڵەبجەو چەمچەماڵ و سلێمانی و کەرکوك و موسڵ قازی بووە، لەساڵی (١٩٦٢) کراوە بەئەندامی دادگای پێداچوونەوەی شەرعی لەبەغداد، لە (١٩٦٧) خانەنشین کراوە.

ساڵی (١٩٥٣) بووە بەئەندامی کۆڕی زانیاری عێراق و، لە (١٩٧٢) بووە بەجێگری سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد، شێخی خاڵ (٥٥) ساڵی بەردەوام خزمەتی ئەدەب و کەلەپورو مێژوو و

## * ٧/١٦

- ١٩٢٥ یەکەم کۆوونەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی کەتیایدا مێژوونووسی کورد (محەمەد ئەمین زەکی) بەجێگری سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران هەڵبژێردرا.
- ١٩٥٠ ئۆرۆگوای بەئەنجامی (٢-١) لەهەڵبژاردەی بەڕازیلی بردەوەو بۆ دووەم جار جامی جیهانی بەدەستهێنا.
- ١٩٧٠ دەرچوونی دەستوری کاتی کۆماری عێراق لەلایەن (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ەوە.
- ١٩٧٩ (سەدام حسێن) بوو بەسەرۆك کۆماری عیراق.

## * ٧/١٧

- ١٩٦٨ شۆڕشی حەڤدەی تەمووز لەعێراق.
- ١٩٨١ کۆچی دوایی هونەرمەند (قادر زیرەك).

---

زمان و کاروباری ئایینی میللەتەکەی کردووە، بەعەرەبیش نوسیویەتی، گەورە پیاوانی کوردی بەعەرەب ناساندووە، ساڵی (١٩٨٧) خەڵاتی (یەکێتی مێژوونووسانی عەرەب)ی لەسەر ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە لەگۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراقدا بەناونیشانی (میرنشینی ئەفراسیاب و ئەڵقەیەکی ون لەمێژووی بەسرە) لەساڵی (١٩٦١)دا پێی بەخشراوە، ساڵی (١٩٨٠) (کۆڕی زانیاری عەرەبی ئەردەنی) شێخی خاڵی بەئەندامی یاریدەدەر بۆ کۆڕی ناوبراو هەڵبژاردووە.

شێخی خاڵ خاوەنی چەندین بەرهەمی چاپکراوە لەوانە: (تەفسیری خاڵ (٧ جزم)، پەندی پێشینان، ناڵەی دەروون (٢ بەرگ)، فەرهەنگی خاڵ (٣ بەرگ)، پێشگرو پاشگر، ڕێزمانی کوردی، موفتی زەهاوی، سەید جەمالەدینی ئەفغانی، باباتاهیری هەمەدانی، مەلا محمدی خاکی، سۆزی مینبەر، چەندین کتێب و نووسراوی تر بەکوردی و عەرەبی).

- ١٩٩٤ (هەڵبژاردەی بەڕازیل) بەلێدانی یەکلاکەرەوە لە(هەڵبژاردەی ئیتاڵیا)ی بردەوەو بووە پاڵەوانی جیهان.

## * ٧/١٨

- ١٩٧٣ کۆچی دوایی هونەرمەندی مۆسیقار (حەسەنی نەی).
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی شاعیری کورد (ڕەمزی مەلا عارف).
- ١٩٩٨ (نێڵسن ماندێلا) لەتەمەنی (٨٠) ساڵیدا ئاهەنگی بووك گواستنەوەی سازکرد.

## * ٧/١٩

- ١٩٢٤ کۆچی دوایی عادیلەخانی هاوسەری وەسمان پاشای جاف[١].
- ١٩٨٣ دامەزراندنی (پارتی ڕەفاهی ئیسلامی) لەتورکیا.
- ١٩٩٣ بەردێك درایە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی کەمێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٤٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر، کەدەقێکی شاهانەی لەسەر نوسراوە بەخەتی بزماری.

---

[١] - (عادیلە خانم) کچی عەبدولقادر بەگی ساحێبقرانە، یەکێکە لەسەرکردەکانی خێڵی (جاف)، ساڵی (١٨٥٩) لە (سنە) لەدایکبووە، پاش کۆچی دوایی (مەحموود پاشای جاف) سەرکردایەتی هۆزی جافی گرتۆتە ئەستۆ، لە (١٨٩٥)دا شووی کردووە بە (وەسمان بەگی جاف)و وەسمان بەگ لەبەڕێوەبردنی هۆزەکەیدا یارمەتی عادیلە خانمی داوە، سنووری دەسەلاتی عادیلە خانم ئەردەلانیشی گرتبۆوە، هەمیشە جێی ڕێزو خۆشەویستی هۆزەکەی بووە، جڵەوی گرتۆتە دەست و بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بەڕێوەی بردووە، دادپەروەرانە کاروباری هەڵدەسوڕان، بەبێ ڕاوێژی ئەم هیچ فەرمانێکی میری جێبەجێ نەدەکرا، کەئینگلیزەکان هاتنە کوردستانەوە بۆ ڕێزلێگرتنی نیشانەیەکی سەربازیان بەخەڵات پێداوە، لەشاری هەڵەبجەدا خانووبەرەو بازاڕێکی دروست کردووە، لە ساڵی (١٩٢٤) لەهەڵەبجە کۆچی دوایی کردووەو لە (عەبابەیلێ) نێژراوە.

## ٧/١٦ *

- ١٩٢٥ یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی کەتیایدا مێژوونووسی کورد (محەمەد ئەمین زەکی) بەجێگری سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران هەڵبژێردرا.
- ١٩٥٠ ئۆرۆگوای بەئەنجامی (٢-١) لەهەڵبژاردەی بەرازیلی بردەوەو بۆ دووەم جار جامی جیهانی بەدەستهێنا.
- ١٩٧٠ دەرچوونی دەستوری کاتی کۆماری عێراق لەلایەن (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ەوە.
- ١٩٧٩ (سەدام حسێن) بوو بەسەرۆك کۆماری عیراق.

## ٧/١٧ *

- ١٩٦٨ شۆڕشی حەڤدەی تەمووز لەعێراق.
- ١٩٨١ کۆچی دوایی هونەرمەند (قادر زیرەك).

---

زمان و کاروباری ئایینی میللەتەکەی کردووە، بەعەرەبیش نووسیویەتی، گەورە پیاوانی کوردی بەعەرەب ناساندووە، ساڵی (١٩٨٧) خەڵاتی (یەکێتی مێژوونووسانی عەرەب)ی لەسەر ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە لەگۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراقدا بەناونیشانی (میرنشینی ئەفراسیاب و ئەڵقەیەکی ون لەمێژووی بەسرە) لەساڵی (١٩٦١)دا پێ بەخشراوە، ساڵی (١٩٨٠) (کۆڕی زانیاری عەرەبی ئەردەنی) شێخی خاڵی بەئەندامی یاریدەدەر بۆ کۆڕی ناوبراو هەڵبژاردووە.

شێخی خاڵ خاوەنی چەندین بەرهەمی چاپکراوە لەوانە: (تەفسیری خاڵ (٧ جزم)، پەندی پێشینان، ناڵەی دەروون (٢ بەرگ)، فەرهەنگی خاڵ (٣ بەرگ)، پێشگرو پاشگر، ڕێزمانی کوردی، موفتی زەهاوی، سەید جەمالەدینی ئەفغانی، باباتاهیری هەمەدانی، مەلا محمدی خاکی، سۆزی مینبەر، چەندین کتێب و نووسراوی تر بەکوردی و عەرەبی).

- ١٩٩٤ (هەڵبژاردەی بەڕازیل) بەلێدانی یەکلاکەرەوە لە(هەڵبژاردەی ئیتاڵیا)ی بردەوەو بووە پاڵەوانی جیهان.

## * ٧/١٨

- ١٩٧٣ کۆچی دوایی هونەرمەندی مۆسیقار (حەسەنی نەی).
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی شاعیری کورد (ڕەمزی مەلا عارف).
- ١٩٩٨ (نێلسن ماندێلا) لەتەمەنی (٨٠) ساڵیدا ئاهەنگی بووك گواستنەوەی سازکرد.

## * ٧/١٩

- ١٩٢٤ کۆچی دوایی عادیلەخانی هاوسەری وەسمان پاشای جاف[١].
- ١٩٨٣ دامەزراندنی (پارتی ڕەفاهی ئیسلامی) لەتورکیا.
- ١٩٩٣ بەردێك درایە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی کەمێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٤٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر، کەدەقێکی شاهانەی لەسەر نوسراوە بەخەتی بزماری.

---

١ – (عادیلە خانم) کچی عەبدولقادر بەگی ساحێبقڕانە، یەکێکە لەسەرکردەکانی خێڵی (جاف)، ساڵی (١٨٥٩) لە (سنە) لەدایکبووە، پاش کۆچی دوایی (مەحموود پاشای جاف) سەرکردایەتی هۆزی جافی گرتۆتە ئەستۆ، لە (١٨٩٥)دا شووی کردووە بە (وەسمان بەگی جاف)و وەسمان بەگ لەبەڕێوەبردنی هۆزەکەیدا یارمەتی عادیلە خانمی داوە، سنووری دەسەلاتی عادیلە خانم ئەردەلانیشی گرتبۆوە، هەمیشە جێی ڕێزو خۆشەویستی هۆزەکەی بووە، جڵەوی گرتۆتە دەست و بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بەڕێوەی بردووە، دادپەروەرانە کاروباری هەڵدەسوڕان، بەبێ ڕاوێژی ئەم هیچ فەرمانێکی میری جێبەجێ نەدەکرا، کەئینگلیزەکان هاتنە کوردستانەوە بۆ ڕێزلێگرتنی نیشانەیەکی سەربازیان بەخەڵات پێداوە، لەشاری هەڵەبجەدا خانووبەرەو بازاڕێکی دروست کردووە، لە ساڵی (١٩٢٤) لەهەڵەبجە کۆچی دوایی کردووەو لە (عەبابەیلێ) نێژراوە.

## * ٧/٢٠

- ١٧٢٨ کۆچی دوایی زانای فیزیایی (ئیسحاق نیوتن).
- ١٨١٠ سەربەخۆیی (کۆلۆمبیا) لەئیسپانیا.
- ١٨٨٠ کۆچی دوایی داهێنەری هێزی کارەبا (ڤۆڵت).
- ١٩٣٧ کۆچی دوایی داهێنەری ڕادیۆ (مارکۆنی)[١].
- ١٩٥٧ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (هیوا) لەبەغداد بە کوردی و عەرەبی.
- ١٩٩٢ کۆچی دوایی شاعیری کورد (عەونی) لەتەمەنی ٧٨ ساڵیدا.
- ١٩٩٥ دامەزراندنی (لیژنەی ئۆلۆمپی کوردستان).

## * ٧/٢١

- ١٧٨٩ هێزەکـانی فەڕەنـسا بەسـەرکردایەتی (نـاپلیۆن پۆناپـارت) قاهیرەی پایتەختی میسریان داگیرکرد.
- ١٩٢٢ دامەزرانـدنی (کۆمەڵـەی کوردسـتان) بەسـەرۆکایەتی (مـستەفا پاشای یامولکی).

---

[١] – مـارکۆنی لـە ٢٥ی نیـسانی سـاڵی ١٨٧٤ لـەئیتاڵیا لـەدایکبووە، مـارکۆنی فیزیـازان و داهێنەرێکی ئیاڵی بووەو ئەکادیمیای تەکنەلۆژی لەشاری (لیڤۆرنۆ) تـەواوکردووە، مـارکۆنی لەساڵی (١٨٩٠)ەوە خەریکی شەپۆلە ڕادیۆییەکان و بروسکەی بێ تەل بـووە، سـاڵی ١٨٩٧ لەئینگلتەرە کۆمپانیای بروسـکەی بێتـەل و سـیگناڵی دامەزرانـد، سالـچی ١٨٩٨ تـوانی بـۆ دووری (٣٢) میلەوە سیگناڵەکانی بگەیەنێت، لەساڵی ١٩٠١دا توانی بۆ یەکەمین جار بەسەر ئۆقیانووسی (ئەتڵەتیک)دا سیگناڵی ڕادیۆیی بنێرێت، مارکۆنی لەسـەر تاپیکردنـەوەکانی بـۆ پەرەپێـدانی ڕادیـۆ بـەردەوام بـوو تـا لەکۆتاییـدا تـوانی نامـەکانی بەئاڕاسـتەی دیـاریکراو بەهەموو لایەکی جیهاندا بنێرێت، مارکۆنی لـە ٢٠ی تـەمووزی ١٩٣٧ بەنەخۆشـی دڵ لـەڕۆما کۆچی دوایی کردووە.

- ٢٠٠٣ دەسگیرکردنی عەلی حەسەن مەجید ناسراو بە (عەلی کیمیایی) لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانان لەشارۆچکەی سامەڕا.

## * ٧/٢٢

- ١٩٤٤ سەربەخۆیی پۆڵۆنیا.
- ١٩٤٩ کۆچی دوایی شاعیری کورد (بێدار)[١].
- ١٩٩٤ ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەی (پاریس) لەنێوان (یەکێتی و پارتی) بەسەرپەرشتی فەڕەنسا.
- ٢٠٠٣ کوژرانی هەردوو کوڕەکەی سەدام حسێن (عودەی و قوسەی) لەموسڵ.

## * ٧/٢٣

- ١٩٢٢ دەستگیرکردنی (شێخ مەحمودی حەفید) لەلایەن ئینگلیزەوە.
- ١٩٥٢ شۆڕشی یۆلیۆ لەمیسر.
- ١٩٨٠ کۆچی دوایی نوسەر (موحەڕەم محەمەد ئەمین).

---

[١] - بێدار، ناوی (شێخ بابەعەلی کوڕی عەبدوڵڵای شێخ عەلی شێخ لەتیفی شێخ سەلیمی هەنجیرانە)، زانایەکی ئایینی و شاعیرێکی نیشتمانپەروەری کوردە، ساڵی (١٨٩٤) لە (ئاوایی گەورە)ی سەر بە (خانەقین) لەدایکبووە، بەمنداڵی دەستی بەخوێندنی حوجرە کردووەن لە (١٢) ساڵیدا بۆ خوێندن چووە بۆ خانەقین، کاتێ باوکی کۆچی دوایی دەکات، بێدار واز لەخوێندن دەهێنێت و دەست دەکات بە کشتوکاڵ کردن، هەر بەمنداڵی دەستی بەشیعر هۆنینەوە کردووە، بۆتە ئەندامێکی چالاکی (پارتی هیوا)، (ڕەفیق حیلمی) نازناوی (بێدار)ی بەسەردا بڕیوە کوناوی نهێنیەتی لەناو پارتەکەیدا، بێدار زمانی فارسی و عەرەبی و تورکی زانیوەو بەهەموویان هۆنراوەی داناوە، شیعرەکانی ڕامیاری و نیشتمانپەروەری و ئایینی و دڵداری و کۆمەڵایەتییە، لەگۆڤاری (گەلاوێژ)دا بڵاوی کردوونەتەوە، ساڵی (١٩٤٩) کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٩٩ كۆچی دوایی (شاحەسەنی دووەم)ی پادشای مەغریب.

## * ٧/٢٤

- ١٩١٩ حزبی (تورکیای لاو) کودەتای کرد بەسەر خەلافەتی عوسمانی.
- ١٩٢٣ مۆرکردنی پەیمانی لۆزان[١].
- ١٩٧٧ کۆچی دوایی مامۆستا (گیوی موکریانی).
- ١٩٨١ کۆچی دوایی هونەرمەندی کورد (م. عەلی مەردان) لەبەغداد.
- ١٩٩٣ کۆچی دوایی زاناو نووسەر (م. عادل شیوخ) لەسلێمانی[٢].
- ٢٠٠١ خاتوو (مێگاواتی سۆکارنۆ) بوو بە سەرۆکی ئەندەنووسیا.

---

[١] – کۆنگرەی لۆزان، لەشاری (لۆزان)ی سویسرا بەسترا کە لە ١٩٢٢/١١/٢٠ بەستراو تا ١٩٢٣/٧/٢٤ بەردەوامبوو، لەو کۆنگرەیەدا (بەریتانیاو فەرەنساو ئیتاڵیاو یابان و ڕۆمان و یۆگسلاڤیاو یۆنان و تورکیا) بەشداربوون، تیایدا بڕیاری سەربەخۆبوونی تورکیا دراو مەسەلەی کوردی تیا فەرامۆشکراو بەندەکانی پەیمانی سیڤەریشی هەڵوەشاندەوەو هیچ شتێکی تایبەت بەکورد لەپەیماننامەکەدا نەهاتبوو.

[٢] – دکتۆر عادل شیوخ، لە (أبی الخصیب)ی بەسرە لەساڵی (١٩٤٦) لەدایکبووە، بەشی فیزیای لەزانکۆی بەغداد تەواو کردووەو پاش حەوت ساڵ لەوانەوتنەوە لەدواناوەندی بەسرە، توانی کۆلیژی دیراساتی ئیسلامی لەبەغداد تەواو بکات، لەگەڵ ئەوەی کە هەژار بووە، بەڵام توانیویەتی پلەی (ماستەر)یش لەفیزیادا بەدەست بهێنێت، پاش چەند ساڵێکی کەم توانی بڕوانامەی دکتۆرا لەفیزیادا لەلەندەن وەربگرێت، پاشان دکتۆر عادل چەند ساڵێك دەبێتە مامۆستا لەزانکۆی (ڕیاز) لەسعودیە، هەر لەوکاتانەدا توانی پلەی (ماستەر) لە (أصول الفقه)دا بەدەست بهێنێ، دکتۆر عادل بانگخوازو نووسەرێکی بەتوانای ئسلامی بوو کەجگە لە پەڕاوی (المسافر في قطار الدعوة) نۆ پەڕاوی دیکەی هەیە.
دکتۆر عادل لە ٢٤ی تەمووزی (١٩٩٣)دا لەکوردستان بەکارەساتی ئۆتۆمبیل لەڕێگەی سلێمانی – هەولێر لەلای (سوسێ) کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی (شێخ ئەحمەدی هندی) لەسلێمانی بەخاك سپێرراوە.

## * ٧/٢٥

– ١٩٤٣ ڕژێمی مۆسۆلۆنی لە(ئیتاڵیا) شکستی هێنا.

– ١٩٨٧ کۆچی دوایی نووسەر (م. محەمەد مەلا ساڵح شارەزووری)[١].

## * ٧/٢٦

– ١٨٤٧ سەربەخۆیی لیبیا.

– ١٨٨٦ لەدایکبوونی (جۆرج بەرناردشۆ).

– ١٩٥٦ خۆماڵیکردنی (نۆکەندی سوێس) لەمیسر.

– ١٩٦٥ سەربەخۆیی (ماڵدیڤ) لەبەریتانیا.

## * ٧/٢٧

– ١٩٢٢ دوا ژمارەی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) لەسلێمانی بڵاوکرایەوە.

– ١٩٥٨ دەستوری کاتی عێراق دەرچوو.

– ١٩٨٠ کۆچی دوایی (شا)ی ئێران لەیەکێك لەنەخۆشخانەکانی میسر.

– ١٩٩٧ کۆچی دوایی شاعیری گەورەی عەرەب (جەواهیری)[٢].

•

---

[١] – مەلا محەمەد مەلا صالح شارەزووری لەساڵی (١٩٤٦) لەگوندی (کەچەڵی) شارەزوور لەدایکبووە، سەرەتا لای باوکی و دواتر لەهەڵەبجە وانەی شەرعی خوێندووە، ساڵی (١٩٧١) پەیمانگای ئیسلامی تەواوکردووەو لەچەندین گوندو شارۆچکەدا مەلایەتی کردووە، چەند جارێك لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەستگیرکراوەو ئەشکەنجە دراوە، وتاربێژو نووسەرێکی بەتوانا بوو، چەند بەرهەمێکی چاپکراوی هەیە، لەوانە: (ڕێکەوت لەتەرازووی ژیریدا، سروشت لەتەرازووی ژیریدا، داروین لەتەرازووی ژیریدا، فرۆید لەتەرازووی ژیریدا،...).

[٢] – (محەمەد مەهدی جەواهیری)، لە ٢٦ی تەمووزی (١٨٩٩) لەشاری نەجەف لەدایکبووە، باوکی یەکێك بووە لەزانا ئاینییەکانی ئەو شارە، هەر لەمنداڵیەوە جەواهیری لەسەردەستی باوکی قورئانی پیرۆزی خوێندووەو چەندین شیعری کلاسیکی لەبەرکردووە، ساڵی (١٩١٧)

- ٢٠٠٠ كۆچی دوایی شاعیری كوردی ئێران (ئەحمەدی شاملۆ)[١].

---

باوكی كۆچی دوایی كردووە، دوای ئەوە جەواهیری ڕوویكردۆتە خوێندنەوەی كتێبی فەلسەفەو شیعری كلاسیك و نوێ، ساڵی (١٩٢٠) بەشداری شۆڕشی (بیست)ی كردووە لەعێراق، وە لەسەردەمی مەلیك فەیسەڵدا لەفەرمانگەی میریدا كاری كردووە، پاشان چووە بۆ بەغداو چەند ڕۆژنامەیەكی دەركردووە، لەوانە: (فورات، كودەتا، ڕای گشتی)، چەند جارێكیش پۆستی سەرۆكی (یەكێتی نوسەرانی عێراق)ی وەرگرتووە، ساڵی (١٩٢١) یەكەم شیعری خۆی بڵاوكردۆتەوە، یەكەم كۆمەڵە شیعری بەناوی (حلبة الادب) بڵاوكردۆتەوە، ساڵی (١٩٢٧) لە (كازمیە) بەمامۆستا دادەمەزرێت، ساڵی (١٩٣٥) (دیوانی جەواهیری) بڵاوكردۆتەوە، ساڵی (١٩٤١) پشتگیری بزافی مارسی كردووە، بەڵام بەهۆی شكستی ئەم بزافەوە چووە بۆ ئێران و دوای ماوەیەك گەڕاوەتەوە بۆ بەغداو ڕۆژنامەی (ڕای گشتی) دەركردووە، ساڵی (١٩٥٠) بەشداری كۆنگرەی ڕۆشنبیری كۆمكاری عەرەبی لەئەسكەندەریە كردو هەر لەهەمان ساڵدا بەنەقیبی ڕۆژنامەنووسانی عێراق و یەكێتی نووسەرانی عێراق دەست نیشانكرا، ساڵی (١٩٦١) بەناچاری عێراقی بەجێهێشت و چوو بۆ لوبنان و لەوێشەوە چوو بۆ (براغ)ی پایتەختی یۆگسلاڤیاو بۆ ماوەی (٧) ساڵ لەوێ مایەوە، ساڵی (١٩٦٥) كۆمەڵە شیعری (پۆستەی نامۆیی) بڵاوكردەوە، ساڵی (١٩٧١) سەرۆكایەتی وەفدی عێراقی كرد بۆ كۆنگرەی نووسەرانی عەرەب لەدیمەشق، هەر لەو ساڵەدا وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراقی كۆمەڵە شیعری (أیها الارق) و (خلجات)ی بۆ بڵاوكردەوە، ساڵی (١٩٧٣) بەشداری كۆنگرەی نوسەرانی عەرەبی لە (تونس) كرد، ساڵانی دواتر عێراقی بەجێهێشت و ڕوویكردە سوریاو لەوێ درێژەی بەچالاكیە هونەریەكانی خۆیدا تا لە ٢٧ی تەمووزی (١٩٩٧) كۆچی دوایی كرد.

[١] – ئەحمەدی شاملۆ لە ١٩٢٥/١٢/١٢ لەتاران لەدایكبووە، لەبەرپیشەی باوكی كەئەفسەر بووە زۆر شوێنی ئێران گەڕاوە، لەتەمەنی (١٧) ساڵیەوە تێكەڵاوی سیاسەت بووەو بەوهۆیەوە دەستگیر كراوەو سێ ساڵ لەزینداندا ماوەتەوە، ساڵی (١٣٢٦)ی كۆچی هەتاوی یەكەم كۆمەڵە شیعری خۆی بڵاوكردۆتەوە، ماوەیەك بۆتە سەرنووسەری گۆڤارەكانی (كتاب هفته)و (خوشه)و (كتاب جمعه)، شاملۆ داستان و بەسەرهاتی بۆ منداڵان تەرجەمە كردووە،

- ٢٠٠٧ یەکێتی و پارتی ڕێکەوتننامەیەکی ستراتیژیان ئیمزاکرد.

## ٧/٢٨ *

- ١٨٢١ سەربەخۆیی (پیرۆ) لەئیسپانیا.
- ١٩١٤ جەنگی جیهانی یەکەم دەستی پێکرد.

## ٧/٢٩ *

- ١٨٩٠ کۆچی دوایی وێنەکێشی هۆڵەندی (ڤان کوخ)[١].
- ٢٠٠٧ بۆ یەکەم جار (هەڵبژاردەی عێراق) جامی وڵاتانی ئاسیای بەدەستهێنا، کە بەئەنجامی (١-٠) لە(هەڵبژاردەی سعودیە)ی بردەوە.

## ٧/٣٠ *

- ١٩٣٠ یەکەم پاڵەوانێتی جامی جیهانی لەنێوان (ئۆرۆگوای و ئەرژەنتین) بەڕێوەچوو، یارییەکەش بەئەنجامی (٤-٢) لەبەرژەوەندی (ئۆرۆگوای) کۆتایی هات.

---

ساڵی (١٩٧٦) بۆ کۆڕی شیعر خوێندنەوە سەردانی ئەمریکای کردووە، پاشان چووە بۆ بەریتانیا دواتر گەڕاوەتەوە بۆ تاران و بووە بە ئەندامی هەیئەتی دەبیرانی نووسەرانی ئێران، ساڵی (١٩٨٩) خەڵاتی (Free Expression)ی لەنیویۆرک وەرگرتووە، ساڵی (١٩٩٩) خەڵاتی (ئیستیک داگرمن)ی سویدی پێبەخشراوە.

[١] - (ڤنسنت ڤان کوخ)، نیگارکێشی بەناوبانگی هۆڵەندایە، ساڵی (١٨٥٣) لەدایکبووە، لە (١٨٨٦) بۆ خوێندن ڕوویکردۆتە پاریس، سرووشت سەرچاوەی ئیلهامی بووە، تابلۆی (گوڵەبەڕۆژە) جوانترین تابلۆیەتی، کە لەدوای تابلۆی (مۆنالیزا)ی داڤنشی دێت، لەکۆتایی ژیانیدا تووشی نەخۆشی دەروونی بووەو هەر بەو هۆیەوە لە (١٨٩١)دا خۆی کوشتووە، پاش مردنی تابلۆکانی نرخی گەیشتە (١٠) ملیۆن دۆلار، لەتابلۆ بەناوبانگەکانی: (پەتاتە خۆرەکان، باخچەی ئارال، زنجیرەی ئەرلیزین، کێڵگەکانی گەنم کاتی خۆرئاوابوون).

**- ١٩٦٢ کۆچی دوایی (د. بەشیر موشیر) لەبەغداد.**

# * ٧/٣١

**- ١٨٥٩ کاتژمێری (بیگ بن) لەلەندەن کەوتەکار[١].**

**- ١٩٨٣ ئەنفال و بێ سەروشوێنکردنی (٨) هەزار (بارزانی) لە قوشتەپەو بەحرکە.**

---

[١] - بیگ بن ئەو کاتژمێرەی کەبەهۆی ڕادیۆی لەندەنەوە لەهەموو دنیاوە خەڵکی دەنگی دەبیستن، بۆ یەکەم جار لە ٣١ی تەمووزی (١٨٥٩) کەوتەکار، ئەم کاتژمێرە لەتاوەری باڵەخانەی پارلەمانی بەریتانی لەلەندەن دانراوەو درێژی هەر ڕوویەکی (٩) مەترەو گێشەکەی (٤) تەنە، جگە لەوەی کەکێشی زەنگەکەی (١٣,٥) تەنە، پێشی دەوترێت (بیگ بن) واتە (بنیامینی گەورە) چونکە دەگەڕێتەوە بۆ وەزیری کاروباری گشتی ئەوکاتەی بەریتانیا کە سەرپەرشتی دانانی ئەو کاتژمێرەی کرد ناوی (سێر بنیامین هۆل) بوو، (بیگ بن)یش وەك کورتەی ناوی ئەو وەزیرە خرایە سەرناوی کاتژمێرەکە، بۆ یەکەمجار لە ١٩٢٣/١٢/٣١ لەڕێگەی ڕادیۆی لەندەنەوە دەنگەکەی بەدونیادا بڵاوکرایەوە، ئەم کاتژمێرە بەهۆی زۆر وردی لەدەست نیشانکردنی کاتەکان ناوبانگی زۆری بۆ دروست بووەو لەکاتی دامەزراندنیشیەوە بەردەوام لەکاردا بووە تەنها چەند جارێك نەبێت لەبەر هۆی تایبەت لەکار وەستێنراوە، لەوانە:

١- لەساڵی (١٩٠٠) بەهۆی زریانی بەفرێکی زۆر بۆماوەی هەشت کاتژمێر وەستا.

٢- ساڵی (١٩١٠) لەماوەی ئەسپاردنی تەرمی (شا ئەدواردی حەوتەم) بەتەنیا دەنگەکەی لەلێدان وەستێنرا، وەك ڕێزلێنان لەتەرمی شا، کە ئەوە لەکاتی ئەسپاردنی تەرمی هەردوو شا (جۆرجی پێنجەم و شەشەم)یش بەهەمان شێوە دەنگەکەی وەستێنرا.

٣- لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم بەهۆی بۆردومانی سەختی هێزەکانی ئەڵمانیای نازی بەسەر لەندەنەوە، کە بۆماوەی سێ مانگ لەبەر هۆی ئەمنی ئێزگەی بەریتانی وازی لەپەخشکردنی دەنگەکەی هێنا.

# مانگی ئاب ( ئۆگست )

## * ٨/١

- ١-٨/٧ هەفتەی جیهانی شیری دایك.
- ١٩٤٩ داخستنی گۆڤاری گەلاوێژ بەفەرمانی (نوری سەعید).
- ١٩٩٥ دەرچوونی ژمارە سفری ئەزمونی (ڕۆژنامەی داهێنان).
- ١٩٩٨ کۆچی دوایی کەسایەتی ناوداری کورد (عەلی کەمال)[١].

## * ٨/٢

- ١٩٢٠ کۆچی دوایی حەمەئاغای گەورەی کۆیە.
- ١٩٢٢ کۆچی دوایی داهێنەری تەلەفۆن (ئەلیکساندەر گراهام بێل).
- ١٩٢٢ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان)[٢].

---

[١] – عەلی کەمال عەبدولڕەحمان، لە ١٩٠٠/١٠/٢٩ لەدایکبووە، ساڵی (١٩١٤) دەچێتە بەغدا بۆخوێندنی دواناوەندی سوپا، دوای دوو ساڵ دەچێتە قوتابخانەی جەنگی و دەبێتە مولازم، ماوەیەك بووە بەبەڕێوەبەری پۆلیسی بادیەی باشورو پاشان دەبێتە قایمقامی (سوق الشیوخ)، دواتر لەلەندەن نیشتەجێ دەبێت، عەلی کەمال کەسایەتیەکی ناوداری شاری سلێمانی بوو، یارمەتی قوتابیانی داوە بۆ خوێندن، ئەمە جگە لەوەی چەندین کاری خزمەتگوزاری لەشاری سلێمانی بەئەنجام گەیاندووە، لە ١٩٩٨/٨/١ لەلەندەن کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی دەهێنرێتەوە بۆ سلێمانی و لەمزگەوتی گەورە نوێژی لەسەر دەکرێ و لەمزگەوتەکەی خۆی (مزگەوتی عەلی کەمال) بەخاك دەسپێردرێ.

[٢] – (بانگی کوردستان) ڕۆژنامەیەکی عیلمی ئەدەبی، حورو سەربەستی میللی بوو لەشاری سلێمانی دەردەچوو، ئەم ڕۆژنامەیە بەزمانی کوردی و فارسی و تورکی لەچاپخانەی حکومەت لەسلێمانی دەردەچوو، (مستەفا پاشا) خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری بەرپرس و سەرنووسەری بوو، لەسەرەتادا ڕۆژنامەکە ئۆرگانی (کۆمەڵەی کوردستان) بوو کە لە ٢١

-١٩٤٥ دامەزراندنی کۆماری ڤێتنامی دیموکراتی.

- ١٩٩٠ داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراقەوە.

*** ٨/٣**

- ١٤٩٢ گەشتەکەی (کریستۆڤەر کۆلۆمبس) دەستی پێکرد کە سەرەنجام ئەمریکای دۆزیەوە.

- ١٩١٤ هەڵگیرسانی (جەنگی جیهانی یەکەم).

- ١٩٩٤ یەکەم دادگاییکردنی شەش پەرلەمانتاری کوردی تورکیا.

- ١٩٩٩ کۆچی دوایی شاعیری ناوداری عێراقی (عبدالوهاب البیاتی) لەدیمەشق.

- ٢٠٠٥ (مەحمود ئەحمەد نەژاد) بوو بەسەرۆك کۆماری ئێران.

*** ٨/٤**

- ١٩٦٠ کۆچی دوایی نوسەرو ڕوناکبیری کورد (ڕەفیق حیلمی)[١].

---

تەمووزی (١٩٢٢) بەسەرۆکایەتی مستەفا پاشای یاموڵکی دامەزرا، دوایی بەناوی حوکمداریەتی شێخ مەحمودەوە دەدوا، ڕۆژنامەکە ئامانجی ئەوەبوو خەڵك هان بدات بۆ بەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتی کوردو سەربەخۆیی بۆ کوردستان و هەنگاوێکی گەورە بەبزافی ڕۆشنبیری کورد بدات، بانگی کوردستان کە (١٣) ژمارەی لێ دەرچوو، پانتاییەکی باشی بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی دامەزراندن و سەردان و جموجۆڵەکانی شێخ مەحمود تەرخان کردبوو، هەروەها هەواڵەکانی سەرۆك هۆزو شۆڕشەکەی (سمکۆ) لەکوردستانی ئێراندا و ئاگاداری فەرمانگە حکومیەکانیشی بڵاو دەکردەوە.

[١] - ڕەفیق حیلمی، لەدایکبووی (١٨٩٨)ی کەرکوکە، باوکی لەسوپای تورکدا ئەفسەر بووە، ئامادەیی لەسلێمانی و بەغداد خوێندووەو پاشان چۆتە کۆلیژی سەربازی لەئەستەنبوڵ، لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەمدا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، دوای تەواوبوونی جەنگ چۆتە قوتابخانەی ئەندازەو ساڵی (١٩٢٠) تەواوی کردووە، لەفێرکردن و

## * ٨/٥

- ١٨٧٦ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (الاهرام) لە ئەسکەندەریە.

- ١٨٩٥ کۆچی دوایی (فریدریك ئەنگلس) لەبەریتانیا.

- ١٩٣٧ کۆچی دوایی سەید عەلی ئەسفەری کوردستانی لەئێران[١].

---

وانەوتنەوەدا کاری کردووەو بووە بە بەڕێوەبەری مەعاریفی سلێمانی و هەولێرو بەسرەو دیالە، پاش شۆڕشی چواردەی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) بووە بەنوێنەری ڕۆشنبیری لەباڵوێزخانەی عێراق لەتورکیا، حیلمی زۆر بەچاکی زمانی (کوردی و تورکی و فارسی و عەرەبی و فەرەنسی) زانیوە، زۆر کتێبی بەزمانی کوردی و عەرەبی و تورکی داناوە یاخود وەرگێڕاوە، کتێبی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی) لەدوو بەرگدا داناوە، کە لەلایەن (مارف خەزنەدار)ەوە کراوە بەعەرەبی و لەکاتی خۆیدا لەڕۆژنامەی (الرأي العام) لەبەغداد بڵاوی کردۆتەوە، هەروەها (یاداشت) کەشەش بەرگەو لەبەغدا چاپکراوەو (مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، لەدوای شۆڕشی تەمووزی (١٩٥٨) کۆمەڵە شیعرێکی بڵاوکردەوە بەناوی (پاش تەموز) کەزیاتر ڕەنگدانەوەی هەست و سۆزی بەکوڵی بوو بەرامبەر ئەو ڕووداوانە، ڕەفیق حیلمی لە ١٩٦٠/٨/٤ لەبەغداد کۆچی دوایی کردووەو لەسلێمانی بەخاك سپێرراوە.

[١] – سەید عەلی ئەسفەر لەساڵی (١٢٦٠هەتاوی) (١٨٨١ زایینی) لەخێزانێکی ناوداری ئایینی لەئاوایی (سەڵاوات)ی سنە لەدایك بووە، نیزامەدینی باوکی کەسێکی ناوداری ئایینی بوو، بۆیە سەیدی هێناوەتە شارو لەخوێندنگەی (شێخ عەبدولمونمین) باوکی (ئایەتوڵا مەردۆخی) لەمزگەوتی (دار الإحسان) دایمەزراند تا لەبەر دەستی ئەواندا فێری خوێندنەوەی قورئان بێت، (حاجی سید عبدالاحد باباشهابی) کوڕە گەورەکەی سەید دەڵێت: باوکم لەگەڵ ئەوەی هەرگیز لای هیچ مامۆستایەك نەی خوێندبوو (خوێندنی وانەی مۆسیقا) لەگەڵ ئەوەشدا هەموو پەیژەو مەقامە مۆسیقیەکانی ئێرانی دەناسی، (کوردستانی) لەڕیزی مامۆستاکانی مۆسیقای کوردی و فارسیدا دادەنرێت، بەشێوەیەك لەڕیزبەندی مامۆستاکانی

- ١٩٦٠ سەربەخۆیی وڵاتی (بۆرکینا فاسۆ) لەفەرەنسا.

- ١٩٦٦ کۆچی دوایی شاعیر (مامەند کەرکوکی).

## * ٨/٦

- ١٩٣٠ راپەرینی دووەمی (بەردەرکی سەرا) دژی ئینگلیز لەسلێمانی.

- ١٩٤٥ (هێرۆشیما) بەبۆمبای ئەتۆم لەلایەن ئەمریکاوە خاپورکرا[١].

## * ٨/٧

- ١٩٣٣ ڕۆژی شەهیدی ئاشوری[٢].

- ١٩٣٨ کۆتایی دووەم شۆڕشی دەرسیم.

---

مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی و ئێرانیدا ناوی لەریزی یەکەمینەکاندا تۆمارکراوەو سەفەاتی ئاوازەکانی لەمۆسیقای ئێرانیدا دەخوێنرێت، زۆربەی گۆرانیەکانیشی لەلایەن گۆرانی بێژە ناودارەکانی فارس و کوردەوە وتراونەتەوە، وەکو (شەجەریان و سەید جەلالەدینی محەمەدیان و حیشمەتی لوڕ نەژاد و بێژەن کامکار)، سەید عەلی ئەسغەر لەتەمەنی (٥٥)ساڵیدا لەئاوایی (سەڵاوات) چاوی لێکنا.

[١] - سەعات ٨,٤٥ خولەکی سەر لەبەیانی ٦ی ئابی (١٩٤٥) یەکەمین بۆمبی کیمیایی بەسەر دانیشتوانی شاری هێرۆشیمای یاباندا درا، سێ ڕۆژ دوای ئەم کارەساتە دووەمین بۆمبی ئەتۆمی (ناکازاکی)شی وێرانکرد، بۆمبەکە کە لە(٦٠) کیلۆ یۆرانیۆمی (٢٣٥) دروستکرابوو بەفرۆکەیەکی جەنگی ئەمریکا بەناوی (ئینۆلاگۆی) بەسەر هێرۆشیمادا درا، هەر لەیەکەمین دەقیقەکانی پاش تەقینەوەکەدا هەموو شتێك تا دووری (١٥٠٠م) لەبۆمبەکە توایەوەو بوو بەدوکەڵ و تۆز، (٦٠)هەزار کەس دەستبەجێ گیانیان لەدەستداو ژمارەی کوژراوەکان کە تا چەندین ساڵ دوای کارەساتەکە درێژەی هەبوو گەیشتە زیاتر لە (٢٤٠) هەزار کەس، جێی ئاماژەیە ئەم کارەساتە لەسەردەمی دەسەڵاتی سەرۆکی ئەمریکی (هاری ترومان) دابوو.

[٢] - لە ١٩٣٣/٨/٧ لەشارۆچکەی (سمیل) پێنج هەزار کەس کوژران لەلایەن حکومەتی پادشایی عێراق بەیارمەتی هێزەکانی بەریتانیا، بۆیە لەلایەن ئاشوریەکانەوە ئەم ڕۆژە کراوە بە (ڕۆژی شەهیدی ئاشوری).

- ١٩٦٠ سەربەخۆیی (ساحل العاج) لەبەریتانیا.
- ١٩٩٦ کۆچی دوایی شاعیری کورد (بڵند حەیدەری) لەلەندەن.

## * ٨/٨

- ١٩٤٦ بوومەلەرزە بەناوبانگەکەی شاری پێنجوێن ڕوویدا.
- ١٩٧٦ دامەزراندنی (حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان).
- ١٩٨٨ وەستانی جەنگی هەشت ساڵەی (عێراق – ئێران).

## * ٨/٩

- ١٩٤٥ (ناکازاکی) بەبۆمبای ئەتۆم لەلایەن ئەمریکاوە خاپورکرا.
- ١٩٦٥ سەربەخۆیی (سەنگافورە) لەمالیزیا.
- ١٩٦٩ سوتاندنی (مسجد الاقصی) لەلایەن جولەکەکانەوە.
- ١٩٧٢ کۆچی دوایی (قەدری جان)ی شاعیر[1].
- ١٩٩٨ دووتەقینەوەی گەورە هەردوو باڵوێزخانەی ئەمریکای لە (نایروبی) و (دارالسلام) هەژاند.
- ٢٠٠٣ دامەزراندنی حکومەتی گواستنەوەیی (إنتقالی) عێراق کە لە (٢٥) وەزیر پێکهاتبوو.

---

[1] – قەدری جان، ناوی (عەبدولقادر عەزیزجان)ە، شاعیرو ڕۆشنبیرێکی کوردە، ساڵی (١٩١٦) لەپارێزگای (ماردین)ی باکووری کوردستان لەدایکبووە، (خانەی مامۆستایان)ی لەشاری (ئیزمیر) تەواوکردووەو بووە بەمامۆستا، بەهۆی سیاسەتەوە باری ژیانی گۆڕاوەو ڕووی کردە (قامیشلی و ئامودە)و دواتر چووە بۆ (دیمەشق)، ساڵی (١٩٥٨) ڕووی کردۆتە عێراق، زمانی (عەرەبی و تورکی و فەڕەنسی) زانیوە، لەچاپکراوەکانی: (داستانێك بەشیعر)، (دیوانی شیعر) ١٩٥٧، (ئەلف و بێی کوردی)، (شڤانی کورد)، ساڵی (١٩٧٢) لەدیمەشق کۆچی دوایی کردووە.

- ٢٠٠٧ كۆچی دوایی (جەبار فەرمان) ئەندامی مەكتەبی سیاسی (یەكێتی نیشتمانی كوردستان) لەتەمەنی (٦٠) ساڵیدا.

## * ٨/١٠

- ١٩٢٠ مۆركردنی ڕێكەوتننامەی (سیڤەر)[١].
- ١٩٣٧ ڕووخانی حكومەتەكەی (بەكر صدقی).
- ١٩٤٥ شۆڕشی سێیەمی بارزان.

## * ٨/١١

- ١٩٢٩ جوولەكەكانی فەلەستین چوونە ڕیزی ڕێكخراوی (زایۆنیزمی جیهانیەوە).
- ١٩٣٧ كوژرانی (بەكر صدقی) لەموسڵ[٢].

---

[١] - كۆنگرەی سیڤەر دوای كۆتایی هاتنی جەنگی یەكەمی جیهانی لە ١٢ی ئابی (١٩٢٠) لەلایەن وڵاتە زلهێزەكانەوە لەسویسرا بەسترا، سەرۆكی (كۆمەڵەی ژیانەوەی كوردستان) (ئەمیر شەریف پاشا)و ڕاوێژكارەكەی بەنوێنەری كورد دیاریكران لەكۆنگرەكەدا، بەندەكانی (٦٢، ٦٣، ٦٤)ی ڕێكەوتننامەكە تایبەتكران بۆ كێشەی كورد، كەتیایدا باسی (خود موختاری) دەكات لەو ناوچانەی زۆرینەی كوردن.

[٢] - بەكر صدقی، جەنەڕاڵێكی لێهاتووی كوردە، ساڵی (١٨٨٥) لەدایكبووە، ساڵی (١٩٠٨) لەقوتابخانەی سەربازی ئەستەنبوڵ بە (مولازم) دەرچووە، بەشداری جەنگی جیهانی یەكەمی كردووە، لەسوپای عێراقدا بەپلەی (ڕەئیس) وەرگیرا، خوێندنی سەربازی لە (هندستان و لەندەن) تەواوكردووە، دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق لە (١٩٢٨) بوو بە (عەقید)، لە (١٩٣١) پلەی (زەعیم)ی وەرگرتووەو كراوە بە سەركردەی سوپای باكوور، لە (١٩٣٢) كۆلیژی (كەمبرل)ی بەریتانی تەواوكردووە، لە ساڵی (١٩٣٦)دا كودەتایەكی سەربازی لەعێراقدا كردو حكومەتەكەی (یاسین ألهاشمی) ڕووخاند، دەستی بەسەر دەسەڵاتدا گرت بۆ ماوەی (٩) مانگ و (٢٠) ڕۆژ، بەڵام لەئابی (١٩٣٧) حكومەتەكەی ڕووخێنراو خۆیشی

- ١٩٦٠ سەربەخۆیی ولاتی (چاد) لەبەریتانیا.
- ١٩٩٩ (خۆرگیرانی تەواو) شارەکانی کوردستان و زۆرێک لەولاتانی جیهانی گرتەوە.
- ٢٠٠٤ دامەزراندنی (یەکێتی زانایانی ئیسلامی جیهانی) لەلەندەن.

## * ٨/١٢

- ڕۆژی جیهانی لاوان.
- ١٨٢٢ کۆچی دوایی شاعیری ناوداری ئینگلیز (شیللی).
- ١٩٤٩ پەیماننامەی (مامەڵەکردنی دیل) مۆرکرا.
- ١٩٨٣ کۆچی دوایی شاعیر (مەلا ئەحمەدی پێنجوێنی)[1].
- ١٩٨٩ کۆچی دوایی (ولیەم شۆکلی) سێیەم داهێنەری (ترانزیستۆر).
- ٢٠٠٠ ژێرئاوکەوتنی ژێردەریایی (کۆرس)ی ڕوسی کەبووە هۆی لەناوچوونی (١١٨)کەس.

---

کوژرا، بەوە تاوانبار کرابوو کە دەیەوێت دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد دابمەزرێنێ، بەکر صدقی نووسەرێکی بەتوانا بووەو چەندین کتێبی سەربازی داناوە، وەك: (الطبوغرافیا، الاستطلاع، دروس تعبویة، الی رجال جیش الاحداث، الحروب الجبلية)، لەگەڵ چەند کتێبێکی تر بە زمانی کوردی و تورکی .

[1] – ئەحمەد کوڕی مەلا محەمەد کەریم، ساڵی (١٩٢٠) لەپێنجوێن لەدایکبووەو سەرەتای خوێندنی لای باوکی بووە، پاشان بۆ خوێندن ناوچەکانی سلێمانی و سەنگاوو قەرەداغ و بیارەو چەند شوێنێکی کوردستانی ئێران گەڕاوە، پاشان هاتۆتە سلێمانی و لەمزگەوتی (سەید ئەحمەدی نەقیب) بووە بە پێش نوێژ، مەلا ئەحمەد هەر لەتەمەنی منداڵیەوە هۆنراوەی نووسیوەو شارەزای زمانی عەرەبی و فارسی بووە، خاوەنی چەند بەرهەمێکە لەوانە (باخچەی بۆن خۆشان) هەروەها دیوانێکی شیعریشی هەیە، لەئابی (١٩٨٣) کۆچی دوایی کردووەو لەگردی سەیوانی شاری سلێمانی بەخاك سپێرراوە.

## * ٨/١٣

- ١٩٤٠ کۆچی دوایی (ڕەشید زەکی کابان)[1].
- ١٩٦٣ سەربەخۆیی (ئەفریقیای ناوەڕاست) لەفەڕەنسا.

## * ٨/١٤

- ١٩٤٩ ڕاگەیاندنی پەیمانی باکوری ئەتڵەسی (ناتۆ)[2].
- ١٩٧١ سەربەخۆیی بەحرەین لەبەریتانیا.
- ١٩٩١ کۆچی دوایی کەسایەتی ناوداری هەولێر (تەحسین مەچکۆ) خاوەنی چایخانەی مەچکۆ لەهەولێر.
- ٢٠٠١ دامەزراندنی (پارتی دادو گەشەپێدان) لەتورکیا.
- ٢٠٠٢ کوژرانی (ناصر جبار) سەرۆکی (کتائب عزالدین قسام) لەفەلەستین.

---

[1] – ڕەشید زەکی کابان، لەساڵی (١٨٧٦) لەسلێمانی لەدایکبووە، قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەری خوێندووەو ئامادەیی سەربازی لەبەغدا تەواو کردووەو خوێندنی زانکۆشی لەئەستەنبوڵ تەواو کردووە، زمانی فارسی و عەرەبی و تورکی زانیوەو چەند پۆستێکی ئیداری وەرگرتووە، کەدواترینیان (بەڕێوەبەری پەروەردەو فێرکردنی باکوری عێراق) بووە، شارەزایی لەبیرکاری و جوگرافیاو فەلەکدا هەبووە، لەساڵی (١٩٣٩) خانەنشین کراوە.

[2] – ناتۆ، ڕێکخراوێکە ئەمریکاو چەند وڵاتێکی ئەورووپی دەگرێتە خۆ بەپێی پەیماننامەیەك کەپێی دەوترێت پەیمانی باکووری ئەتڵەسی (North Atlantic Treaty Organization)، بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە ئەو وڵاتانە بەڵێنیان داوە کەکێشەکانی نێوانیان بەئاشتی چارەسەر بکەن، وە هەر هێرشێك بکرێتە سەر هەر یەکێکیان پێویستە لەسەر هەموویان بەرگری لێ بکەن، ئەنجومەنی ڕێکخراوەکە بریتیە لە وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی ئەندام، وڵاتەکان بریتین لە: (بەلجیکا، کەنەدا، دانیمارك، فەڕەنسا، ئیسلەندا، ئیتاڵیا، لۆکسمبۆرگ، هۆڵەندا، نەرویج، پورتوگال، ئەمریکا، بەریتانیا، یۆنان، تورکیا، ئەڵمانیا)

## ٨/١٥ *

- ١٤٦٣ كۆچی دوایی (ئیبن حەزمی قورتوبی).
- ١٧٦٩ لەدایکبوونی (ناپلیۆن پۆناپارت).
- ١٩٤٥ دامەزراندنی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران).
- ١٩٤٧ سەربەخۆیی (پاکستان) لەبەریتانیا[1].
- ١٩٤٨ سەربەخۆیی (کۆریای باشور).
- ١٩٦١ دووەمین کۆنگرەی مامۆستایانی کورد لەشەقلاوە.

## ٨/١٦ *

- ١٩٤٢ دامەزراندنی کۆمەڵی (ژ.ك) لەکوردستانی ئێران.
- ١٩٤٦ دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان. عیراق.
- ١٩٤٦ لەدایکبوونی (کاك مەسعود بارزانی).
- ١٩٤٧ سەربەخۆیی (هیندستان) لەبەریتانیا.
- ١٩٦٠ سەربەخۆیی (قوبرس).

---

[1] - پاکستان، گەورەترین دەوڵەتی ئیسلامیە لەجیهانداو پایتەختەکەی (ئیسلام ئاباد)ە، رووبەرەکەی (٨٠٣,٩٤٣ کم٢)یەو دانیشتوانی نزیکەی (١٥٠) ملیۆن کەسە، دراوی وڵات (رووپیێ)یەو زمانی فەرمی (ئوردی)یە، هاوڵاتیان زمانی (بەنجاب و سندی پشتوویی و ئینگلیزی)یش بەکاردەهێنن، (٩٧٪)ی دانیشتوانی موسڵمانن، پاکستان لەگەڵ (پاکستانی خۆرهەڵات)و (هندستان)دا یەك پارچە بوون و لەژێر دەستی بەریتانیادا بوون، پاش سەرکەوتنی (محەمەد عەلی جەناح) لەهەڵبژاردنەکانی (١٩٤٧)دا، توانی ڕەزامەندی پەرلەمانی بەریتانی بەدەست بهێنێت و سەربەخۆیی پاکستان و جیابوونەوەی لە هندستان ڕابگەیەنێ، بەپێی دەستوری ساڵی (١٩٥٦) پاکستان بوو بەکۆمارێکی ئیسلامی سەربەخۆو یەکەمین سەرۆك کۆمار (ئەسکەندەر میرزا) بوو، لە (١٩٧١) پاش شەڕێکی توند (پاکستانی خۆرهەڵات) جیابۆوەو بوو بەدەوڵەتێکی سەربەخۆ بەناوی (بەنگلادش).

*** ٨/١٧**

**- ١٩٤٢ کۆچی دوایی وەزیری دادی عێراقی (ناجی سویدی) لەشاری (بالسیوری) باشوری ئەفریقیا.**

**- ١٩٤٥ سەربەخۆیی (ئەندەنوسیا) لەهۆڵەندا.**

**- ١٩٦٠ دەرچوونی ڕۆژنامەی (دەنگی کورد).**

**- ١٩٦٠ سەربەخۆیی (گابۆن) لە فەرەنسا.**

**- ١٩٦٩ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (الثورة).**

**- ١٩٩٢ دەرچوونی یاسای حیزبەکان و ڕۆژنامەگەری هەرێمی کوردستان لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانەوە.**

**- ٢٠٠٣ دەستگیرکردنی (عەلی حەسەن مەجید) ناسراو بە (عەلی کیمیاوی) لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە[١].**

---

[١] – عەلی حەسەن مەجید، ساڵی (١٩٤٠) لەدایکبووە، ئامۆزای سەدام حسێنی سەرۆك کۆماری پێشووی عێراقە، لە ٢٩ی ئازاری (١٩٨٧) لەلایەن سەدامەوە کرا بەسکرتێری نوسینگەی کاروباری باکور (مکتب شؤون الشمال)، بەم جۆرەش (عەلی کیمیایی) دەسەڵاتی تەواوی گرتەدەست و لەساڵی (١٩٨٨) پرۆسەی جینۆسایدکردنی گەلی کوردی لەناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا بەتایبەت لەناوچەکانی گەرمیان ئەنجامداو زیاتر لە (١٨٢) هەزار کەس بێ سەروشوێن کران، لە ١٦/٣/١٩٨٨یشدا کیمیابارانی شاری هەڵەبجەی سەر بەپارێزگای سلێمانی ئەنجامداو زیاتر لە پێنج هەزار کەس شەهید بوون، کە لەوکاتەدا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لەم تاوانانە بێدەنگ بوو، لەدوای ئازادکردنی عێراق لەنیسانی (٢٠٠٣) عەلی کیمیایی خۆی شاردەوەو لە ٢١/٨/٢٠٠٣ دەستگیرکرا، کیمیایی پێنجەم ناوبوو لەو لیستەی کەئەمریکیەکان بڵاویان کردەوە بۆئەوەی دەستگیربکرێن، لەسەرەتای ساڵی (٢٠٠٧) دادگای باڵای تاوانەکان لەعێراق دادگایی عەلی کیمیایی لەسەر تاوانی ئەنفال دەست پێکرد، لەسەرەتای نیسانی هەمان ساڵدا داواکاری گشتی دادگای باڵای تاوان داوای لەدادگا کرد (عەلی حەسەن مەجید) لەسێدارە بدرێ.

## * ٨/١٨

– ١٢٢٧ کۆچی دوایی (جەنگیزخان).

– ١٩٢٤ دەرچوونی ڕۆژنامەی (ژیانەوە) لەسلێمانی[1].

– ١٩٩٢ کۆچی دوایی نووسەری کورد (عەلی سەیدۆ گۆرانی).

## * ٨/١٩

– ١٨١٩ کۆچی دوایی (جیمس وات) پەرەپێدەری بزوێنەری هەڵمی، کەیەکەی پێوانی توانای کارەبا بەناوی ئەوەوە ناونرا (وات).

---

[1] – ژیانەوە یەکەمین ژمارەی لەڕۆژی دووشەممە ١٨ی ئابی (١٩٢٤) دەرچووە، لەژێر ناوی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە (ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی حکومەتیە هەفتەی جارێك دەردەچی)، پاشان گۆڕا بە (ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی ئیجتیماعیە، هەفتەی یەك جار دەردەچێ)، دەکرێ بڵێین (ژیانەوە) یەکەمین ڕۆژنامەی نیمچە ڕەسمی عیراقیە بەزمانی کوردی، لەدوای نەمانی دەسەلاتی عوسمانیەکان و ڕاگەیاندنی دەوڵەتی عێراق و مەلیکەکەی (فەیسەڵی یەکەم)، هەرچەندە ناوی سەرنووسەری ڕۆژنامەکە لەسەر لاپەڕەکانی نەنووسراوە، بەڵام گۆڕانی سەرنووسەرەکەی لەژمارە (٣٨)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٩/٣٠ بۆنەیەك بوو بۆئەوەی بزانین (م.ئەدیب) سەرنووسەری تازەی ڕۆژنامەکەیە، پاش ئەوەی پۆزشێکی (جەمیل سائیب)ی سەرنووسەری پێشووی لەژمارەی پێشوودا بڵاوکردۆتەوە.

سیاسەتی سەرەکی ڕۆژنامەکە گرنگیدان بوو بەویلایەتی موسڵ و کەمتر بایەخی بەشتەکانی تر دەدا، تەنیا مەگەر فێرکردن و بەشارستانی بوون نەبێت، بەڵام دەبێت ئەوەمان لەیاد نەچێت کە دەسکەوتی هەرەگەورەی ژیانەوە بڵاوکردنەوەی چیرۆکی (لەخەوما)ی (جەمیل سائیب) بوو کە بە(١٨) ئەڵقە بڵاوکرایەوەو دواتر پاشماوەی چیرۆکەکە لەڕۆژنامەی (ژیان)دا درێژەی پێدرا، ئاشکرایە لەگەڵ بەفەرمی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعیراقەوە ئەرکی ژیانەوە تەواوبوو، قۆناغێکی نوێش هاتە پێشەوە کەپێویستی بەڕۆژنامەیەکی نوێ و ئەرکی نوێ هەبوو، بۆیە دوازمارەی ژیانەوە لەڕۆژی پێنج شەممە ١٩٢٦/١/١٤ کەژمارە (٥٦) بوو بڵاوکرایەوەو هەفتەیەك دوای ئەوە یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ژیان) دەرچوو.

- ١٩١٩ سەربەخۆیی (ئەفغانستان) لەبەریتانیا.
- ١٩٩٣ سیمناری کۆنگرەی نیشتمانی یەکگرتووی عێراق (INC) لەسەڵاحەدین.
- ٢٠٠٢ کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەیەکی ڕووسی و کوژرانی (١١٨) ئەفسەرو سەرباز.
- ٢٠٠٣ تیرۆرکردنی (سێرجیۆ دومیلو) نوێنەری کوفی ئەننان لەعیراق.

## * ٨/٢٠

- ١٩٢٠ شۆڕشی برایم خانی دەلۆ لەکفری دەستی پێکرد[١].
- ١٩٤١ دامەزراندنی (الجماعة الاسلامية) لەپاکستان لەلایەن (ئەبوئەعلای مەودودی).
- ١٩٤٧ کۆچی دوایی زانای گەورە (عەبدولعەزیز موفتی).
- ١٩٩٦ کۆچی دوایی (شێخ باباعەلی کوڕی شێخ مەحمودی حەفید) لەتەمەنی (٨٤)ساڵیدا لەلەندەن.
- ١٩٩٦ دووەمین کۆنگرەی (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان) لەهەولێر گرێدرا.

---

[١] – برایم خانی دەلۆ لەساڵی (١٨٧٤) لەئاوایی (هەیەوەکەل) لەناوچەی (کفری) لەدایکبووە، لەگەڵ بەرپابوونی شۆرشی خەڵکی فورات دژی دەسەلاتی ئینگلیزەکان، برایم خانیش لەمانگی ئابی (١٩٢٠) شۆڕشێکی دژی دەزگا سەرکوتکەرەکانی ئینگلیز لەشاخی باوەشاسوارەوە دەست پێکرد، کەتوانی شاری کفری و دەوروبەری ئازاد بکات، بەلام دواتر ئینگلیزەکان توانیان ڕاپەڕینەکەی خامۆش بکەن، بەلام برایم خان وازی لەشۆڕش نەهێناو شەڕی پارتیزانی دەست پێکرد..، لەمانگی کانوونی دووەمی (١٩٢١) لەگوندی (تەل شەرەف) لەنزیك (دووز) کۆچی دوایی کرد، ئێستا گۆڕەکەی لەچیای حەمرینە، جێی ئاماژەیە ئینگلیز خەلاتێکی گەورەیان دانابوو بۆ لەناوبردن و کوشتنی.

## * ٨/٢١

- ١٨٩٥ لەدایکبوونی نووسەر (کامەران بەدرخان)[١].

- ١٩٤٤ کۆنگرەی دامەزراندنی (نەتەوەیەکگرتووەکان) لەواشنتۆن بەسترا.

- ١٩٩١ سەربەخۆیی (ئیستوانیا) لەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.

- ١٩٩٩ یەکگرتنی (بزووتنەوەی ئیسلامی) و (بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی) و ئیعلانکردنی (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی).

## * ٨/٢٢

- ١٨١٣ (عەبدولڕەحمان پاشای بابان) کۆچی دوایی کرد[٢].

---

[١] - کامەران بەدرخان، لە ساڵی (١٨٩٥) لەئەستەنبوڵ لەدایکبووە، زاناو شاعیرو چیرۆك نووسێکی بەناوبانگی کوردە،یەکێك بوو لەو کۆمەڵە کوردەی لەگەڵ (مێجەر نوئێل)دا هاتوونەتە بەرزاییەکانی کوردستان و، پاش گەڕانەوەیان دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ خۆی و باوکی و سورەپاو جەلادەتی برای دەرکرد، بەڵام خۆیان ڕزگارکردو ڕوویانکردە ئەڵمانیا، لەساڵانی سیەکاندا دکتۆرای لە ماف (حقوق)دا لەئەڵمانیا وەرگرتووە، لەگەڵ (جەلادەت بەدرخان)ی برایدا گۆڤاری (هاوار)و (ڕوناهی) لەساڵانی (١٩٤١-١٩٤٢) لەدیمەشق دەرکردووە، لە (١٩٤٣) چووە بۆ (بەیروت)و گۆڤاری (ستێر)و (ڕۆژا نۆ)ی بەکوردی فەرەنسی دەرکردووە، لەنێوان (١٩٤١-١٩٤٥) دادوەری کردووە، لە (١٩٤٧) ڕوویکردە پاریس و (سەنتەری ڕۆشنبیری کورد)ی دامەزراند، چەند ساڵێك (زمانی کوردی) لەزانکۆی (سۆربۆن) وتۆتەوە، لە (١٩٧٨) کۆچی دوایی کردووە.

[٢] - عەبدولڕەحمان پاشای کوڕی مەحمود پاشای بابان، میری ئەمارەتی بابان بووەو هەوڵیداوە سنوری میرنشینەکەی فراوان بکات، بەڵام ململانێی نێوان عوسمانیەکان و سەفەویەکان ئەم خەونەیان زیندە بەچاڵ کرد، عەبدولڕەحمان پاشا ماوەی (٢٤) ساڵ حوکمی میرنشینی بابانی کردووە، سوڵتانی عوسمانی بۆ دوورخستنەوەی چەند جارێك

- ١٨٦٤ دامەزراندنی (خاچی سوری نێو دەوڵەتی).

- ١٩٢٢ داهێنەری تەلەفۆن (گراهام بێل) کۆچی دوایی کرد.

- ١٩٩١ کودەتاچییەکانی سۆڤیەت دەستگیرکران.

## * ٨/٢٣

- ڕۆژی جیهانی نەهێشتنی بازرگانیکردن بەکۆیلە.

- ١٨٠٦ کۆچی دوایی (چارلس کۆلمب) داهێنەری یاسای (کۆلۆم)، کەیەکەی پێوانی بارگەی کارەباییە.

- ١٩٢١ (فەیسەڵی یەکەم) بوو بەمەلیکی عێراق.

- ١٩٢٧ کۆچی دوایی سەرکردەی میسری (سەعد زەغلول)[1].

---

پۆستی وەزاری پێداوە بەڵام ڕەتی کردۆتەوە، پاش کۆچی دوایی عەبدولڕەحمان پاشا لە ئابی (١٨١٣)دا میرنشینەکەی وەك جاران نەماو بەئاسانی کەوتە ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانی و والی بەغدادەوە.

[1] – سەعد زەغلول کوڕی ئیبراهیم زەغلولە، ساڵی (١٨٦٠) لەگوندی (ابیاتة)ی میسر لەدایکبووە، لە (١٢)ساڵیدا چۆتە ئەزهەرو بڕوانامەی لیسانسی لە (ماف)دا بەدەستهێناوە، لە (١٨٨٠)دا بووە بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (الوقائع المصريه)، دوای ئەوە بووە بە بریکاری وەزیری ناوخۆ، دوای داگیرکردنی میسر لەلایەن بەریتانیاوە بەشداری شۆڕشی (ئەحمەد عورابی) کردووەو چەند مانگێك زیندانی کراوە، لە (١٨٩٢)دا کراوە بەڕاوێژکاری دادگای باڵا، لە (١٩٠٦)دا کراوە بەوەزیری (المعارف العموميه)و دواتر وەزیری (داد)، سەعد زەغلول دژی داگیرکاری بەریتانیا بووەو داوای سەربەخۆیی میسری کردووە، لە (١٩١٩) لەگەڵ هاوڕێکانیدا بیرخەرەوەیەکیان داوەتە نوێنەری باڵای بەریتانیا، لەبەرئەوە گیراوەو دوورخراوەتەوە بۆ دوورگەی ماڵتا، بەڵام گەلی میسر ڕاپەڕیوەو لەبەرئەوە ئازادکراوە، دواتر پارتی (الوفد)ی دروستکردووەو لەهەڵبژاردنی (١٩٢٣)دا زۆرینەی دەنگی هێناوەو بووە بەسەرۆك وەزیرانی میسر، بەڵام دواتر لەبەر جێبەجێنەکردنی داواکانی لەلایەن بەریتانیاوە وازی لە پۆستەکەی هێناوە، لە ئابی (١٩٢٧) کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٤٤ سەربەخۆیی (ڕۆمانیا).
- ١٩٩٠ سەربەخۆیی (ئەرمینیا) لەیەکێتی سۆڤیەت.

## * ٨/٢٤

- ١٩٤٢ شەڕی ستالینگراد.
- ١٩٩١ سەربەخۆیی (ئۆکرانیا) لەیەکێتی سۆڤیەت.
- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی سەرۆك کۆماری پێشووتری عێراق (عەبدولڕەحمان عارف) لەئەردەن.

## * ٨/٢٥

- ١٨٢٥ سەربەخۆیی ئۆرۆگوای لەئیسپانیا.
- ١٨٦٧ کۆچی دوایی (مایکڵ فارادای) داهێنەری بیرۆکەی داینەمۆ.
- ١٩٥٥ کۆچی دوایی شاعیری کورد (بێخود)[1].
- ١٩٨٨ دەستپێکردنی شاڵاوی ئەنفالی هەشت بۆ ناوچەکانی بادینان.
- ١٩٩١ سەربەخۆیی (ڕوسیای سپی) لەیەکێتی سۆڤیەت.

---

[1] – (بێخود)ی شاعیر ناوی مەلا مەحمودی کوڕی موفتی حاجی مەلا ئەمینی ئەحمەد چاومارە، ساڵی (١٢٩٦)ی کۆچی لەدایك بووە، لای زانایانی ناوداری ئەو سەردەمە خوێندنی تەواوکردووە، ساڵی (١٩٠٠) کراوە بەدادوەری هەڵەبجە، پاشان لەسلێمانی دەبێتە موفتی. لەئابی (١٩٥٥) کۆچی دوایی کردووەو لەگردی سەیوان بەخاك سپێرراوە.

بێخود لەستایشی پێغەمبەردا ﷺ لەپارچە شیعرێکدا دەڵێت:

خۆش ئەودەمەی کەڕۆژو شەو طواف ئەکا ڕەواقی تۆ
خۆش ئەو سەرەی کەکەوتبێ لەکووچەو سوقاقی تۆ
بەتیکەتیکە بێ دڵی کەنەیبێ ئیشتیاقی تۆ
حەیاتی من ویصاڵی تۆ، مەماتی من فیراقی تۆ
بەڵێ پەری خەیاڵی تۆ عیلاجی شێت و هار ئەکا.

- ١٩٩١ لەڕوسیا ئاڵای سوری چەکوش و داس داگیراو گۆڕایەوە بەئاڵا کۆنەکەی ئەو وڵاتە.

## * ٨/٢٦

- ١٩٠٧ لەدایکبوونی ئەدیبی کورد (عەلائەدین سەجادی).

## * ٨/٢٧

- ١٩١٠ ئەدیسۆن لەداهێنانێکی نوێدا توانی فیلم بەوێنەو دەنگەوە بگرێ.
- ١٩٩١ سەربەخۆیی (مۆڵداڤیا) لە یەکێتی سۆڤیەت.
- ١٩٩٢ دەرچوونی بڕیاری (٨٨٦) لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە تایبەت بەقەدەغەکردنی سوڕانەوەی خوارووی هێڵی (٣٦) لەعێراق.

## * ٨/٢٨

- ١٧٤٩ لەدایکبوونی فەیلەسوفی ئەڵمانی (گۆتە).
- ١٩٦٥ کۆچی دوایی (ڕەشید عالی گەیلانی).
- ٢٠٠٤ کۆچی دوایی (م. شێخ خالید موفتی).
- ٢٠٠٧ (عەبدوڵڵا گویل) بوو بە سەرۆك کۆماری تورکیا[١].

---

[١] – عەبدوڵڵا گوڵ (٣٣٩) دەنگی پەرلەمانی بەدەستهێناو بوو بە یانزەهەمین سەرۆك کۆماری تورکیا، گوڵ لەساڵی (١٩٥٠) لەشاری قەیسەریە لەتورکیا لەدایکبووەو باوکی بەڕەچەڵەك عەرەبە، دەرچووی زانکۆی ئەستەنبوڵە لەبەشی ئابووری لەساڵی (١٩٧١)، لەساڵی (١٩٨٣) لەهەمان زانکۆ پلەی دکتۆرا بەدەست دەهێنێت و بەشداری چەندین پرۆگرامی لەزانکۆی (ئێکستەر) لەلەندەن کردووە، لەساڵانی (١٩٨٤–١٩٩١) لەبانکی گەشەپێدانی ئیسلامی لە(جەددە) وەك پسپۆڕێکی ئابووری کار کردووە، ساڵی (١٩٩١) وەك مامۆستای یاریدەدەر لەزانکۆ وانەکانی ئابووری نێودەوڵەتی وتۆتەوە، هەر لەو ساڵەدا

## * ٨/٢٩

- ١٧٩٧ کۆنگرەی (پاڵ) لەسویسرا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی جوولە[illegible] بەسترا.
- ١٩٦١ بڵاوبونەوەی ڕۆژنامەی (هەولێر) لەهەولێر.
- ١٩٦٦ لەسێدارەدانی (سەید قوتب) لەمیسر[1].

---

بوەتە ئەندام پەرلەمان لەسەر لیستی پارتی ڕەفاهی ئیسلامی ئەو کاتە، لەساڵی (١٩٩٣) بووەتە جێگری سەرۆکی پارتی ڕەفاه بۆ کاروباری دەرەوە، ساڵی (١٩٩٥) جارێکی تر وە[illegible] ئەندام پەرلەمان هەڵدەبژێردرێتەوە، لە ساڵانی (١٩٩٦)و (١٩٩٧) وەك وەزیری دەوڵەت [illegible] وتەبێژی حکومەت کاریکردووە، لەساڵی (١٩٩٩) لەسەر لیستی پارتی فەزیلەی ئیسلام[illegible] دەچێتەوە پەرلەمان، لە ساڵانی (١٩٩٢-٢٠٠٠) ئەندامی ئەنجومەنی پەرلەمانی کونسول[illegible] ئەوروپا بووە، ساڵی (٢٠٠١) لەلایەن ئەو ئەنجومەنەوە مەدالیای پێشکەشکراوە.

لەمانگی ئابی (٢٠٠١) لەگەڵ (ڕەجەب تەیب ئەردۆغان)دا (پارتی دادو گەشەپێدان[illegible] ڕادەگەیەنن، لە (٢٠٠٢) جارێکی تر دەچێتەوە پەرلەمان، هەر لە (٢٠٠٢) پاش سەرکەوتن[illegible] پارتی دادو گەشەپێدان لەهەڵبژاردنەکاندا دەبێتە (٥٨)ەمین سەرۆك وەزیرانی تورکیا، ل[illegible] (٢٠٠٣) دەبێتە جێگری سەرۆکی حکومەت و وەزیری دەرەوە، لە (٢٠٠٧) دەبێتەوە ئەندا[illegible] پەرلەمان، لە ٢٠٠٧/٨/٢٨ لەلایەن پەرلەمانی تورکیاوە وەك یانزەیەمین سەرۆك کۆما[illegible] هەڵدەبژێرێت، عەبدوڵڵا گول خێزاندارەو خاوەنی سێ منداڵە.

[1] - سەید قوتب ئیبراهیم حسین شازلی، لەگوندێکی سەر بەپارێزگای (ئەسیوت) لە[illegible] ١٩٠٦/١٠/٩ لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی هەر لەوێ تەواو کردووەو لە (١٠) ساڵیدا[illegible] قورئانی پیرۆزی هەمووی لەبەرکردووە، ساڵی (١٩٢٠) چۆتە قاهیرەو لە (مدرسة المعلمین) وەرگیراوە، پاشان چۆتە کۆلیژی (دارالعلوم)و ساڵی (١٩٣٣) بەکالۆریۆسی لە (ئاداب)دا وەرگرتووەو شەش ساڵ بۆتە مامۆستا، لەساڵی (١٩٤٩و ١٩٥٠) وەك نێردراوی وەزارەتی پەروەردە چۆتە ئەمریکا، لەتەمەنی لاویدا چۆتە (حیزبی وەفد)ەوەو ساڵی (١٩٤٢) وازی لێهێناوەو دە ساڵ بەبێلایەنی ماوەتەوە، ساڵی (١٩٥٢) پەیوەندی کردووە بە(کۆمەڵی

- ۱۹۷۰ دامەزراندنی (کۆڕی زانیاری کورد) لەبەغداد.

- ۲۰۰۳ تیرۆرکردنی (محمد باقر حەکیم) سەرۆکی (ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لەعێراق).

- ۲۰۰۵ کۆچی دوایی (مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس)[1].

---

برایانی موسڵمان)، لەشۆڕشی دژی پاشایەتیدا لەهەمان ساڵدا بەشداریبووە، لەسەردەمی کۆماریشدا (عەبدولناصر) سزاو ئازاری زۆریداو بە (۱۵) ساڵ حوکم درا، پاشان لەبەر خراپی باری تەندروستی لەساڵی (۱۹٦٤)دا بەلێبوردنێکی گشتی ئازادکرا، لەپاش چەند مانگێك لەگەڵ سەدان لاوی تردا لە ساڵی (۱۹٦٥)دا گیرایەوە، بەمۆڵەتی ڕابەری گشتی برایان لەو کاتەدا (م. حەسەن هوزەیبی) کرایە لێپرسراوی ڕێکخستنی تازەی برایان، پاش ئەوەی لەلایەن (جەمال عەبدولناصر)ەوە حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەردەچێت، لە ۱۹٦٦/٨/۲۹ حوکمەکە جێبەجێکرا.

سەید بەبیریارێکی گەورەی ئیسلامی هاوچەرخ دادەنرێت کەخزمەتێکی گەورەی پێشکەش بەئیسلام و موسڵمانان کرد، سەرەڕای چەندین کتێب و پەڕاوی بەنرخ، تەفسیرێکی ناوازەی بۆ قورئان دانا بەناوی (في ظلال القران)و گیانی خۆیشی لەرێگەیدا بەخت کرد.

[1] – زانای گەورەی کورد مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ناوی (عەبدولکەریم کوڕی محەمەد فەتاح مستەفا)یە، لەهۆزی (قازی) ناوچەی (سەید صادق) لەساڵی (۱۳۲۳)ی کۆچی لەدایك بووە، لەتەمەنی منداڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووەو لای دایکی پەروەردە کراوە، لای هەندێك مەلاو زانای ئەو کاتە خوێندنی دەست پێکردووەو لەگەرمەی جەنگی جیهانی یەکەمدا بەهۆی قات و قڕی و گرانی ڕوو دەکاتە بیارە، پاشان هاتۆتە سلێمانی و لای زانای گەورە (شێخ عومەری قەرەداغی) لەمزگەوتی خانەقای مەولانا، ماوەیەك لە تەکیەی تاڵەبانی لەکەرکوك دەبێتە مامۆستا، ساڵی (۱۹٦۰) ڕووی کردۆتە شاری بەغداو لەمزگەوت و قوتابخانەکەی (شێخ عەبدولقادری گەیلانی)دا دادەمەزرێت، بەدرێژایی ئەو ساڵانەی مامۆستا لەبیارەو سلێمانی و کەرکوك و بەغدا بووە، چ لەبواری دەرس و وانە وتنەوەدا یان لێکۆڵینەوەو فەتوادانەدا خزمەتێکی گەورەی بەوڵاتەکەی کردووە، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس سەرەڕای (تەفسیری نامی) و چەندین کتێبی ئایینی،

## * ٨/٣٠

- ١٩٤٠ کۆچی دوایی (جۆزێف تۆمسۆن) یەکەم دۆزەرەوەی ئەلکترۆن،
- ١٩٥٢ کۆچی دوایی (سەید ئەحمەدی خانەقا).
- ١٩٦٨ کۆچی دوایی مێژوونووسی کورد (ساڵح قەفتان).
- ١٩٩١ سەربەخۆیی (ئازەربایجان) لەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.

## * ٨/٣١

- ١٩٥٧ سەربەخۆیی (مالیزیا )لە بەریتانیا.
- ١٩٦٢ سەربەخۆیی (ترینیدادوتۆباگۆ) لەبەریتانیا.
- ١٩٦٧ کۆچی دوایی شاعیر مامۆستا (زەکی هەناری)[١].
- ١٩٩١ سەربەخۆیی (قیرغیزستان و ئۆزبەکستان) لەیەکێتی سۆڤیەت.
- ١٩٩٦ هێزەکانی حکومەتی عێراقی ڕووخاو هاتنە ناو شاری هەولێرەوەو هێڵی (٣٦)یان بەزاند.

---

لەبوارەکانی مێژوو و ئەدەب و زمانەوانیدا کتێبخانەکانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی دەوڵەمەند کردووە، هەروەها لێکدانەوەی بۆ شیعری زۆرێك لەشاعیرە کلاسیکیەکانی کورد کردووە، هەروەك خۆیشی لەبواری شیعردا دەستی باڵای هەبووەو نازناوی شیعری (نامی) بووە، مامۆستا پاش خزمەتێکی گەورە بەئاین و گەلەکەی لەبەرواری ٢٠٠٥/٨/٢٩ لەتەمەنی سەدوسێ ساڵیدا لەشاری بەغداد کۆچی دوایی دەکات و لەمزگەوتی (عەبدولقادری گەیلانی) بەخاك دەسپێردرێت.

[١] – مامۆستا زەکی هەناری لەخێزانێکی ڕۆشنبیری شاری کۆیە لەدایکبووە، سەرەتا گوڵستان و بوستانی خوێندووە، ماوەیەکیش لەلای (مەلای ڕەش) دەرسی خوێندووە، ساڵی (١٩٢٦) قوتابخانەی سەرەتایی لەکۆیە تەواوکردووە، ساڵی (١٩٢٨) (دار المعلمین) لەبەغداد تەواو کردووە، پاشان بووەتە مامۆستا لەقوتابخانەکانی کۆیەو ڕانیەو هەولێر، لەئابی (١٩٦٧) کۆچی دوایی کردووە.

# مانگی ئەیلوول (سێپتەمبەر)

## * ٩/١

- ڕۆژی ئاشتی جیهانی.
- ١٩٣٩ (جەنگی جیهانی دووەم) دەستی پێکرد[١].
- ١٩٩٥ دەرچوونی ژمارە سفری ڕۆژنامەی (ڕەسەن) لەدهۆك.
- ٢٠٠٠ دامەزراندنی (کۆمەڵەی خوێنبەخشانی کوردستان).

## * ٩/٢

- ١٩٢٧ بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەی (ژیان).
- ١٩٤٥ (یابان) پەیمانی تەسلیم بوونی بەئەمریکا مۆرکرد.
- ١٩٤٥ سەربەخۆیی (ڤێتنام) لەفەڕەنسا.
- ١٩٥٨ (عەبدولکەریم قاسم) ڕێگەی بە(مەلا مستەفای بارزانی)و هاوەڵانیدا بگەڕێنەوە بۆ عێراق.
- ١٩٨٩ دامەزراندنی (یەکێتی مافپەروەرانی کوردستان).

---

[١] – جەنگی جیهانی دووەم بریتی بوو لە ناکۆکی و پێکدادانێکی نێودەوڵەتی کە لە ٧ی تەمووزی (١٩٣٧) لەئاسیاو لە ١ی ئەیلوولی (١٩٣٩) لەئەورووپا دەستی پێکرد، وە بە سەرکەوتنی هاوپەیمانان و تەسلیم بوونی یابان و کەوتنی ئەڵمانیا لەساڵی (١٩٤٥)دا کۆتایی هات، ئەم جەنگە بەگەورەترین جەنگ دادەنرێت لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بەهۆی فراوانی شوێنی جوگرافی شەڕەکەو بەشداری زۆربەی وڵاتانی جیهان تیایدا، کە نزیکەی (٧٠) ملیۆن کەسی سەربازی و سیڤیل گیانیان لەدەستدا، کە دەکاتە (٢٪)ی دانیشتوانی جیهان لەو کاتەدا، هەر بەهۆی ئەم جەنگەوە ئابووری جیهان تووشی تێکشکان بوو وە لە (٧٠٪)ی ژێرخانی پیشەسازی ئەورووپا تیاچوو، وە لەئەنجامی ئەم جەنگەوە (نەتەوە یەکگرتووەکان) لەساڵی (١٩٤٥)دا پێکهێنرا.

- ٢٠٠٤ دەرچـوونی بڕیـاری ژمـارە (١٥٥٩)ی ئەنجومـەنی ئاسـایش تایبەت بە کشانەوەی هێزەکانی سوریا لەلوبنان.

**٩/٣ ***

- ١٩٧١ سەربەخۆیی (قەتەڕ) لەبەریتانیا.
- ١٩٩٩ کۆنگرەی سێیەمی (یەککگرتووی ئیسلامی کوردستان) لەهەولێر دەستی پێکرد.

**٩/٤ ***

- ١٩٨٠ دەستپێکردنی جەنگی هەشت ساڵەی (عێراق – ئێران).
- ١٩٩١ دامەزراندنی (پارتی پارێزگارانی کوردستان).

**٩/٥ ***

- ١٥٦٦ کۆچی دوایی (سوڵتان سلێمانی قانوونی)[١].
- ١٨٦٩ کۆچی دوایی (جمێس کلارك ماکسویل) داهێنەری هاوکێشە گرنگەکانی کارۆموگناتیسی. .
- ١٩٨٨ شاڵاوی (بەناو ئەنفال)ی هەشت بۆ سەر ناوچەکانی بناری قەندیل دەستی پێکرد.
- ١٩٩١ کۆچی دوایی مێژوونووسی کورد (حەیدەر عەلی سلێمان).

---

[١] – سوڵتان سلێمانی قانوونی یاخود (سلێمانی یەکەم)، ساڵی (١٤٩٤) لەدایکبووە، دەیەم سوڵتانی عوسمانیە لەساڵانی (١٥٢٠–١٥٦٦) کە لەپاش سوڵتان سەلیمی یەکەمی باوکی بۆتە سوڵتان، لەسەردەمی ئەم سوڵتانەدا دەوڵەتی عوسمانی گەیشتە ئەوپەڕی دەسەلات، کەتوانی درێژە بەسەرکەوتنەکانی باوکی بداو سەرکردایەتی (١٣) شەڕی کردو دەوڵەتی عوسمانی بوژاندەوە، هەروەها یارمەتیەکی زۆری زانست و ئەدەبی داوەو بەدەستی خۆی (٨) جار قورئانی نووسیوەتەوەو یاسای گرنگی هێناوەتە ناو دەوڵەتەکەیەوە.

## * ٩/٦

- ١٩٣٠ شەڕی بەردەرکی سەرا (ئەیلولی ڕەش) لەسلێمانی.
- ١٩٥٩ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ڕای گەل).
- ١٩٦٢ کۆچی دوایی شاعیری کورد (فەتحی)[١].
- ١٩٦٥ جەنگی دووەمی نێوان (هیندستان و پاکستان) هەڵگیرسا.
- ١٩٦٨ سەربەخۆیی (سوازیلاند) لەبەریتانیا.

## * ٩/٧

- ١٨١٢ جەنگی نێوان (ڕوسیا)و (فەڕەنسا بەسەرۆکایەتی ناپلیۆن).
- ١٨٢٢ سەربەخۆیی (بەڕازیل) لە پورتوگال.
- ١٩٩٧ کۆچی دوایی (مۆبۆتۆسیسیکۆ)ی سەرۆکی پێشووتری زائیر.

## * ٩/٨

- ڕۆژی جیهانی نەهێشتنی نەخوێندەواری.
- ١٩٠٨ کۆچی دوایی نووسەری میسری (قاسم ئەمین).
- ١٩١٢ کۆچی دوایی نووسەر (تاهیر سادق) لەکۆیە.

---

١- فەتحی، ناوی (شێخ فاتیحی کوڕی شێخ فەتاحی شێخ ئیسماعیلی دۆلانە) لەساڵی (١٩١٨) لەگوندی (دۆلان)ی ناوچەی قەرەداغ لەبنەماڵەیەکی ئایینی هاتۆتە دنیاوە، هەر بەمنداڵی چۆتە بەرخوێندن و، لەدوای کۆچی باوکی لەجێگەی ئەو ئیرشادی خەڵکی کردووە، چونکە باوکی خاوەن تەکیەو دیوەخان بووە، فەتحی کۆمەڵێك بەرهەمی وەرگێڕاوی هەیە بۆ سەر شێوەزاری سۆرانی و هەورامی، لەوانە: (شانامەی فیردەوسی، کاوەو فەرەیدون، زاڵنامە، ڕۆستەم و مەنیجە، بێژەن، کیمیای سەعادەت، یوسف و زلێخا، شیرین و فەرهاد، ڕۆستەم و برزوو)و چەندین بەرهەمی تر، لەئەیلولی (١٩٦٢) کۆچی دوایی کردووەو لەگردی شێخ فەتاحی باوکی لەسلێمانی بەخاك سپێردراوە.

- ١٩٣٣ (ئەمیر غازی) بوو بەمەلیکی عێراق[1].
- ١٩٧٠ کۆچی دوایی (پێرسی سپێنسەر) داهێنەری یەکەمین فڕنی مایکرۆوەیڤ.
- ١٩٧٨ شەڕ لەنێوان ڕژێمی شای ئێران و گەلانی ئێران ڕوویدا.

## * ٩/٩

- ١٥٧٠ فەتحی شاری (لفوکشا) لەلایەن سوڵتانی سەلیمی دووەمەوە.
- ١٨٩٣ دامەزراندنی یانەی وەرزشی (شتوتگارت)ی ئەڵمانی.
- ١٩٤٨ سەربەخۆیی (کۆریای باکوور).
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی (ماوتسی تۆنگ)[2].

---

[1] – غازی کوڕی فەیسەڵ کوڕی حسەین کوڕی عەلی لەخێزانی هاشمیە، دوای کۆچی دوایی مەلیک فەیسەڵی باوکی کە لەسالانی (١٩٢١–١٩٣٣) پاشای عێراق بووە، لەساڵی (١٩٣٣) بووەتە مەلیکی عێراق، پێشتریش لەسەردەمی باوکیدا لەساڵی (١٩٢٤) وەلی عەهدی عێراق بووە، لە ١٩٣٩/٤/٣ کوژراوەو مەلیک فەیسەڵی دووەم جێگەی گرتۆتەوە.

[2] – (ماوتسی تۆنگ)، پێشڕەوی (پارتی کۆمۆنیستی چین)و پێشەوای سیاسی گەلی چینە، بەلێهاتوویی خۆی گەیشتە دەسەلات و بۆماوەی (٢٧) ساڵ سەرۆکایەتی گۆڕانکاری کرد لەولاتدا، (ماوتسی تۆنگ) لەساڵی (١٨٩٣) لەهەرێمی (هاتان)ی چین لەدایکبووە، ساڵی (١٩١٨) خوێندنی تەواوکردووەو لەکتێبخانەی (زانکۆی پەکین) دامەزراوە، هەر لەوێشدا کەوتە خوێندنەوەو بایەخدان بە (مارکسیزم)، بوو بە یەکێك لەدامەزرێنەرانی (پارتی کۆمۆنیستی چین)و دواتر لەساڵی (١٩٣٥) بوو بە سەرۆکی پارتەکە، ساڵی (١٩٤٧) بەسەرکردایەتی (ماوتسی تۆنگ) پارتی کۆمۆنیست کەوتە جەنگەوە دژی (چان کای چیك)ی سەرۆکی دەوڵەت، لە (١٩٤٩) سەرکەوتنیان بەدەستهێناو دەسەلاتیان گرتە دەست و (ماو) بوو بەسەرۆکی (ئەنجومەنی حکومەتی چینی میللی)، ولاتی بەرەوپێش بردو چەند هەنگاوێکی گرنگی بۆ گۆڕینی ولات نا، لە ساڵی (١٩٧٦) کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٨٤ کۆچی دوایی دەرهێنەری سینەمایی کورد (یەڵماز گۆنای)[١].
- ١٩٩١ سەربەخۆیی (تاجیکستان) لە یەکێتی سۆڤیەت.
- ٢٠٠٠ (ئەریل شارۆن) سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل چووە ناو حەرەمی قودس و بووە هۆی هەڵگیرسانی ڕاپەڕینی ئەقصا.
- ٢٠٠١ کوژرانی (ئەحمەد شامەسعود) لەئەفغانستان.
- ٢٠٠٣ کۆچی دوایی (ئیدوارد تیلەر) یەکەم داهێنەری بۆمبی هایدرۆجینی.

## * ٩/١٠

- ١٩١٠ کۆچی دوایی نووسەری جیهانی (تۆڵستۆی)[٢].
- ١٩٤٤ سەربەخۆیی (بولگاریا).
- ١٩٦٠ دامەزراندنی (ڕێکخراوی ئۆپیك).

---

[١] – دەرهێنەری بەناوبانگی کوردی تورکیا یەڵماز گۆنای، لەساڵی (١٩٣٧) لەشاری (دیاربەکر)ی باکووری کوردستان لەدایکبووە، خوێندنی ئابووری لەزانکۆی ئەنقەرە تەواوکردووە، لەماوەی ساڵانی پەنجاکان بۆ سەرەتای هەشتەکان چەند جارێك لەسەر بیری کۆمۆنیستی دەستگیرکراوە، گۆنای دەڵێت: (لەساڵی (١٩٦٥)دا بووم بەیەکێك لەئەکتەرە هەرە ناودارەکان و گەیمە هەرەتی شۆرەت)، ساڵی (١٩٨١) ئازادکراوە، گرنگترین فیلمی گۆنای (ڕێگا)یەو دوایین فیلمی (دیوار)ەو لەفەرەنسا بەرهەم هاتووە، گۆنای جگە لەکاری سینەما، (٥) ڕۆمان و چەندین کورتە چیرۆکی نووسیوە.

[٢] – تۆڵستۆی بیرمەندێکی ڕوسیەو لەساڵی (١٨٢٨) لەدایکبووە، تۆڵستۆی لەخوێندنی زمانەوانیدا وازی هێناو خۆی بەخوێندنی یاساوە خەریك کردووە، ساڵی (١٨٥٤) پلەی ئەفسەری پێدراوەو لەشەڕی قەوقازدا بەشداری کردووە، مێژووی ژیانی خۆی لە سێ کتێبی جیاداو لە سێ کاتی جیادا بڵاوکردۆتەوە بەناوی (منداڵی)، (لاوی)، (هەرزەکاری)، یەکەم چیرۆکی بەناوی (شەڕو ئاشتی) لەساڵی (١٨٦٩)دا نووسیوە.

## * ٩/١١

- ١٩٣٧ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (زیان) لەلایەن (سالح قەفتان)ەوە[1].

- ١٩٦١ دەستپێکردنی (شۆڕشی ئەیلول) لەکوردستانی عێراق.

- ١٩٧٥ کۆچی دوایی مێژوونووسی کورد (ئایەتوڵڵا محەمەد مەردۆخی).

- ١٩٩١ دامەزراندنی (تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان) لەسلێمانی.

- ٢٠٠١ تەقاندنەوەی هەردوو بینای سەنتەری بازرگانی جیهانی و بەشێك لە بارەگای وەزارەتی بەرگری ئەمریکی (پنتاگۆن) لەنیویۆرك و واشنتۆن.

## * ٩/١٢

- ١٩٢٠ (شێخ مەحموودی حەفید) بوو بەحوکمداری سلێمانی.

- ١٩٨٠ کودەتا سەربازیەکەی تورکیا بەسەرۆکایەتی (کەنعان ئیڤرین).

---

[1] - (زبان) وەك ڕۆژنامەیەکی ئەلتەرناتیڤی (ژیان) دەرچوو، چونکە (مەجید یەعقوبی) موتەسەریفی سلێمانی لە (ژیان) ڕازی نەبوو، وادیارە ناکۆکیەکە شەخصی و دژی پیرەمێردی سەرنووسەری ژیان بوو، لایەنی بەرپرس لەدەرکردنی (زبان) شارەوانی سلێمانی بوو، (سالح قەفتان)یش سەرنووسەری بوو، (زبان) ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی شەش لاپەڕەیی بوو، ڕێك بەقەبارەی خودی (ژیان)، بەتیراژی (٣٠٠-٥٠٠) دانە چاپ دەکراو (٤٧) کەس ئابوونەیان تێیدا هەبوو، دانەیەکیش بۆ (شێخ مەحمود) ڕەوانە دەکرا کە بۆ باشووری عێراق دوورخرابۆوە، دانەیەکیش بۆ پسپۆڕی کاروباری کورد (مینۆرسکی)و شەش دانە بۆ (ئەدمۆنز) لەبەغداد، بۆئەوەی بۆ هەڵگرتن بینێرێتە ئەورووپا، دوایین ژمارەی (زبان) کەژمارە (٩٤) بوو لە ١٩٤١/١/١٨ دەرچووە، بەڵام نەزانراوە لەبەرچی ڕاگیراوە، لەوانەیە وەستانەکەی پەیوەست بێت بەدووەمین جەنگی جیهانیەوە.

- ١٩٩٢ كۆچی دوایی زانای كورد (ڕەشاد موفتی) لەهەولێر[١].

## * ٩/١٣

- ١٩٧٣ لەدایكبوونی یاریزانی ئیتاڵی (فابیۆ كاناڤارۆ)[٢].
- ١٩٩٣ ڕێكەوتنی ئیسرائیل و ڕێكخراوی ئازادیخوازی فەڵەستینی لەسەر بەخشینی ئۆتۆنۆمی بەفەڵەستینیەكان لەغەزەو ئەریحا.

## * ٩/١٤

- ١٩٦٩ كۆچی دوایی (شێخ جەمیل موفتی).
- ١٩٨٥ كۆچی دوایی شاعیر مەلا حەسەنی كوردی (هشیار).
- ١٩٩٢ دامەزراندنی (زانكۆی دهۆك).
- ١٩٩٥ تیرۆركردنی (د. محەمەد قەرەداغی) ڕاگری كۆلیژی كارگێڕی و ئابووری زانكۆی سەلاحەدین.

---

[١] - ڕەشاد موفتی، كوڕی محەمەد ئەفەندی مەلا عوسمانی ئەبوبەكر ئەفەندیە، ساڵی (١٩١٥) لەهەولێر لەدایكبووە، پاش خوێندنی سەرەتایی چۆتە حوجرەو زانستە شەرعیەكانی خوێندووە، لە (١٩) ساڵیدا چووە بۆ میسرو لە زانكۆی (ئەزهەر) خوێندنی تەواوكردووە، لە (١٩٣٦) گەڕاوەتەوە بۆ هەولێرو لەلای باوكی خوێندنی شەرعی تەواو دەكات و ئیجازەی عیلمی وەردەگرێت، دوای كۆچی باوكی لە (١٩٤٦) بووەتە (وتار خوێن)و یەكەم كەس بووە لەهەولێردا وتاری هەینی بەزمانی كوردی خوێندۆتەوە، لە (١٩٥٦) بووە بەقازی لە كەركوك و پاشان لەسلێمانی و هەولێر، لەساڵی (١٩٧٢) بووە بەئەندامی یاریدەدەری (كۆڕی زانیاری كورد)، ڕەشاد موفتی زاناو شاعیرێكی بەتوانای كوردەو زۆربەی شیعرەكانی ئایینین و چەندین بەرهەمی شیعری و ئەدەبی و ئایینی و زانستی هەیە.

[٢] - (فابیۆ كاناڤارۆ)ی یاریزانی ئیتاڵی لە ١٣ی ئەیلولی (١٩٧٣) لە شاری (ناپۆلی) لەدایكبووە، درێژی (١٧٦) سانتیمەترەو كێشی (٧٥) كیلۆگرامە، شوێنی یاریكردنی لەیاریگەدا لە هێڵی بەرگریدایە، لەڕیزی یانەكانی (ناپۆلی، پارما، ئینتەرمیلان، یۆڤنتۆس، ڕیاڵ مەدرید) یاری كردووە، ساڵی (٢٠٠٦) بەیەكەمی جیهان هەڵبژێردراوەو خەڵاتی تۆپی زێڕینی وەرگرتووە.

- ٢٠٠٠ یەکەمین کۆنگرەی (سەندیکای کارمەندانی تەندروستی کوردستان) لەسلێمانی.

## * ٩/١٥

- ١٨٢١ سەربەخۆیی (سلڤادۆر) لەئیسپانیا.
- ١٨٩٨ لەدایکبوونی (قانع)ی شاعیر لەگوندی (ڕیشێن) لەشارەزوور.
- ١٩١٧ ڕوسیا بوو بە(یەکێتی سۆڤیەت).
- ١٩٧٢ کۆچی دوایی (بەنگینە)ی شاعیر.

## * ٩/١٦

- ڕۆژی جیهانی پاراستنی چینی ئۆزۆن.
- ١٨١٠ سەربەخۆیی (مەکسیك) لەئیسپانیا.
- ١٨٩٠ تێکشکاندنی کەشتیەکی عوسمانی لەئاوەکانی یاباندا و کوژرانی (٥٥٠)کەس.
- ١٩٣١ لەسێدارەدانی شۆڕشگێڕی لیبیی (عومەر موختار)[١].
- ١٩٤٢ دامەزراندنی (کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان) لەسابلاغ.
- ١٩٤٢ دەرچوونی گۆڤاری (ژیانەوەی کورد) لەلایەن (میرحاج).

---

[١] - عومەر موختار، پێشەوایەکی ئایینی و سیاسی و سەرکردەیەکی تێکۆشەری لیبیایە، ساڵی (١٨٥٨) لە (برقە) لەدایکبووە، زانستی شەرعی خوێندووەو چەند کارێکی ئایینی گرتۆتە دەست، کاتێك ئیتاڵیەکان لەساڵی (١٩١١) چەند شوێنێکی لیبیایان داگیرکرد، عومەر موختار دەستی دایە شۆڕش و خەڵکێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە، چەندین شەڕو پێکدادان لەنێوان عومەر موختارو داگیرکەرە ئیتاڵیەکاندا ڕوویداو تاکو ساڵی (١٩٣١) شۆڕشەکە درێژەی کێشا، بەڵام لەئەیلوولی ئەو ساڵەدا لەبۆسەیەکی ئیتاڵیەکاندا دەستگیرکراو فەرمانی سێدارەدانی بەسەردا دراو لە ١٦ی ئەیلوولی (١٩٣١)دا لەشاری (بەنغازی) لەسێدارەدرا.

## * ٩/١٧

- ١٩٧٠ كوشتاری فەلەشتینیەكان لەلایەن (شاحوسێن)ی مەلیكی ئەردەنەوە.

- ١٩٩٢ تیرۆركردنی (د.صادقی شەرەفكەندی) لەبەرلین[1].

- ١٩٩٨ ڕێكەوتننامەی (واشنتۆن) لەنێوان یەكێتی و پارتیدا بۆ ئاشتبوونەوەی گشتی مۆركرا.

## * ٩/١٨

- ١٨١٨ سەربەخۆیی (چیللی) لە ئیسپانیا.

- ٢٠٠٠ ڤستیڤاڵی (جزیری) لەشاری دهۆك بەڕێوەچوو.

- ٢٠٠٥ كۆچی دوایی هونەرمەند (مەرزیەی فەریقی).

## * ٩/١٩

- ١٨٦٧ كۆچی دوایی (بەدرخان پاشا).

- ١٩٣٢ (مەلیك عەبدولعەزیز) مەملەكەتی سعودیەی ناوناو ئەم ڕۆژە بوو بە ڕۆژی نیشتمانی سعودیە.

---

[1] – د. صادق شەرەفكەندی، ساڵی (١٩٣٧) لەگوندی (شەرەفكەندی) سەر بەناوچەی (بۆكان)ی ڕۆژهەڵاتی كوردستان لەدایكبووە، نازناوی (د. سەعید)ەو برای (هەژار)ی شاعیرە، ساڵی (١٩٥٩) بڕوانامەی لیسانسی لە كیمیادا لەزانكۆی تاران وەرگرتووە، لە (١٩٧٢) چۆتە پاریس و بڕوانامەی دكتۆرای بەدەستهێناوە، ساڵی (١٩٧٦) گەڕاوەتەوە بۆ ئێران و وەك پرۆفیسۆری یاریدەدەری كیمیا لەزانكۆی تاران دامەزراوە، ساڵی (١٩٧٣) لەپاریس (د. قاسملۆ)ی بینیوەو هەر لەوكاتەوە چۆتە ناو ڕیزەكانی پارتی دیموكراتی كوردستانی ئێرانەوە، لە (١٩٧٩) كراوە بەجێگری سكرتێری گشتی ئەو پارتە، پاش تیرۆركردنی (قاسملۆ) لە ساڵی (١٩٨٩) بەسكرتێری گشتی حیزب هەڵبژێردراوە، ساڵی (١٩٩٢) لەكۆنگرەی ناسیۆنالیستی جیهان لەبەرلین تیرۆركراوە.

## * ٩/٢٠

**- ١٩٢٣ بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال) لەسلێمانی[1].**

**- ١٩٤٧ کۆچی دوایی مێژوونووسی کورد (حسێن حوزنی موکریانی)[2].**

**- ٢٠٠٣ تیرۆرکردنی خاتوو (عەقیلە هاشمی) ئەندامی (ئەنجومەنی حوکم) لەعێراق.**

---

[1] - ئومێدی ئیستیقلال، ڕۆژنامەیەکی (سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی، ڕەسمیە، هەفتەی جارێک دەردەچێت)، ئەم ڕۆژنامەیە ئۆرگانی حکومەتی شێخ مەحمود بوو، کەپاش چۆلکردنی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە شێخ مەحمود لەسلێمانی دەری دەکرد، یەکەم ژمارەی لە ١٩٢٣/٩/٢٠ دەرچووە، دوایین ژمارەشی کە ژمارە (٢٥)ە، لەڕۆژی پێنج شەممە ١٩٢٤/٥/١٥ دەرچووەو لەچاپخانەی حکومەت لەسلێمانی چاپ دەکرا، لە ژمارە یەکەوە تاژمارە سێ (خواجە ئەفەندی زادە)و (ئەحمەد سەبری) بەڕێوەبەرو بەرپرسی بوون، لەژمارە چوارەوە تا ژمارە سیانزە (ڕەفیق حیلمی) بەڕێوەبەرو سەرنووسەری بوو، (حسێن نازم)یش لەژمارە چواردەوە تا ژمارە حەڤدە بەڕێوەبەرو سەرنووسەری بوو، بەڵام لەوەودوا ناوی سەرنووسەر نەدەنووسرا، پێدەچێت ئەو پلەیە هەر نەمابێت لەڕۆژنامەکەدا.

[2] - حوزنی موکریانی، ناوی حوسێن کوڕی سەید عبدوللەتیفی شێخ سمایلی شێخ عیسای شێخ لەتیفە، لە ١٨٩٣/٩/١٢ لەشاری مەهابادی کوردستانی ئێران لەناوچەی موکریان لەدایك بووە، لەئەیلولی (١٩٤٧)یشدا لەبەغداد (هەروەك دەڵێن) ژەهران خواردوو کراوە، حوزنی لەتەمەنی ١٢ ساڵیدا شارەکەی خۆی بەجێ هێشتووەو زۆر شارو وڵاتان گەڕاوە، وەك: (سوریاو ئەفغانستان و ئەرمینیاو ڕووسیاو تورکیا)، لەپاڵ زمانی کوردیدا زمانەکانی (عەرەبی و تورکی و فارسی و ئەفغانی و هیندی و ڕووسی) زانیوە، سەرباری شارەزایی باش لەهەردوو زمانی (ئینگلیزی و فەڕەنسی)، گرنگترین کاری حوسێن موکریانی لەبواری ڕۆژنامەنووسیدا دەرکردنی (زاری کرمانجی) بوو لەڕەواندز، لەهەولێریش (ڕووناکی) دەکرد، لە (١٩٣٤)یشدا یارمەتی پیرەمێردی دا بۆ چاککردنەوەی چاپخانەکەی، بۆ ماوەیەکیش لەگەڵ پیرەمێرددا لەدەرکردنی (ژیان)دا بەشداربوو، لەجەنگی جیهانی دووەمیشدا ئینگلیزەکان ناچاریان کرد (دەنگی گێتی تازە) دەربکات.

## * ٩/٢١

- ١٨٦٠ كۆچی دوایی فەیلەسوفی ئەڵمانی (شۆبنهاوەر).
- ١٩٦٤ سەربەخۆیی (ماڵتا) لەبەریتانیا.
- ١٩٧٠ دامەزراندنی (یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان).
- ١٩٨١ سەربەخۆیی (بلیز) لەبەریتانیا.
- ٢٠٠٢ دەرچوونی ژمارە سفری ڕۆژنامەی (جەماوەر).

## * ٩/٢٢

- ١٢١١ کۆچی دوایی زانای گەورە (ئیبن خەلەکان).
- ١٥٢٠ کۆچی دوایی (سوڵتان سەلیمی یەکەم).
- ١٨٤٢ لەدایکبوونی (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم).
- ١٩٧٣ کۆچی دوایی مێژوونووسی کورد (ڕەمزی قەزاز).
- ١٩٧٦ لەدایکبوونی یاریزانی بەڕازیلی (ڕۆناڵدۆ)[1].

---

[1] - ڕۆناڵدۆ، ناوی (ڕۆناڵدۆ لویز نازاریۆ دالیمایە)، درێژی (١٨٤) سانتیمەترەو کێشی (٨٨) کیلۆگرامە، شوێنی یاریکردن لەناویاریگادا (هێرشبردن)ە، لە ١٩٩٤/٣/٢٣ لەیەکەمین یاری نێودەوڵەتی لەبەرامبەر ئەرژەنتین یاری کردووە، ئەو یانانەی یاری تیاکردووە: (ڕامۆس کلەپ، سان کریستۆڤان، کرۆزیرۆ، ئایندهۆڤن، بەشەلۆنە، ئینتەرمیلان، ڕیاڵ مەدرید، لەڕیزی ڕیاڵ زیاتر لە (١٠٠٠) گۆڵی تۆمارکردووە، ئەی سی میلان. ئەو نازناوانەی ڕۆناڵدۆ بەدەستی هێناوە: (نازناوی گۆلکاری خولی هۆڵەندا (١٩٩٤-١٩٩٥)، گۆلکاری خولی ئیسپانیا لەگەڵ بەرشەلۆنە لەوەرزی (١٩٩٦-١٩٩٧)، گۆلکاری خولی ئیسپانیا لەگەڵ ڕیاڵ مەدرید لەوەرزی (٢٠٠٣-٢٠٠٤)، خەڵاتی براڤۆ لەساڵانی (١٩٩٧)و (١٩٩٨)، پێڵاوی زێڕین (١٩٩٧) (باشترین گۆلکار لەئەورووپا)، باشترین یاریزان بەپێی پۆلێنی فیفا ساڵانی (١٩٩٦)و (١٩٩٧)و (٢٠٠٢)، باشترین یاریزان لەساڵی (١٩٩٨)، باشترین یاریزان لەجامی ئینتەر کۆنتینێتال (٢٠٠٢)، خەڵاتی تۆپی زێڕین لەساڵانی (١٩٩٧)و (٢٠٠٢).

## * ٩/٢٣

- ١٨٨٠ ونبوونی پیاوێك بەناوی (دەیویدلینگ)[١].
- ١٩٧٣ کۆچی دوایی شاعیری شیللی (بابلۆ نیرۆدا).
- ١٩٧٥ کۆچی دوایی شاعیری کورد (مەلا مستەفای عاصی)[٢].

---

[١] – لە بەرواری ١٨٨٠/٩/٢٣ پیاوێك بەناوی (دەیویدلینگ) بەخێزانی ڕاگەیاند کەپێش ئەوەی بەرەو شار بەڕێ بکەوێت نیازی وایە سەردانی ئەسپەکانی بکات، بەڵام هێشتا چەند هەنگاوێك دوور نەکەوتبۆوە کە لەناکاو لەبەر چاوی ژن وهەردوو منداڵەکەی و پیاوێکی دیکە ون بوو، هەموو ئامادەبووان وایانزانی کە (لینگ) پێی خلیسکاوەو کەوتووە، بەڵام بچووکترین نیشانەیەکیان لێ بەدی نەکرد لەو شوێنەدا، ئیدی (دەیویدلینگ) هەرگیز نەدۆزرایەوە...! لەبارەی ئەم ونبوونە سەرسوڕهێنەرەو وێنەی ئەمە تائێستا زاناکان نەیانتوانیوە وەڵامێکی دڵنیاکەر بدەنەوە، (٧)ساڵ بەر لەم ڕووداوە ڕووداوێکی هاوشێوەی ئەمە لەئۆتێلێکی شاری لیۆنی بەریتانیا ڕوویدا بەلام تووشبوو کەناوی (کامپیس) بوو لەلایەن خێزانەکەیەوە ڕزگارکرا!

[٢] – عاصی، ناوی (مەلا مستەفای کوڕی مەلا ڕەسوڵ محەمەد)ە، ساڵی (١٣١٠)ی کۆچی لەدایکبووە، بە کوردی عەرەبی و فارسی شیعری نووسیوەو زۆربەی شیعرەکانی ئایینی و غەزەل و نیشتمانین، شاعیر لەپارچە شیعرێکدا ڕوو لەنەتەوەکەی خۆی دەڵێت:

قەوم و میللەت تێ بفکرن نیشتمان چی هات بەسەر
بەردی بنچینەی وجوودم وا خەفەت هێنایەدەر
خاك و بەردو دارو ئاوی ئەورووپایی و ئەجنەبی
چەند هەزار نەوعە مەعادن وا لەوان هێنایەدەر
لەم هەموو ئافاتی دونیا چونکە کورد ئێکی نەگرت.
سەیری کەن مادونی خۆیان دەردی چۆن هێنایەدەر
تا کەی ڕازین بەزیللەت لەم مەقامە کاکی کورد
چاو لەدەستی ئەجنەبی بێ، بێ مردو قوڕ بەسەر.

- ١٩٧٩ كۆچی دوایی زانای گەورە (ئەبوئەعلای مەودودی)[1].

## * ٩/٢٤

- ١٩٩٦ تیرۆرکردنی (د. محەمەد باجەلان) لەهەولێر.

## * ٩/٢٥

- ١٩١٨ دامەزراندنی (کۆمەڵەی تەعالی و تەرەقی کورد).
- ١٩٦٠ ڕۆژی هەڵگرتنی توندوتیژی لەسەر ژنان (ڕوبانی سپی).
- ١٩٩٢ کۆچی دوایی مەنتق زان (مستەفا هیرانی).

---

عاصی شاعیر بەخوێندن و مەلایەتی زۆر لەدێهاتەکانی کوردستان گەڕاوەو ماوەیەك لە گوندی (تەلان) ماوەتەوە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ شاری کۆیەو لەوێ جێگیر بووە، تا لە ١٩٧٥/٩/٢٣ کۆچی دوایی.کردووەو لەگۆڕستانی (شەهیدان) لەکۆیە بەخاك سپێردراوە.

[1] – ئەبو ئەعلای کوڕی سەید ئەحمەد، لە ١٩٠٣/٩/٢٥ لە (جیلی بورە بارونج ئاباد)ی وڵاتی (هیند) لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی و زانستە ئیسلامیەکان و زمانی فارسی لەسەر دەستی باوکی فێربووە، بۆ یەکەم جار لەتەمەنی ١٦ ساڵیدا وەك ڕۆژنامەنووس لە ڕۆژنامەی (شار) و (تاج) کاری کردووەو، دواتر بووەتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (موسڵمان)، ساڵانی (١٩٢١-١٩٢٩) سەرقاڵی قووڵبوونەوەو توێژینەوەبوو لەزانستە ئیسلامیەکانداو دوو کتێبی گرنگی دانا بەناوەکانی (سەرچاوەی هێزی موسڵمانان) و (جیهاد لەئیسلامدا)، هەروەها لەماوەی چوار مانگدا فێری زمانی ئینگلیزی بوو، ساڵی (١٩٣٢) بەڕێوەبەرایەتی گۆڤاری (تەرجومانی قورئان)ی گرتەدەست و بەردەوام بوو لەسەری تاکۆتایی ژیانی، لەئابی (١٩٤١) (کۆمەڵەی ئیسلامی) دامەزراند کەتائیستاش لەپاکستان بەهەمان ناو بەردەوامە، مەودودی بەیەکێك لەنوێخوازەکانی سەدەی پێشوو دادەنرێت لەنیوەدوورگەی هینداو خاوەنی چەندین نووسراوە، لەوانە: (تەفسیری قورئانی پیرۆز، بەرەو ڕێبازی ئیسلام، شارستانێتی ئیسلامی، بنچینەکانی ئیسلام، دەربارەی ئایین و دەوڵەت، بنەما ئابووریەکانی نێوان ئیسلام و ڕژێمە هاوچەرخەکان).

**- ٢٠٠٣ کۆچی دوایی بیریاری عەرەبی (ئیدوارد سەعید)[1].**

# * ٩/٢٦

**- ١٨٦٨ دامەزرانـــدنی یەکـــەمین ئەنجومـــەنی شـــارەوانی لەبەغـــداد لەسەردەمی (مەدحەت پاشا).**

**- ١٩٠٧ سەربەخۆیی (نیوزلەند) لەبەریتانیا.**

**- ١٩٦٢ شۆڕشی یەمەن و سەربەخۆیی ئەو وڵاتە.**

**- ١٩٩٥ سازدانی سێهەمین کـۆنگرەی نێودەوڵـەتی سـەبارەت بـە زانـای کورد (م. سەعید نورسی) لەتورکیا.**

---

١ - ئیدوارد وەدیع سەعید لە ١٩٣٥/١١/١ لەشاری قودسی فەلەستین لەدایکبووە، ساڵی (١٩٤٨) پاش ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لەگەڵ خانەوادەکەی قودس بەجێدەهێڵن و ڕوودەکەنە میسر، ساڵی (١٩٥٠) وەك خوێندکاری زانکۆ دەچێت بۆ ئەمریکا، لەزانکۆی (هارڤەرد) خوێندنی ئەدەبی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتاڵی و یۆنانی و ڕۆمانی دەخوێنێت، ساڵی (١٩٥٧) لەزانکۆی (برنستۆن) خوێندن تەواو دەکات، ساڵی (١٩٦٣) وەك مامۆستای ئەدەبی ئینگلیزی و ئەدەبی بەراوردکاری لەزانکۆی کۆڵۆمبیا دەست بەکاردەبێت، ساڵی (١٩٦٤) لەزانکۆی هارڤەرد بڕوانامەی دکتۆرا لەئەدەبی بەراوردکاریدا وەردەگرێت، هێرشی دڕندانەی ئیسرائیل و داگیرکردنی لێواری ڕۆژئاوا لەساڵی (١٩٦٧) کە بەشەڕی (شەش ڕۆژە) ناسراوە، ئیدواردیان هاندا بۆناو ژیانی سیاسی، ساڵی (١٩٧٠) بوو بەئەندام لەکۆنگرەی نەتەوەیی فەلەستین، ساڵی (١٩٧٠) ژنی هێناوەو دوو منداڵی هەیە بەناوەکانی (وەدیع - نەجلا)، ساڵی (١٩٩١) کاتێك پێی وابوو (یاسر عەرەفات) خۆی داوەتە دەست ئەمریکیەکان دەستی لەپۆستەکەی کێشایەوە کەئەندامێتی بوو لە کۆنگرەی نەتەوەیی فەلەستین، دوای دووساڵیش کە ڕێکەوتننامەی ئۆسلۆ ئیمزاکرا، ئیدوارد ڕێکەوتننامەکەی ئیدانەکردو بەئالیەتێکی خۆبەدەستەوەدانی فەلەستین ناوی برد، لە ١٩٩٩/١٠/٢٤ لەهۆڵی کەنیسەی (نیۆکێرك) لەشاری لاهای هۆڵەندا خەڵاتی (سپینۆزا)ی وەرگرت، ئیدوارد سەعید پاش نەخۆشیەکی درێژخایەن لەڕۆژی پێنج شەممە ٢٠٠٣/٩/٢٥ لەشاری نیویۆرك لەتەمەنی (٦٨) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

## * ٩/٢٧

- ١٩٩٦ بزووتنەوەی تاڵیبان کابولی پایتەختی ئەفغانستانی گرت و (نجیب الله)ی سکرتێری حیزبی شیوعی ئەفغانستانی کوشت کەدوا دەسەڵاتی سۆڤیەت بوو لەو وڵاتەدا.
- ١٩٩٨ کۆچی دوایی نووسەری عیراقی (هادی عەلەوی) لەدیمەشق.

## * ٩/٢٨

- ١٨٩٥ کۆچی دوایی (لویس پاستۆر)[١].
- ١٩٦٣ دامەزراندنی ڕادیۆی (دەنگی کوردستانی عێراق)، دەنگی (پارتی دیموکراتی کوردستان).
- ١٩٨٥ کۆچی دوایی نووسەری کورد مامۆستا (حەسەن قزڵجی)[٢].

---

[١] - لویس پاستۆر لەساڵی (١٨٢٢) لەشاری (دۆل)ی فەرەنسا لەدایکبووە، لە (١٨٤٧) بڕوانامەی دکتۆرای لەپاریس بەدەستهێناوە، لە ساڵی (١٨٧٣) بەئەندامی (ئەکادیمیای پزیشکی فەرەنسا) هەڵبژێردرا، پاستۆر بەدۆزەرەوەی دەرمانی دژە میکرۆبی نەخۆشیە جیاوازەکان دادەنرێت، چارەسەرکردنی نەخۆشی کرمی ئاوریشمی دۆزیەوە، هەروەها توانی کوتان دژی نەخۆشی (هاری سەگ) بدۆزێتەوە، لەئەیلولی (١٨٩٥) کۆچی دوایی کردووە.

[٢] - (حەسەن قزڵجی) نوسەرو چیرۆکنووسێکی ناوداری ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، لەسەردەمی کۆماری مەهابادا کاری ڕۆژنامەنووسی کردووە، پاشان چۆتە باشووری کوردستان و لە (١٩٥٠)دا چۆتە بەغداد، لە (١٩٥٣) دەستگیرکراوەو ڕەوانەی ئێران کراوەتەوە، بەڵام دواتر گەڕاوەتەوە بۆ باشووری کوردستان و تا شۆڕشی ١٤ی تەمووزی (١٩٥٨) لەهەڵەبجە ماوەتەوە، پاشان لەشاری بەغداد بە کاری وێنەگریەوە خەریکبووە، لە (١٩٦٣) ڕوویکردە بولگاریاو دواتر ڕوسیا، لە (١٩٧٢) کۆمەڵە چیرۆکی (پێکەنینی گەدا)ی بڵاوکردەوە، لە (١٩٧٩) گەڕایەوە بۆ ئێران و لەتاران هەفتەنامەی (مەردوم)ی دەرکرد، بەڵام لەلایەن کاربەدەستانی ئێرانەوە دەستگیرکراو لەساڵی (١٩٨٥) لەزینداندا کۆچی دوایی کرد.

- ٢٠٠٠ دەست پێکردنی ڕاپەڕینی دووەم لەفەڵەستین بەناوی (ڕاپەڕینی ئەقصا).

## * ٩/٢٩

- ١٨٨٧ دامەزراندنی یانەی وەرزشی (هامبۆرگ)ی ئەڵمانی.
- ١٩٧٠ کۆچی دوایی سەرۆکی میسر (جەمال عبدالناصر).
- ١٩٧٩ لەدایکبوونی یاریزانی تۆکرانی (ئەندرێ شێڤچینکۆ)[1].
- ١٩٨٨ هێرشی کیمیاوی ڕژێمی بەعس بۆ سەر (بەرواری بالا).
- ١٩٨٨ ژمارە (سفر)ی گۆڤاری (بەرەی کوردستانی) دەرچوو.

## * ٩/٣٠

- ١٥٢٠ (سوڵتان سلێمانی قانونی) دەسەلاتی گرتە دەست.
- ١٩٥٨ یاسای چاککردنی کشتوکاڵ لەعێراق بلاوکرایەوە.
- ١٩٦٦ سەربەخۆیی (بوتسوانیا) لەبەریتانیا.
- ٢٠٠٠ کوژرانی (محمد جمال الدّرة) لەڕاپەڕینی ئەقصادا لەفەڵەستین.

---

[1] – (ئەندرێ میکۆلایۆڤیچ شێڤچینکۆ)ی یاریزانی ئۆکرانی لە ٢٩ی ئەیلوولی (١٩٧٩) لەشاری (دڤیرکیڤچینا) لەدایکبووە، درێژی (١٨٣) سانتیمەترەو کێشی (٧٢) کیلۆگرامە، شیڤچینکۆ بە (ماڕادۆنای سپی) ناسراوەو ساڵی (٢٠٠٤) بەیەکەمی جیهان هەڵبژێردراوەو خەلاتی تۆپی زێڕینی وەرگرتووە.

# مانگی تشرینی یەکەم (ئۆکتۆبەر)

## * ١٠/١

- ڕۆژی جیهانی بەساڵاچوان.
- ڕۆژی مۆسیقای جیهانی.
- ١٨٢٨ دامەزراندنی (زانکۆی لەندەن).
- ١٩٦٠ سەربەخۆیی (نەیجیریا) لەبەریتانیا.
- ١٩٩٧ ئازادکردنی (شێخ ئەحمەد یاسین)ی ڕێبەری بزووتنەوەی حەماسی فەلەستینی[١].

---

[١] – شێخ ئەحمەد یاسین لەساڵی (١٩٣٦) لەگوندی (مەجدە)ی نزیك شاری غەززەی ڕۆژئاوای فەڵەستین لەدایکبووە، پاشتر گوندەکەیان لەگەڵ کۆمەڵێك گوندی دیکەدا لەلایەن سوپای ئیسرائیلەوە تێکدراو ئەویش لەگەڵ خێزانەکەیدا چووە کەرتی غەززە، پاشتر بەهۆی نەخۆشیەکی بڕبڕەی پشتیەوە تووشی شەلەلی تەواوهات، لەگەڵ ئەوەشدا لەزانکۆی قاهیرە درێژەی بەخوێندندا، لەسەرەتای تەمەنی لاوێتیدا پەیوەندی کردووە بەکۆمەڵەی برایانی موسڵمان (إخوان المسلمین)ەوە، ساڵی (١٩٨٣) بەتۆمەتی دژایەتیکردنی ئیسرائیل دەستگیرکراو لەساڵی (١٩٨٥) بەگۆڕینەوەی لەگەڵ گیراوە ئیسرائیلیەکاندا ئازادکرا، ساڵی (١٩٨٧) بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی دەست درێژیەکانی جولەکە، بزووتنەوەی بەرگری ئیسلامی (حەماس)ی دامەزراند، لە ١٩٨٩/٥/١٩ بۆ جارێکی تر لەلایەن ئیسرائیلەوە دەستگیرکرایەوەو بۆ ماوەی نۆ ساڵ لەزیندانەکانی ئیسرائیلدا مایەوە، ساڵی (١٩٩٧) بەپێی ڕێکەوتنێك ئازادکراو بەفڕۆکەیەك لەئیسرائیلەوە گەیەنرایە عەممانی پایتەختی ئەردەن، ئەحمەد یاسین لەڕووی جەستەییەوە زۆر لاوازبوو وەتەنها دەیتوانی سەری بجووڵێنێت و لەڕێگەی عەرەبانەی تایبەتیەوە هاتوچۆی پێ دەکرا، دوای حەوت ساڵ لەئازادکردنی لەئەنجامی هێرشی فڕۆکە جەنگیەکانی ئیسرائیل لەبەرەبەیانی ڕۆژی ٢٠٠٤/٣/٢٢ شەهیدکرا.

## * ١٠/٢

- ١٨٠٤ كۆچی دوایی (نیكۆلاس جۆزیف كاگنۆت) داهێنەری یەكەمین ئۆتۆمبیلی بزوێنەری هەڵمی.
- ١٩٥٨ سەربەخۆیی (گینیا) لەبەریتانیا.
- ١٩٩٩ كۆچی دوایی (شێخ ناصرالدین الالبانی) لە ئەردەن.

## * ١٠/٣

- ١٩٣٢ سەربەخۆیی عێراق لەبەریتانیا.
- ١٩٣٢ عێراق وەرگیرا لەئەندامێتی كۆمەڵەی گەلان.
- ١٩٦٤ كۆچی دوایی (د. مستەفا سوباعی)
- ١٩٩٠ یەككگرتنی هەردوو ئەڵمانیا.

## * ١٠/٤

- ١٨٣٠ سەربەخۆیی (بەلجیكا) لەهۆڵەندا.
- ١٩٦٦ سەربەخۆیی (لیسۆتۆ) لەبەریتانیا.
- ١٩٨٢ كۆچی دوایی (ئەحمەد حەسەن بەكر)[١].

---

[١] – ئەحمەد حەسەن بەكر، ساڵی (١٩١٤) لەتكریت لەدایكبووە، لە (١٩٣٢) (خانەی مامۆستایان)ی تەواوكردووە، لەساڵی (١٩٣٨) لەكۆلیژی سەربازی بەئەفسەری سوپا دەرچووە، دواتر پەیوەندی بە (حیزبی بەعس)ەوە كردووە، دوای كودەتای (١٩٦٣)ی بەعسیەكان بوو بەسەرۆك وەزیرانی عێراق و ئەندامی سەركردایەتی بەعس، پاش هەشت مانگ بەكودەتایەك لابرا، بەڵام جارێكی تر پاش كودەتای (١٧)ی تەمووزی (١٩٦٨) بوو بەسەرۆك كۆماری عێراق، لە (١٩٧٠)دا بەیانی (١١)ی ئازاری لەگەڵ كوردەكاندا ئیمزا كرد، لە (١٩٧٢) خۆماڵیكردنی نەوتی عێراقی ڕاگەیاند، لەمانگی تەمووزی (١٩٧٩) دەستی لەهەموو تواناو دەسەلاتی حیزب و دەوڵەت هەڵگرت و (سەدام حسێن) جێی گرتەوە، لەتشرینی یەكەمی ١٩٨٢ لەبەغداد كۆچی دوایی كرد.

- ١٩٩٢ دەرچوونی بڕیاری فیدراڵی هەرێمی کوردستان لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانەوە.

## * ١٠/٥

- ١٥٠٢ دۆزینەوەی ناوچەی کۆستاریکا لەلایەن کریستۆڤەر کۆلۆمبس.
- ١٨٢١ کۆچی دوایی گەڕیدەی ناسراوی بەریتانی (کلۆد یۆس ڕیچ)[١].
- ١٩٢٧ دامەزراندنی (کۆمەڵەی خۆیبوونی کورد) لەلوبنان بەسەرکردایەتی (ئیحسان نوری پاشا).
- ١٩٩٩ (د.یوسف قەرزاوی) ئیعلانی پڕۆژەی خزمەتکردنی ئیسلام لەسەر ئینتەرنێت (islamonline)ی کرد.

---

[١] - کلۆدیوس جیمس ریچ گەڕیدەی ناسراوی بەریتانی، لە ٢٨ی ئاداری (١٧٨٧) لەفەرەنسا لەدایك بووە، کاتێك گەشتەکەی بۆ کوردستان دەست پێکردووە لێپرسراوی نوسینگەی بەرژەوەندی گشتی بەریتانیا لەبەغدا بووە، لە ١٨٢١/١٠/٥ لەشاری شیرازی ئێران کۆچی دوایی کردووە، لەڕۆژی یەکی نیسانی (١٨٢٠) ریچ گەشتە بەناوبانگەکەی بۆ کوردستان دەست پێکردو لەشاری بەغدادەوە بەڕێکەوت، لە (٢٥)ی نیسان گەیشتۆتە شارۆچکەی کفری و لەهەشتی ئایاری هەمان ساڵدا گەیشتۆتە شاری سلێمانی پایتەختی میرنشینی بابان و پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ (مەحمود پاشای بابان) سەردانی کردووە، ریچ تا (١٧)ی تەموزی هەمان ساڵ لەسلێمانی ماوەتەوەو پاشان بەرەو شاری سنەی پایتەختی میرنشینی ئەردەڵان ڕۆیشتووەو لە (٢٥)ی ئابدا گەیشتۆتە سنە، وە لە (٧)ی ئەیلولدا چاوی بە (ئەمانوڵا خان)ی میری ئەردەڵان کەوتووە، گەشتەکەی ریچ کراوەتە کتێب و تیایدا سەبارەت بەژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردستانی عیراق لەسەدەی نۆزدەیەمدا زۆر زانیاری و لێکۆڵینەوەی وردی تێدایە، هەروەها سەبارەت بە میرنشینی بابان و ئەردەڵان و پەیوەندیان بەهەریەك لەدەوڵەتی ئێرانی و عوسمانی و...، تەنانەت لەبواری جوگرافیاو کەشناسیشدا ریچ ئامێری کەشناسی پێبووەو پلەی گەرمای ئەوکاتی هەولێرو سلێمانی و سنەو زۆر شوێنی تری کوردستانی تۆمارکردووە.

- ٢٠٠٦ تیرۆرکردنی (م.محەمەد سەنگاوی) ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی و ئەندامی لیستی هاوپەیمانی کوردستان لەئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق[1].

## * ١٠/٦

- ڕۆژی مامۆستایانی هەرێمی کوردستانی عێراق.
- ٧٧٥ کۆچی دوایی خەلیفەی عەبباسی (ئەبوجەعفەری مەنصور).
- ١٩٤٥ دەرچوونی یەکەمین ژمارەی گۆڤاری (هاواری کورد) لەمەهاباد.
- ١٩٨١ تیرۆرکردنی سەرۆکی میسری (ئەنوەر سادات).
- ١٩٩٣ هێنانەوەی تەرمی (مەلا مستەفا بارزانی و ئیدریس بارزانی) لەئێرانەوە بۆ کوردستان.
- ١٩٩٩ کۆنگرەی دوانزەیەمی (پارتی دیموکراتی کوردستان) لەهەولێر گرێدرا.

---

[1] - مامۆستا محەمەد ڕەزا ساڵی (١٩٦٢) لەگوندی (مەسۆیی بەرگەچ) لەناوچەی سەنگاو لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی ئیسلامی لەشاری سلێمانی تەواوکردووە، پەیمانگای ئیسلامی باڵای بۆ پێگەیاندنی پێشنوێژو وتاربێژ لەبەغداد تەواوکردووە، بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەکۆلیژی (ئیمام ئەعزەم) لەزانستە ئیسلامیەکاندا لەبەغداد بەدەستهێناوە، دواتر بووە بەخوێندکاری زانکۆی (سانت کلیمینتس)ی بەریتانی، بەشداری ڕاپەڕینی (١٩٩١)ی گەلی کوردستانی کردووەو دواتر لەناو بزووتنەوەی ئیسلامیدا چەند پۆستێکی جیاوازی وەرگرتووە، ساڵی (٢٠٠٠) لەکۆنگرەی (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی)دا بەئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردراوە، پاش ڕاگەیاندنی (کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان) لەساڵی (٢٠٠١) بووەتە لێپرسراوی مەڵبەندی سلێمانی، ساڵی (٢٠٠٥) بووە بەئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر لیستی هاوپەیمانی کوردستان بەنوێنەرایەتی کۆمەڵی ئیسلامی، لە ٢٠٠٦/١٠/٥ لەشاری بەغداد لەگەڵ شۆفێرەکەیدا شەهیدکرا، مامۆستا محەمەد سەنگاوی نووسەرێکی دیارو خاوەن قەڵەمێکی بەبڕشت بووەو چەندین بەرهەمی چاپکراوو چاپ نەکراوی هەیە.

## * ١٠/٧

- ڕۆژی جیهانی تەندروستی دەروونی.
- ٧٠٥ کۆچی دوایی (عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان) لەدیمەشق لەتەمەنی (٦٠)ساڵیدا.
- ١٩٤٩ دامەزراندنی کۆماری (ئەڵمانیای دیموکراتی).
- ١٩٩٤ تیرۆرکردنی (م. فوئاد چەلەبی) لەهەولێر[1].
- ٢٠٠١ هێرشی ئەمریکاو هاوپەیمانان بۆسەر ئەفغانستان بەمەبەستی ڕووخاندنی دەسەڵاتی تاڵیبان دەستی پێکرد.

## * ١٠/٨

- ١٩٤٨ دامەزراندنی (یەکێتی تۆپی پێی عێراق).
- ١٩٦٧ کۆچی دوایی سەرکردەی شۆڕشی کوبا (گیڤارا).

## * ١٠/٩

- ڕۆژی جیهانی پۆستە.
- ١٩٢٢ شێخ مەحمود یەکەم ئەنجومەنی شارەوانی دامەزراند (دووەم کابینەی حکومەت).

---

[1] - فوئاد عەبدولا عەبدولڕەحمان چەلەبی، ساڵی (١٩٤٩) لەهەولێر لەدایکبووە، ساڵی (١٩٦٧) خوێندنی ئامادەیی تەواوکردووەو لەکۆلیژی زانست لەموسڵ وەرگیراوە، بەڵام بەهۆی بەشداریکردنی لەخۆپیشاندانەکانی قوتابیاندا فەسلکراوە، ساڵی (١٩٧١) پەیمانگای مامۆستایانی تەواوکردووە، یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان)و بووەتە ئەندامی مەڵبەندی هەولێر، شەوی ٦\٧/١٠/١٩٩٤ لەبەردەم ماڵەکەی خۆیدا لەهەولێر تیرۆرکراوە.

- ١٩٥٦ كۆچی دوایی (شێخ مەحمودی حەفید) لەبەغداد[1].

---

[1] - شێخ مەحمودی بەرزنجی، ساڵی (١٨٨١) لەدایکبووە، ساڵی (١٩١٨) بەریتانیەکان کردیان بەحاکمی سلێمانی و لە ١٩١٨/١١/١٧ یەکەم کابینەی حکومەتی پێکهێناوە، پاشان نامەی بۆ ئینگلیزەکان نووسیوەو داوای لێکردون یان ناوچەکەی بدەنە دەست یان خۆی وەك نوێنەری ئەوان حوکم بکات، بەڵام ئینگلیزەکان داواکاریەکانی شێخ مەحمودیان بەزیادەڕەوی لێکداوەتەوە، شێخ لە ١٩١٩/٤/٢١ یەکەم شۆڕشی خۆی دژی ئینگلیزەکان دەست پێکرد، لەحوزەیرانی هەمان ساڵدا لەشەڕی دەربەندی بازیاندا دەستگیرکراوەو دوورخراوەتەوە بۆ هیندستان، پاشان لەئەیلولی ساڵی (١٩٢٢) لەلایەن ئینگلیزەکانەوە گەڕێنرایەوە بۆ بەغدادو لەگەڵ (شافەیسەڵ) و (سیرپیرسی کۆکس)دا گفتوگۆی کردووە، پاش گەڕانەوەی بۆ سلێمانی کرا بەسەرۆکی (جەمعیەتی کوردستان)، دواتر لە ١٩٢٢/١٠/٩ دووەمین کابینەی حکومەتی کوردستانی دامەزراند، لەهەمان کاتدا بەردەوام بوو لەسەر گفتوگۆکانی لەگەڵ دەسەڵاتداران و نوێنەرانی ئینگلیز، پاش بۆردومانکردنی شاری سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەوە، شێخ مەحمود ڕوویکردە ئەشکەوتی (جاسەنە)و هەر لەوێ لەمانگی ئازاری (١٩٢٣) ڕۆژنامەی (بانگی حەق)ی دەرکرد، پاش ئەوەی هەوڵەکانی ئینگلیز سەریان نەگرت تاوەکو سلێمانی بخرێتە سەر عێراق، شێخ مەحمودی لەهەنگاوێکی تریدا لەمانگی تەمموزی (١٩٢٣)دا سێهەمین پێکهاتەی حکومەتی کوردستانی بەناوی (ئەنجومەنی میللی گشتی)ەوە دامەزراند، هەرچەندە قەوارەو قەڵەمڕەوی ئەم حکومەتە لەوانەی پێشوو سنووردارتر بوو، بەڵام لەناوەڕاستی مانگی ئابی (١٩٢٣) ئینگلیزەکان بۆردمانی شاری سلێمانیان کردەوەو شێخ یاداشتێکی نارەزایی بۆ نوێنەری باڵا ناردو دواتریش نامەگۆڕینەوەی نێوان شێخ و بەرپرسانی ئینگلیز درێژەی هەبوو، تاوەکو لە ١٩٢٤/٧/١٩ ئینگلیزەکان (چاپمان)یان بەسەرپەرشتی کارگێری شارەکە داناو کۆتایی بەسێیەم حکومەتی کوردستان هات و شێخیش شاری سلێمانی بەجێهێشت، دواتر شێخ مەحمود لەپەیوەندی و نامەگۆڕینەوەدابوو لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئینگلیزو حکومەتی عێراقی بەڵام هیچ ئاکامێکی لێنەکەوتەوە، شێخ ماوەی سێ ساڵ لە (١٩٢٧-١٩٢٩) لە (پیران) مایەوەو لەمانگی ئەیلولی (١٩٣٠) چالاکی سەربازی دژ بەئینگلیزەکان دەست پێکردەوە تا ڕۆژی خۆبەدەستەوەدانی لە ١٩٣١/٥/١٤.

- ١٩٦٢ سەربەخۆیی (ئۆگەندا) لەبەریتانیا.
- ١٩٨١ گواستنەوەی زانکۆی سلێمانی بۆ هەولێرو گۆڕینی ناوی زانکۆکە بە (زانکۆی سەلاحەدین).
- ١٩٩٠ کۆچی دوایی شاعیر (کاکەی فەلاح).
- ١٩٩٢ کۆچی دوایی (شێخ محەمەد مەحمود صەواف) لەتورکیا.

## * ١٠/١٠

- ١٩٩٣ دامەزراندنی (یەکێتی ئافرەتانی تورکمان).
- ١٩٩٤ کۆچی دوایی شاعیری کورد (عوسمان سەبری)[١].

## * ١٠/١١

- ١٨٨٩ کۆچی دوایی (جێمس جول)، دانەری (یاسای جول)[٢].

---

[١] – عوسمان سەبری، سالی (١٩٠٥) لەکوردستانی تورکیا لەدایکبووە، بەشداری شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانی کردووە، پاش سەرنەکەوتنی شۆڕش زیندانی کراوە لەسالانی (١٩٢٥– ١٩٢٨)، پاشان ئازادکراوەو چووە بۆ سوریا، لەسوریا لەگەلٚ (میر جەلادەت بەدرخان) بەشداری حیزبی (خۆیبوون)ی کردووە.

[٢] – جێمس پرێسکوت جول، لە سالی (١٨١٨) لەئینگلتەرا لەدایك بووە، لەماڵەوە لەسەر دەستی چەند مامۆستایەکی تایبەت خوێندویەتی، بۆ ماوەی سێ سالٚ قوتابی کیمیازانی بەناوبانگ (جۆن دالتۆن) بووە، لەگەلٚ ئەوەی کەنەچۆتە زانکۆ بەلام بەهەوڵ و تەقەلای خۆی توانیویەتی زانستی فیزیا فێربێت، وەتوانی کۆمەڵە تاقیکردنەوەیەکی وردی فیزیایی ئەنجام بدات، جول لەسالی (١٨٥٠)دا وەك زەمیلی کۆمەڵەی شاهانە (Royal Society) هەلبژێردراوەو لەسالی (١٨٦٦)دا مەدالیای کۆپلا (Copely Medal)ی پێ بەخشراوە، لەسالی (١٨٧٢)و (١٨٨٧) وەك سەرۆکی کۆمەڵەی زانستی پێکەوتوویی بەریتانی هەلبژێردراوەو یەکەی پێوانەی وزەیان بەناوی ئەوەوە ناونا (جول)؛ جول ئەو گەرمیەی دۆزیەوە کەبەهۆی بەرگریەوە بەفیرۆ دەچێت و بە (یاسای جول) ناسراوە.

- ١٩٤٣ كۆچی دوایی مەلای گەورە (مەلا محەمەدی كۆیی)[١].
- ١٩٧٥ كۆچی دوایی شاعیر (ئایەتوڵڵا محەمەد مەردۆخی).

## * ١٠/١٢

- ١٤٩٢ (كریسۆڤەر كۆلۆمبس) كیشوەری ئەمریكای دۆزیەوە.
- ١٨٨٣ كۆچی دوایی سەركردەی كورد (شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری)[٢].

---

[١] - مەلای گەورە ناوی (مەلا محەمەد كوڕی مەلا عەبدوڵڵا جەلی زادە)یە، لە پێنج ساڵیدا دایكی كۆچی دوایی كردووە، لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا هەموو زانیاریەكانی مەلایەتی ئەو سەردەمەی خوێندووە، پاش وەفاتی باوكی لە (١٣٢٦كۆچی) جێی باوكی دەگرێتەوەو نازناوی (سەرۆكی زانایان)ی پێدەدرێ، پاشان بووە بەئەندامی ئەنجومەنی ویلایەتی موسڵ، ساڵی (١٩١٩) بووە بە موفتی كۆیە، لە (١٩٢٤) بووە بەئەندامی ئەنجومەنی دامەزرێنەری عێراق، ساڵی (١٩٢٨) وازی لەكاروباری حكومەت هێناوەو كاتی خۆی تەرخانكردووە بۆ كتێب دانان و وانەوتنەوە، نزیكەی (٣٠) دانراوی بەكوردی و عەرەبی هەیە، مەلای گەورە لە بواری شیعریشدا دەستی باڵای هەبووەو لەپارچە شیعرێكدا لەباسی (ژن)دا دەڵێت:

ژن زینەتی دونیانە، ئەمانەتی خودانە
حەبیبی مستەفانە، قەڵاتن لە بۆ مێردان
ژن ئەگەر بەحورمەت بی، بێ زیلەت و زەحمەت بی
بەتەربیەو ڕەحمەت بی، دڵ گوشادو لێو خەندان.

[٢] - شێخ عوبەیدوڵڵا كوڕی سەید تەهای نەهری، لەساڵی (١٨٣١) لەدایكبووە، شێخ عوبەیدوڵڵا بەیەكێك لەسەركردە بەهێزە كوردەكانی سەدەی نۆزدە دادەنرێ و شۆڕشی دژی عوسمانیەكان بەرپاكرد، شێخ پەلاماری چەند ناوچەیەكی دەوڵەتی عوسمانی دا، بەڵام سەركەوتوو نەبوو چونكە خێڵەكانی شێخ لەیەكتری دابڕابوون، عوسمانیەكان شێخ عوبەیدوڵڵایان گرت و لەئەستەنبوڵ دەست بەسەریان كرد، بەڵام لەساڵی (١٨٨٢) توانی ڕابكات، جاری دووەم شێخ گیرایەوەو ڕەوانەی حیجازیان كردو لەوێ لەساڵی (١٨٨٣) كۆچی دوایی كرد.

- ١٩٢٦ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (کەرکوك)[١].

- ١٩٩٩ (پەروێز موشەرەف) کودەتای کرد بەسەر حکومەتەکەی (نەواز شەریف)دا لەپاکستان.

- ٢٠٠١ کۆچی دوایی (مەلا ئەحمەدی قازی).

## * ١٠/١٣

- ١٧٩٢ دانانی بەردی بناغەی (کۆشکی سپی) ئەمریکا لەواشنتۆن.

- ١٩٥١ کۆچی دوایی نووسەری کورد (جەمیل سائیب)[٢].

---

[١] - (کەرکووك)، ڕۆژنامەیەکی سیاسی وێنەدار بوو، شارەوانی کەرکووك بەزمانەکانی (عەرەبی و کوردی و تورکی) دەری کرد، ژمارە یەکی لە ١٩٢٦/١٠/١٢دا دەرچووە بەشێوەیەکی پچرپچرو شێوازی جۆراوجۆرو بەلاپەڕەو قەبارەی جیاجیا، لەسەرەتادا (وەجدی ئەفەندی) ئەرکی نووسینی تێدا بەڕێوە دەبرد، پاشان لەژمارە (٦٦)ەوە (هیجری دەدەی کاکەیی) شاعیری ناسراوی کورد ئەرکەکەی گرتە ئەستۆ، ڕۆژنامەکە بەم ڕستەیە خۆی دەناسێنیٚ (هەموو شتیٚ دەنووسیٚ، جاریٚ هەموو دووشەموان دەردەچیٚ، غەزەتەیەکی تورکی و کوردیە)، ئەم ڕۆژنامەیە تا ١٩٧٢/٨/٢٠ کە دوا ژمارەی بووە (٢٠٣٣) ژمارەی لیٚ دەرچووەو بۆ ماوەی (٤٦) سالٚ بەردەوام بوو، دواتر وەستا.

[٢] - (جەمیل سائیب)، لەدایکبووی ١٨٨٧/٨/١٦ی شاری سلێمانیە، سەرەتا فەرمانبەر بووە لەدارایی، پاشان بووە بەبەڕێوەبەری گەنجینە تا خانەنشین کراوە لەساڵی (١٩٤٩)دا، لەبیستەکانی سەدەی ڕابردووەوە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەئەدەب و ڕۆژنامەگەری کوردیدا، بەپێشەنگی چیرۆکی نوێی کوردی دادەنریٚ، ئەویش بەهۆی چیرۆکی (لەخەوما)، کەبەزنجیرە لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە)و پاش ئەویش لە (ژیان)دا بڵاوی کردۆتەوە، لەڕووی هزریەوە لەنەیارانی (شێخ مەحمود) بووە، ئەو دوو ساڵەی شێخ مەحمود تێیدا حوکمی سلێمانی کرد پاش ساڵی (١٩٢٢) ئەو لەکەرکوك بەسەری برد، پاش جێگیربوونی دەسەڵاتی ئینگلیزو ڕژێمی پاشایەتی بەسەر شاردا لەساڵی (١٩٢٤)، ئەویش گەڕایەوە بۆ سلێمانی و بووە بەسەرنووسەری (ژیانەوە)، ساڵی (١٩٥١) کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٨٧ کۆچی دوایی (واڵتەر براتاین) دووەم داهێنەری (ترانزیستۆر).

## * ١٠/١٤

- ١٨٨٩ لەدایکبوونی ئەدیبی میسری (تەها حسێن).
- ١٩٢٧ بۆ یەکەم جار نەوت لە(باباگوڕگوڕ) دۆزرایەوە.
- ١٩٣٢ کۆچی دوایی شاعیری ناوداری عەرەب (ئەحمەد شەوقی)[١].

## * ١٠/١٥

- ١٨٤٤ لەدایکبوونی فەیلەسوفی ئەڵمانی (گۆتە).
- ١٩٢٦ لەدایکبوونی فەیلەسوفی فەڕەنسی (میشیل فۆکۆ).
- ١٩٩١ کۆنگرەی ڕاپەڕینی یەکێتی نوسەرانی کورد لەشەقڵاوە بەسترا.
- ١٩٩١ سەربەخۆیی (بۆسنەوهەرسك) لەیۆگسلاڤیا.

## * ١٠/١٦

- ڕۆژی جیهانی خۆراك.
- ١٩٧٨ هەڵبژاردنی (پاپا یوحەنا پۆڵس) وەك یەکەم پاپا بۆ ڤاتیکان.

---

[١] – ئەحمەد شەوقی لەساڵی (١٨٦٨) لەقاهیرە لەخێزانێکی نزیك لەبنەماڵەی (خدێوی) لەدایکبووە، سەرەتایی و دواناوەندی لەقاهیرە تەواوکردووە، پاشان چۆتە قوتابخانەی (ماف)و پاش دوو ساڵ بڕوانامەی لەوەرگێڕاندا وەرگرتووە، پاشان لەلایەن (تۆفیق خدێوی)یەوە نێردراوە بۆ فەڕەنساو دوای سێ ساڵ بڕوانامەی لە (ماف)دا وەرگرتووە، بەڵام لەسەر داوای خدێوی شەش مانگی تر لەفەڕەنسا ماوەتەوە بۆ پێگەیشتنی زیاتر لەبواری هونەرو ڕۆشنبیریدا، ساڵی (١٨٩٤) گەڕاوەتەوە بۆ میسڕ، پاشان وەك نوێنەری میسڕ نێردراوە بۆ (کۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسان) لەجنێف، ساڵی (١٨٩٠) بەشی یەکەمی (الشوقیات)ی بڵاوکردۆتەوە، لەسەرەتای جەنگی جیهانی یەکەم لەساڵی (١٩١٤) ئینگلیز دووریانخستەوە بۆ ئەندەلوس، سەرەتای ساڵی (١٩٢٠) گەڕاوەتەوە بۆ میسڕ، لەگرنگترین شانۆنامەکانی: (مصرع کیلوباترا، لیلی و مجنون، قمبین).

## * ١٠/١٧

- ١٧٩٨ پەیمانی (کۆمبۆ فۆرمیۆ) لەنێوان فەرەنساو نەمسا ئیمزا کرا.
- ١٨٠٥ لەدایکبوونی شاعیرو نووسەری کورد (ماه شەرەف ئەردەلانی) ناسراو بە (مەستورەی کوردستان).
- ١٨٤٩ کۆچی دوایی مۆسیقاری فەرەنسی (شۆپان) لەپاریس.
- ١٨٨٧ کۆچی دوایی (گۆستاڤ رۆبێرت کریچۆڤ) داهێنەری یاسای کریچۆڤ[1].
- ١٩٩٤ کۆچی دوایی هونەرمەند (ڕەسوڵ گەردی) لەهەولێر[2].
- ١٩٩٨ کۆچی دوایی شاعیری کورد (شێخ ڕەئوف نێرگسەجاڕی).

## * ١٠/١٨

- ڕۆژی جیهانی هەژاری.
- ١٨٧١ کۆچی دوایی (چارلس بایباج) داهێنەری یەکەمین کۆمپیوتەری میکانیکی.

---

[1] – (کریچۆڤ) لەئازاری (١٨٢٤) لە (پروسیای ڕۆژهەڵات) لەدایکبووە، فیزیازانێکی ئەڵمانیەو بەشداری بەرچاوی هەبووە لە دارشتنی تێگەیشتنی سورە کارەباییەکاندا، یاسای کریچۆڤی تیشکاوەری داناوە کە دەڵێت: (پەیوەندی نێوان توانای (وزەی) تیشکدانەوەو توانای هەڵمژین بۆ ئەو تیشکانەی هەمان درێژە شەپۆلیان هەیە جێگیرە بۆ هەموو تەنەکان لەهەمان پلەی گەرمیدا)، هەروەها کریچۆڤ یەکەم کەس بووە ئەوەی سەلماندووە کەتەزوو بەخێرایی ڕووناکی بەناو وایەرێکدا تێپەڕ دەبێت.

[2] – ڕەسوڵ بێزار گەردی لەساڵی (١٩٢٨) لەکۆیە لەدایك بووەو خاوەنی دەنگێکی ڕەسەنی گۆرانی و حەیرانە، هونەرمەند جگە لەگۆرانی وتن شاعیریش بووەو خاوەنی چەند دیوانێکە کەدیاترینیان (شیلان و شلێر)ە، لەساڵی (١٩٥٠) بەدواوە لەئێزگەی بەغداد چەند گۆرانی و حەیرانێکی تۆمارکردووە، لەتەمەنی (٦٦) ساڵیدا لەهەولێر کۆچی دوایی کرد.

**- ١٩٣١ كۆچی دوایی زانای بەناوبانگ (تۆماس ئەلفا ئەدیسۆن) داهێنەری یەکەمین گڵۆپی کارەبایی.**

**- ١٩٥٧ لافاوە گەورەکەی (شاری سلێمانی)[١].**

**- ٢٠٠١ کۆچی دوایی (م.عومەر ڕێشاوی) لە هەولێر[٢].**

## * ١٠/١٩

**- ١٩٣٧ کۆچی دوایی (ئێرنست ڕەزەفۆرد) بنچینەداری فیزیای ئەتۆمی.**

---

[١] - ڕۆژی ١٩٥٧/١٠/١٨ کاتژمێر چوارو دە دەقیقە بارانێکی گەورە لەناوشاری سلێمانی دەستی پێکرد، دوای ئەوە کردی بەتەرزەو هەر تەرزەیەکی لەهێلکەیەك گەورەتر بوو، ئەو باران و لافاوە هەرچی بەسەرەوە بوو ڕووەو گەڕەکی سەرشەقام دەڕۆی و زیانێکی زۆریداو خەڵکێکی زۆر گیانیان لەدەستدا، ڕۆژنامەی (ژین) لەژمارە (١٣٦٦)ی ڕۆژی ١٩٥٧/١٠/٢٤ جگە لەڕاپۆرتە هەواڵێك لەسەر زیانەکانی لافاوەکە، بەمانشێتی گەورە نووسیویەتی: (گەورەترین کارەسات بەسەر سلێمانیدا دێت، لافاوێکی نیوسەعاتی لەناکاو زیانی نزیکەی نیو ملیۆن دینار ئەداو، ٣٠ تا ٤٠ کەس ئەخاتە ژێر گڵەوە، شەقامەکان بوون بەڕووبارو لاشەو دارو بەردو ئۆتۆمبیلی بەسەرەوە ئەڕۆیشت، زیانی لافاو زۆرەو پێویستی بەیارمەتی گەورە هەیە).

[٢] - مامۆستا عومەر فەتاح یەعقوب ڕێشاوی، ساڵی (١٩٣٤) لەگوندی (ڕێشاو)ی هەڵەبجە لەدایکبووە، لەحوجرە دەستی بەخوێندن کردووەو بۆ خوێندنی زانستە شەرعیەکان زۆر شوێنی کوردستان گەڕاوە، ساڵی (١٩٥٦) ئیجازەی زانستی پێ بەخشراوە، لەبانگخوازە سەرەتاییەکانی کاری ئیسلامی بووە لەکوردستانداو بەدیداری شێخ ئەحمەد زەهاوی و مامۆستا محەمەد مەحمود صەواف گەیشتووە، کە لەبنیاتنەرانی کاری ئیسلامی (کۆمەڵی برایانی موسڵمان) بوون لەکوردستاندا، یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان)، لە ٢٠٠١/١٠/١٨ لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کردووەو لە (هەڵەبجەی شەهید) بەخاك سپێردراوە.

- ١٩٨٤ كۆچی دوایی (حاجی مەلا عەلی مەلکەندی).
- ١٩٩٣ (بەنازیر بۆتۆ) بوو بە سەرۆك وەزیری پاکستان.
- ٢٠٠٣ کۆچی دوایی سەرۆك کۆماری بۆسنە (عەلی عیزەت بیگۆڤیچ)[1].

---

[1] - بیگۆڤیچ لەساڵی (١٩٢٥) لەشاری (بوسانا کروبا)ی باکووری رۆژئاوای بۆسنە لەخێزانێکی ئیسلام پەروەر لەدایکبووە، لەسەرایێڤۆ لەقوتابخانەیەکی ئەڵمانی خوێندنی ئامادەیی تەواوکردووە، لەتەمەنی (١٦) ساڵیدا لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانیدا (کۆمەڵەی لاوانی موسڵمان) لەبواری فریاکەوتن و خزمەتگوزاریدا دامەزراندووە، لەدوای دامەزراندنی (یەکێتی یۆگسلاڤی)، عەلی عیزەت کە لەوکاتەدا قوتابی کۆلیژی یاسا بوو لەزانکۆی سەرایێڤۆ چەندین جار کەوتە بەر شاڵاوی گرتن و زینداینکردن، دوای بڵاوبوونەوەی کتێبە بەناوبانگەکەی (الأعلان الأسلامي) بیگۆڤیچ تاوانبارکرا کەدەیەوێ لەناو جەرگەی ئەوروپادا دەوڵەتێکی ئیسلامی ئوسوڵی دابمەزرێنێت و لەسەرئەوە دەستگیرکراو دوای دادگاییکردنێکی رواڵەتی بە (١٤) ساڵ زیندانی حوکمدرا، دوای بەسەربردنی (٥) ساڵ ژیان لەبەندیخانەدا ساڵی (١٩٨٨) ئازادکرا، دوای (٤٥) ساڵ لەقۆرغکردنی دەسەلات و سیستمی فرەیی لەوڵاتدا (بیگۆڤیچ) (حزبی کاری دیموکراتی) دامەزراندو لەهەڵبژاردنێکی گشتیدا بەسەرۆك کۆماری بۆسنە هەڵبژێردرا.
دوای سەرهەڵدانی بیرۆکەی جیاکردنەوەی سنور لەسەر ئەساسی رەگەزی، (عەلی عیزەت) دەرکی بەوەکرد لەوانەیە بۆسنە سەودایەکی نێوان سرب و کرواتەکان بێت، بۆئەوەی بۆسنە لەو چارەنووسە رزگار بکات چارەسەرێکی ناوەندی خستە بەردەم سەرانی کۆمارەکە، ئەویش بەدامەزراندنی کۆمارێکی فیدراڵی بۆ هەردوو کۆماری (سرب) و (چیای رەش) و دابینکردنی کۆنفیدراڵیەتێکی تایبەتیش بۆ (کرواتیاو سلۆڤینیا)و (بۆسنەو مەقدۆنیا)ش بکرێنە یەك یەکێتی تایبەت و بەو شێوەیە چوارچێوەیەك بۆ یۆگسلاڤیایەکی یەکگرتوو دابنرێت و سێ فیدراڵیەت لەخۆبگرێت، بەمەرجێك کە کۆمارەکانی سەروەرێتی و سەربەخۆییان هەبێت، ئەم پرۆژەیە باشترین چارەسەر بوو بۆ دوورخستنەوەی وڵات لەشەری ناوخۆ بۆیە یەکێتی ئەورپا پشتگیری کرد، بەڵام سرب و کروات و سلۆڤینیا لەرِوویدا وەستان و، دوای راگەیاندنی سەربەخۆیی کرواتیاو سلۆڤینیا سوپای یۆگسلاڤی کە

- ٢٠٠٤ کۆچی دوایی شاعیرو زانای کورد (فەنایی)[1].

---

لەژێر سەرکردایەتی سرپەکاندا بوو پەلاماری دوو کۆمارەکەیداو شەڕێکی خوێناوی هەڵگیرسا، ئەورووپیەکان هاتنە مەیدان بۆ ڕاگرتنی شەڕەکە، ئەورووپیەکان ئەوەیان بەمەرج دانابوو کەکاتێ دان بەسەربەخۆیی هەر کام لەو کۆمارانەدا دەنێن کە لەنێوخۆدا ریفراندۆمی بۆکرابێت، لێرەدا بیگۆڤیچ بۆ دیاریکردنی چارەنووسی بۆسنە لەساڵی (١٩٩٢) خۆی هاتە مەیدان و دەنگیدا بۆ سەربەخۆیی و دوای ئەویش جەماوەر ترسیان شکاو بەڕێژەی (٦٢,٨٪) سەربەخۆییان پەسەندکرد، بەڵام دوای چەند سەعاتێك لەڕاگەیاندنی ئەنجامی ریفراندۆمەکە ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی هەستا بەئاڕاستەکردنی شاڵاوێکی توندوتیژ دژ بەموسڵمانانی بۆسنەو دوای چەند سەعاتێکی تر سرپەکان پەلاماری بۆسنەیان داو شەڕێکی کاولکارو خوێناوییان بەرپاکرد، دوای شەڕێکی خوێناوی نا بەرامبەر، ڕێککەوتننامەی (دایتۆن)ی ساڵی (١٩٩٥) بەسەر بیگۆڤیچدا فەرزکرا، کەڕێژەی (٥١٪)ی ڕووبەری بۆسنە بە کروات و موسڵمانەکان دەدات و ڕێژەی (٤٩٪)ش بەسریەکان بەخشراو بەوپێیەش موسڵمانەکان سەربەخۆیی تەواویان لەدەستدا.

بیگۆڤیچ لەساڵی (١٩٩٤)دا خەڵاتی (مەلیك فەیسەڵ)ی پێدراو، ساڵی (٢٠٠١)یش خەڵاتی کەسایەتی گشتی وڵاتانی ئیسلامی پێ بەخشرا.

[1] - فەنایی ناوی (م. مەلا عبداللەی کوڕی مەلا مستەفای مەلا صالح)ەو لەهۆزی بابانەکانە، ساڵی (١٩٣٢) لەگوندی (گوڵان)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەدایك بووە، لەتەمەنی (٧) ساڵیدا قورئانی پیرۆزو گوڵستانی سەعدی و کتێبە سەرەتاییەکانی شەرعی لای باپیری خوێندووە، ساڵی (١٩٥٧) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، لەکۆتایی ساڵانی نەوەدەکان مزگەوتی (بوخارا)ی لەهەولێر دروست کردووە، لە ٢٠٠٤/١٠/١٩ لەتەمەنی (٧٢) ساڵیدا لەلوبنان کۆچی دوایی کردووەو لەمزگەوتی بوخارا لەهەولێر نێژراوە، لەدانراوەکانی: (ناڵەی دڵ و داخی گەل، وەسێتنامەی وەفایی، دعوة الطريقة لطالب الحقيقة، الوثيقة في بيان الحقيقة واداب الطريقة، وەرگێڕانی بەشێك لەکتێبی (رياض المشتاقين)ی مەلا حامیدی بێسارانی لەفارسیەوە بۆ عەرەبی بەهاوکاری مەلا عەبدوللەتیف بامۆکی).

## ١٠/٢٠ *

- ١٨٢٠ (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) شاری سلێمانی بەجێهێشت[١].
- ١٩٦٩ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (الأتحاد)ی ئیماراتی.
- ١٩٨٧ کۆچی دوایی هونەرمەند (مامۆستا تایەر تۆفیق) لەهەولێر.
- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی هونەرمەندی شێوەکار (دڵشاد ساحێبقڕان)[٢].

---

[١] – (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) ڕابەری تەریقەتی نەقشبەندی، دوای ئەوەی ڕێبازەکەی لەشاری سلێمانی و ناوچەکانی تری کوردستان و تەنانەت وڵاتانی دراوسێدا بەخێرایی گەشە دەکات و بڵاودەبێتەوە، بابانەکان ترسان لەوەی مەولانا خالید لەبەرژەوەندی عوسمانیەکان کار بکات، (بەتایبەتی لەوکاتەدا بابانەکان زۆر ملیان بۆ دەسەڵاتی عوسمانی نەدەدا)؛ بۆیە لەسەرەتاوە بەنیازی لەخۆگرتن بەنەرم و نیانی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد، بەڵام دواتر بەسوود وەرگرتن لەنەیارەکانی کەوتنە تەنگ پێ هەڵچنینی تاکار بەڕادەیەك گەیشت، مەولانا خالید ناچاربوو وەك (جیمس ریچ) لەبیرەوەریەکانیدا دەگێڕێتەوە، لەڕۆژی ٢٠ی تشرینی یەکەمی (١٨٢٠) شاری سلێمانی بەرەو جێیەکی نادیار بەجێ بهێڵێت، دواتر دەرکەوت کەسەفەری لەڕێگەی قەرەداغەوە بەرەو بەغداد کردووەو لەوێەوە بۆ شام ڕۆیشتووەو لەوێ دەستی داوەتە کارو چالاکی لەپێناو زیاتر بڵاوکردنەوەی ڕێبازەکەیدا، تا لەساڵی (١٨٢٦) والی عوسمانیەکان بەفەرمانێك چالاکی خەلیفەکانی مەولانای قەدەغەکرد، مەولانا دوای ئەوەی لەساڵی (١٨٢٧) کۆچی دوایی دەکات پاش (٢٠) ساڵ لەوەفاتی جارێکیتر ڕێبازەکەی لەسەردەستی (شێخ عوسمان سیراجەدین)و شێخانی هەورامانەوە تەوژمێکی نوێی بەخۆیەوە بینی و لەسەرانسەری جیهاندا خانەقاو خەلیفەو موریدی لێکەوتەوە. (بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ژیانی مەولانا خالید سەیری پەراوێزی ٦/٧ بکە).

[٢] – هونەرمەندی شێوەکار دڵشاد ساحێبقڕان، ساڵی (١٩٤١) لەسلێمانی لەدایکبووە، لەساڵی (١٩٦٦) خانەی مامۆستایانی کەرکوکی تەواو کردووە، لەساڵانی (١٩٧٧–١٩٩١) بەشداری (٢٢) پێشانگەی هاوبەشی کردووە لە (سلێمانی، بەغداد، موسڵ، هەولێر، ئەنبار، بەسرە، دهۆك، فەرەنسا، نەمسا، ژاپۆن).

## 10/21*

- ١٨٩٧ (ئەدیسۆن) گلۆپی کارەبایی داهێنا.
- ١٩١٤ لەدایکبوونی سەرۆك وەزیری عێراق (عەبدولکەریم قاسم).
- ١٩١٨ سەربەخۆیی (نەمسا) لەئیمپراتۆریەتی (نەمسا – مەجەر).
- ١٩٦٣ کۆچی دوایی هونەرمەندی عێراقی (نازم غەزالی).

## 10/22 *

- ١٩٧٠ یەکەم ژمارەی گۆڤاری (زانیاری) دەرچوو.
- ١٩٨٤ کۆچی دوایی (جگەرخوێن)ی شاعیر[1].
- ١٩٨٧ کۆچی دوایی ئەدیب و نوسەر (د. کامل بەصیر)[2].

---

[1] – شێخ مووسا حەسەن (جگەرخوێن) لەساڵی (١٩٠٣) لەشاری (ماردین)ی باکووری کوردستان لەدایکبووە، لە (١٩٢٨) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، لەساڵی (١٩٢٤)ەوە دەستی بەشیعر هۆنینەوە کردووە، لە (١٩٥٨) چۆتە بەغدادو بۆماوەی سێ ساڵ وانەی کوردی وتۆتەوە، پێنج دیوانی شیعری چاپکراوی هەیە، لەوانە: (دیوانی جگەرخوێن)و (شۆڕشی ئازادی)، لەگەڵ چەندین کتێبی تر لەبواری (زمانەوانی و چیرۆك و مێژوو)دا.

[2] - د. کامیل حەسەن بەصیر لەساڵی (١٩٣٣) لەدایك بووەو خوێندنی سەرەتایی لە (هاشمیە)ی بەغداد تەواوکردووە، ساڵی (١٩٥٨) یەکەمی عێراق بووە لەقۆناغی ئامادەییدا، دواتر لەزانکۆی قاهیرە لەکۆلیژی ئاداب بەشی عەرەبی دکتۆرا وەردەگرێت و لەگەڕانەوەیدا دەبێتە مامۆستا لەکۆلیژی ئادابی زانکۆی سلێمانی، ساڵی (١٩٦٨) ژنی هێناوە کە(شایەر خان)ی خوشکی (نوری عەلی ئەمین) بووە، لەبەرئەوەی د.کامل نابینا بووە شایەرخانی هاوسەری شتی بۆ خوێندۆتەوەو بۆی نووسیوەتەوە، هەروەها خوشکەکەی زۆر یارمەتیداوە لەهێنان و بردنیدا بۆ قوتابخانە لەسلێمانی، د.کامل لەرێکخستنەکانی پارتیدا کاری کردووەو دوای نسکۆی (١٩٧٤) پەیوەندی کردووە بە (ی.ن.ك)ەوە، لەبەرهەمەکانی: (ڕەخنەسازی، زاراوەی کوردی، زمانی کوردی بۆ دەست پێکەران)

## * ١٠/٢٣

- ١٩٦٨ دامەزراندنی (زانکۆی سلێمانی).
- ١٩٩١ حکومەتی عێراقی سەرجەم دامودەزگا ئیدارییەکانی لەهەرێمی کوردستان کشاندەوە.

## * ١٠/٢٤

- ڕۆژی نەتەوە یەکگرتووەکان.
- ١٩٣٥ دەرچوونی گۆڤاری (ڕوناکی) لەهەولێر[١].
- ١٩٦٤ سەربەخۆیی (زامبیا) لەبەریتانیا.
- ١٩٧٦ کۆچی دوایی (ئەحمەد موختار بابان) لەئەڵمانیا.
- ١٩٩٢ دەرچوونی ژمارە سفری ڕۆژنامەی (الإتحاد) زمانحاڵی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) لەهەولێر.

## * ١٠/٢٥

- ١٩١٨ ئینگلیزەکان شاری کەرکووکیان داگیرکرد.
- ١٩٢٠ دامەزراندنی حکومەتی عێراق.
- ١٩٩٨ کۆچی دوایی شاعیر (سەبری بۆتانی).

---

[١] – ڕووناکی گۆڤارێکی هەفتانە بووەو لەهەولێر دەرچووە، لەژێر ناوەکەیدا نووسراوە: (گۆڤارێکی هەفتەیی، علمی، اجتماعی، ادبی، کوردیە)، خاوەنی ڕووناکی و بەڕێوەبەری (شیت مستەفا)ی پارێزەرەو نووسەرەکانیشی بریتی بوون لە: (حسێن حوزنی موکریانی، محەمەد عەلی کوردی، شیت مستەفا، مەحمود فەهمی، محەمەد جەمیل ڕۆژ بەیانی، کانی، گیو موکریانی، سەعید ناکام، ئیسماعیل حەقی شاوەیس، دڵدار، یونس مستەفاو چەندینی تر)، گۆڤارەکە لەموسڵ و ڕەواندزو هەولێر چاپکراوەو دوایین ژمارەی کە ژمارە (١١)یە لە ١٨٣٦/٥/١٦ دەرچووە.

## * ١٠ /٢٦

- ١٩١٩ لەدایك بوونی شای ئێران (محەمەد ڕەزا پەهلەوی).
- ١٩٩٤ ئیعلانکردنی (یەکگرتووی خوشکانی ئیسلامی کوردستان).
- ١٩٩٥ تیرۆرکردنی (فەتحی شەقاقی) سەرۆکی (ڕێکخراوی جیهادی ئیسلامی) فەلەستینی.

## * ١٠/٢٧

- ١٩٠٥ سەربەخۆیی (نەرویج) لەسوید.
- ١٩٢٢ دەرچوونی دوا ژمارەی ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان).
- ١٩٤٥ کۆچی دوایی زانای کورد (محەمەد موفتی).
- ١٩٩١ سەربەخۆیی (تورکمانستان) لەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.
- ١٩٩٢ کۆنگرەی نیشتمانی یەکگرتووی عێراق (INC) لە سەلاحەدین.

## * ١٠/٢٨

- ١٩٩٠ (جۆن مێجەر) بوو بە سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا.
- ١٩٩٠ کۆچی دوایی هونەرمەند (حەمەصالح دیلان).
- ١٩٩٥ پێکهێنانی (لیژنەی هاریکاری نیشتمانی کوردستان)[١].

---

[١] - پاش هەلگیرسانی شەڕی ناوخۆی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لەساڵی (١٩٩٤)دا، هێزو لایەنە سیاسیەکان لەهەوڵدابوون بۆ کۆتایی هێنان بەو شەڕەو ئاگربەست لەنێوان هەردوو لادا، لەم میانەشدا چەند لیژنەیەك پێکهاتن وەك (لیژنەی ئاشتی وبرایەتی) لەسلێمانی و (لیژنەی کۆششی شەڕ ڕاگرتن) لەهەولێر، بەلام دوا میکانیزمی هێزە سیاسیەکان پێکهێنانی لیژنەیەك بوو بەناوی (لیژنەی هاریکاری نیشتمانی کوردستان) لیژنەکە لە (٧) حیزبی کوردستانی پێکهاتبوو، کەپێش دامەزراندنی ئەم لیژنەیەش بەناوی (حەوت حیزبە کوردستانی یەکە) لە هەوڵدابوون بۆ ڕاگرتنی شەڕەکە،

## * ١٠/٢٩

- ١٩٢٣ ڕاگەیاندنی سیستمی کۆماری لەتورکیاو هەڵبژاردنی (مستەفا کەمال ئەتاتورک) بەسەرۆك کۆمار.
- ١٩٥٦ هێرشە سێ قۆڵیەکەی سەر میسر لەلایەن (بەریتانیاو فەڕەنساو ئیسرائیل).
- ١٩٧٣ کۆچی دوایی شاعیری کورد (ویساڵی)[١].
- ٢٠٠٦ کۆچی دوایی شاعیر (ئەحمەد هەردی).

---

ئامانجەکانی (لیژنەی هاریکاری) کە (١٢) خاڵە، لەخاڵی یەکدا دەڵێت: (ڕزگارکردنی ئەزمونی کوردستان لەو مەترسیانەی کەهەڕەشەیان لێ دەکات کە لەئەنجامی شەڕی ناوخۆیی هاتۆتە کایەوەو کارکردن بۆ پێش خستنی و پاراستنی)، حیزبەکان بریتی بوون لە: (حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان، بزووتنەوەی ئیسلامی لەکوردستانی عێراق، بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشوری، یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان، حیزبی شیوعی کوردستان/ عێراق، حیزبی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان، پارتی پارێزگارانی کوردستان).

[١] - ویساڵی، ناوی (محەمەد کوڕی شێخ ئەحمەدی شێخ تەهای شێخ عەبدوللەتیفی مەردۆخی)یە، لەساڵی (١٩٠٢) لەگوندی تەکیەی قەرەداغ لەدایکبووە، لەتەمەنی (١٠) ساڵیدا چۆتە سلێمانی و لای (شێخ عومەری قەرەداغی) دەست دەکات بەخوێندن، ویساڵی کەسێکی زۆر زیرەك و بلیمەت بووەو ناوەڕۆکی شیعرەکانی بریتین لە (نیشتمانی و دڵداری و ئایینی و ستایش و نامەو پێنج خشتەکی و هەمەڕەنگ)، دیوانێکی دەستخەتی هەیە کەزیاتر لە (٤٠) هەزار بەیتی لەخۆ گرتووە، جگە لەزمانی کوردی بەزمانی عەرەبیش هۆنراوەی وتووە، لە ١٩٧٣/١٠/٢٩ لەسلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

## * ١٠/٣٠

**- ١٩١٨ ئاگربەستی (مودرۆس) لەنێوان بەریتانیاو دەوڵەتی عوسمانی[١].**

**- ١٩٦٠ دوا ژمارەی گۆڤاری (هەتاو) دەرچوو.**

**- ١٩٧١ کۆچی دوایی دکتۆر (تاهیر بەهجەت مەریوانی).**

## * ١٠/٣١

**- ١٩٧٣ کۆچی دوایی بیریاری جەزائیری (مالك بن نبی)[٢].**

**- ١٩٨٥ کۆچی دوایی مامۆستا (قەناتی کوردۆ).**

**- ١٩٩١ دامەزراندنی (کۆمەڵەی زانستخوزانی کوردستان).**

**- ١٩٩٦ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (برایەتی ئەدەب و هونەر).**

---

١ - ئاگربەستی (مودرۆس) لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم لەنێوان بەریتانیاو دەوڵەتی عوسمانی لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی (١٩١٨) ڕاگەیەنرا، بەپێی ئەو ئاگربەستە عوسمانیەکان خۆیان بەدەستی ئینگلیزەکانەوە دا، هەر لەئەنجامی ئەو ئاگربەستەوە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کۆتایی هات و پاشان (مستەفا کەمال ئەتاتورك) دەوڵەتی تورکیای لەسەر بنەمای ڕەگەزپەرستی تورکی دامەزراند، پاش ئاگربەستەکەش ئینگلیزەکان ویلایەتی موسڵیان داگیرکردو لکاندیان بەعێراقەوە، کەئەمەش ناکۆکی خستە نێوان ئینگلیزو تورکیا، بەڵام لیژنەیەکی کۆمەڵەی نەتەوەکان لەساڵی (١٩٢٦) بەبڕیارێك ویلایەتی موسڵی دا بە بەریتانیەکان.

٢ - مالیکی کوڕی نەبی لەساڵی (١٩٠٥) لە (تەبسا)ی ڕۆژئاوای جەزائیر لەدایکبووە، خوێندنی ئامادەیی لەشاری قوستەنتینیەی جەزائیر تەواو کردووە، ساڵی (١٩٣٠) بۆ درێژەدان بەخوێندن چووە بۆ پاریس و کۆلیژی ئەندازیاری تەواو کرد، ئەم بیریارە جەزائیریە لە ئۆکتۆبەری (١٩٧٣) کۆچی دوایی کردو پاش خۆی چەندین بەرهەمی نایاب و بەپیزی بەجێهێشت و بەڕێگا چارە وردو قوڵەکانی توانی فیکری ئیسلامی دەوڵەمەند بکات و نەخشەو پلانی گۆڕانی کۆمەڵگەی ئیسلامی ڕەنگرێژ بکات.

# مانگی تشرینی دووەم (نۆڤەمبەر)

## * ١١/١

- ١٨٩٧ دامەزراندنی یانەی وەرزشی (یۆڤنتۆس)ی ئیتاڵی.
- ١٩١٨ (شێخ مەحمودی حەفید) کرا بەمەلیکی کوردستان.
- ١٩٥٠ کۆچی دوایی زانای بەناوبانگ (بەرنادشۆ)[١].
- ١٩٥٩ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هیوای کوردستان).
- ١٩٩٦ دامەزراندنی کەناڵی ئاسمانی (الجزیرة) لەقەتەڕ.

## * ١١/٢

- ڕۆژی قوتابیانی جیهان.
- ١٩١٧ بەڵێنی (بەلفۆڕ) بەسترا.
- ١٩٨٦ کۆچی دوایی شاعیر (ناصیح حەیدەری) لەهەولێر.
- ١٩٩٧ کۆچی دوایی (نەژاد ئەحمەد عەزیز ئاغا) جێگری سەرۆکی (ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان).

## * ١١/٣

- ١٩٦٨ کۆچی دوایی شاعیر نەجمەدینی مەلا ڕەسوڵ (ئاری).

---

[١] – جۆرج بەرنادشۆ، ساڵی (١٨٥٦) لەدایکبووە، لەلەندەن وەکو ڕەخنەگرێکی ڕۆژنامەوانی لەبوارەکانی مۆسیقاو شانۆ چالاکی زۆری ئەنجام داوەو باشترین بەرهەمی خۆی لەو ماوەیەدا نووسیوە، لەوانە: (جوهر الابسینیه ١٨٩١ و الفاغزیة الکاملة ١٨٩٨)، وە لەگرنگترین بەرهەمەکانی: (ئەندوکلیس و شێر، پیشەی خاتوو ڤارین، قوتابی ئەهریمەن، مرۆڤ و مرۆڤی نائاسایی، گەڕانەوە بۆ میتۆسیلا، مرۆڤ و چەك)، ساڵی (١٩٢٦) خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە.

- ٢٠٠٢ (پارتی دادو گەشەپێدان)ی تورکیا سەرکەوتنێکی گەورەی لەهەڵبژاردنەکاندا بەدەستهێنا.

## * ١١/٤

- ١٩٤٦ دامەزراندنی ڕێکخراوی (یونسکۆ).
- ١٩٨١ (ڕۆناڵد ڕیگن) بوو بەسەرۆکی ئەمریکا.
- ١٩٩٥ تیرۆرکردنی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل (ئیسحاق ڕابین)[1].

## * ١١/٥

- ٢٠٠٠ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (هاوڵاتی) لەسلێمانی.
- ٢٠٠٦ بڕیاری لەسێدارەدان بۆ (سەدام حسێن و بەرزان تکریتی و عواد حمد بندر) دەرچوو لەلایەن دادگای باڵای تاوانەکان لە عێراق.
- ٢٠٠٦ (ئەنجومەنی ئۆڵۆمپی کوردستان) لەشاری هەولێر ڕاگەیەنرا.

---

[1] - (ئیسحاق ڕابین) یەکێکە لەپسپۆڕە جەنگیەکانی ئیسرائیل، ساڵی (١٩٤٨) لێپرسراوی یارمەتی ناردن بووە بۆ هێزە زایۆنیەکان، وە فەرماندەی هێزە یەهودیەکان بوو، هەروەها لەڕێکخراوی (بیلماح)دا چەندین پۆستی وەرگرتووە کەڕێکخراوێکی تیرۆریستی جولەکەیەو تائاستی کەسی یەکەمی ڕێکخراوەکە ڕۆیشتووە، ڕابین ساڵی (١٩٥٤) کۆلیژی ئەرکانی سەربازی لەبەریتانیا تەواوکردووە، دواتر بوو بەسەرکردەی باکووری سوپای ئیسرائیل و لەساڵی (١٩٦٤) کرایە وەزیری بەرگری، ئیسحاق ڕابین لەدەورەی یەکەمی سەرۆك وەزیریەکەیدا لەساڵی (١٩٧٦) دەستی لەکارکێشایەوە، پاش ئەوەی بەتۆمەتی دزی و یاریکردن بەسامانی ئیسرائیل لەبانکە ئەمریکیەکاندا تاوانبارکرا، ساڵی (١٩٩٣) فەرمانی بۆمبارانکردنی باشووری لوبنانی دەرکرد، هەروەك (٤٥٠) سەرکردەی هەڵبژاردەی فەلەستینی دوورخستەوە بۆ باشوری لوبنان، ڕابین ساڵی (١٩٩٢) جارێکی تر کرایەوە بەسەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل، لەبەرواری ١٩٩٥/١١/٤ لەلایەن قوتابیەکی زانکۆوە بەناوی (ئیگال ئەمیر) کەسەر بەڕێکخراوی (تۆڵەی جولەکە)بوو تیرۆرکرا.

## * ١١/٦

- ١٨٦٠ (ئەبڕاهام لنكولن) بوو بەسەرۆكی ئەمریكا.
- ١٩٩٦ كۆچی دوایی (شێخ عەبدولحەمید كوشك)[1].
- ٢٠٠٦ كۆچی دوایی (بلەند ئەجەوید) سەرۆك وەزیرانی پێشووتری توركیا.

## * ١١/٧

- ١٩١٧ هەڵگیرسانی (شۆڕشی ئۆكتۆبەر) لەڕوسیا.
- ١٩٨٦ كۆچی دوایی هونەرمەند مامۆستا (شەماڵ صائیب).
- ١٩٩٧ كۆچی دوایی مامۆستا (مەلا مەحمودی عەنەب).

---

[1] - شێخ عەبدولحەمید كوشك لەساڵی (١٩٣٣) لەپارێزگای (البحیرة)ی میسر لەدایكبووە، لەمناڵیەوە تووشی نەخۆشی چاو (الرمد الحبیبی) بووەو لە (١٢) ساڵیدا بەتەواوەتی بینایی لەدەستداوە، لەتەمەنی هەرزەكاریدا قورئانی پیرۆزی لەبەركردووەو سەرەتایی و ناوەندی ئەزهەری خوێندووەو كۆلیژی (أصول الدین)ی لەزانكۆی ئەزهەر تەواوكردووەو پاشان (لیسانس)ی لە (أصول الفقه)دا هێناوە، پاشان بووە بەپێش نوێژو وتارخوێن لەمزگەوتەكانی میسر ئەنجامداوەو ساڵی (١٩٦٤) لەمزگەوتی (عین الحیاة) لەقاهیرە گیرساوەتەوە، شێخ كوشك بەهۆی دەربڕینە كاریگەرەكەی و وتارە بەهێزو بوێرەكانیەوە كە ڕووبەڕووی فەسادو ستەم دەبۆوە، جەماوەرێكی زۆری لەدەوری خۆی كۆكردەوە، بۆیە لەساڵی (١٩٦٦) دەستگیركراو دوای دووساڵ ئازادكرا، بەڵام تا ساڵی (١٩٧٢) ڕێگەی پێنەدرا كەدەست بەوتاردان بكاتەوە، لەوتاری ئێوارانیدا لەمزگەوتەكەی خۆی خەڵكێكی زۆر لەدەوری كۆدەبوونەوە، بەشێوەیەك كەلەناو مزگەوت جێیان نەدەبۆوە، لەمانگی ئەیلولی (١٩٨١) شێخ و ژمارەیەك لەوتاربێژەكانی تر دەستگیركران، بەتۆمەتی دژایەتی كردنیان بۆ ڕێكەوتننامەی (كامپ دیڤید)، دوای كوژرانی (ئەنوەر سادات) لە ١٩٨١/١١/٦ (كوشك)و هاوڕێكانی ئازادكران، بەڵام شێخ ڕێگەی پێنەدرا كەوتار پێشكەش بكات تا ڕۆژی وەفاتكردنی لە ١٩٩٦/١١/٦.

## * ١١/٨

- ١٩٦٠ دامەزراندنی ڕێکخراوی (کۆمەڵەی گەشەپێدانی نێودەوڵەتی).
- ١٩٦٠ (جۆن کەنەدی) بوو بەسەرۆکی ئەمریکا.
- ١٩٨٨ (جۆرج بۆش)ی باوك بوو بەسەرۆکی ئەمریکا.

## * ١١/٩

- ١٨٧٧ لەدایکبوونی شاعیرو فەیلەسوفی ئیسلامی (محەمەد ئیقباڵ).
- ١٩٠٨ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (کورد) لەئەستەنبوڵ لەلایەن پیرەمێردەوە.
- ١٩٤٧ دەرچوونی بڕیاری ژمارە (١٨١)ی نەتەوە یەکگرتووەکان تایبەت بەدابەشکردنی فەلەستین.
- ١٩٧٠ کۆچی دوایی سەرۆکی فەڕەنسا جەنەڕاڵ (دیگۆڵ)[1].

## * ١١/١٠

- ١٩٣٨ کۆچی دوایی (مستەفا کەمال ئەتاتورك).

[1] – چارڵ دیگۆڵ، ساڵی (١٨٩٠) لەدایکبووە، لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەم پلەی ئەفسەری لەناو سوپای فەڕەنسادا هەبووە، کاتێ ئەڵمانەکان لەحوزەیرانی (١٩٤٠) کۆماری فەڕەنسایان داگیرکرد، دیگۆڵ ڕایکرد بۆ بەریتانیاو لەوێ بوو بەفەرماندەی ئەو هێزانەی بە (فەڕەنسای ئازاد) ناسرابوون، دوای پاشەکشێی ئەڵمانەکان، دیگۆڵ لەئابی (١٩٤٤) گەڕایەوە بۆ پاریس و سەرۆکایەتی حکومەتێکی کاتی گرتە ئەستۆ، بەڵام لەساڵی (١٩٤٦) دەستی لەکارکێشایەوە، پاشتر لەساڵی (١٩٥٠) بووەوە بەسەرۆك وەزیران و لەهەمان ساڵدا بووە سەرۆکی ئەوەی ناوی لێنرابوو (کۆماری پێنجەم)، دیگۆڵ لەماوەی دەسەڵاتیدا توانی هێزی بەرپەچدانەوەی ئەتۆمی بۆ فەڕەنسا دامەزرێنێ و پەیماننامەی ئاشتبوونەوەی مێژوویی لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا مۆربکات، ساڵی (١٩٦٩) دەستی لەکارکێشایەوەو ساڵی (١٩٧٠) کۆچی دوایی کرد.

- ١٩٤٨ کۆچی دوایی شاعیری کورد (زێوەر)[١].
- ١٩٧١ لەدایکبوونی هونەرمەندی ئێرانی (نیکی کەریمی).
- ١٩٧٢ کۆچی دوایی زاناو شاعیری کورد (شەکیب).
- ١٩٨٩ دیواری بەرلین ڕووخێنرا.

## * ١١/١١

- ١٩١٨ کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی.
- ١٩٦٨ دەرچوونی گۆڤاری (کاری میللی) لەبەغدا.
- ١٩٧٣ ژمارە (سفر)ی بڵاوکراوەی (ڕۆشنبیری نوێ) دەرچوو.
- ١٩٧٣ کۆچی دوایی (مامۆستا حەسەن هوزەیبی).
- ١٩٧٥ سەربەخۆیی (ئەنگۆلا) لەپورتوگال.

---

[١] – زێوەر، ناوی عەبدوڵڵا محەمەد ئەفەندی مەلا ڕەسوڵە، ساڵی (١٨٧٥) لەسلێمانی لەدایک بووە، لەتەمەنی (٧) ساڵیدا چۆتە حوجرە، پاشان بۆ خوێندن چۆتە ئەستەنبوڵ، لەساڵی (١٣٢٤)ی ڕۆمی بووە بەمامۆستای زمانی تورکی لە(ڕوشدیەی عەسکەری)، لە ساڵی (١٩٢١) بووەتە مامۆستا لەقوتابخانەی نموونەی سەعادەت، لەساڵی (١٩٣٠) گوێزراوەتەوە بۆ بەرزنجەو دواتریش بۆ بیارە، لەبەرهەمەکانی: (دیوانی زێوەر، ژیانی پێغەمبەران، دەستە گوڵی لاوان، داستانی (سۆزناك کەربەلا) بەفارسی، فەرهەنگی زێوەر (دەستنووس)، چیرۆکی حکومەتێکی خەیاڵ)، لەهۆنراوەکانی زێوەر:

ئەی کوردینە ئەی مەردینە

بادەست لەناو دەست کەین هەموو

بۆ یەکیەتی بچین هەموو کوردین هەموو

بێ کەس نیە دایکی وەتەن

ئێمە فیداکاری ئەوین

تاکورد لەعالەم دەرکەوێ

بۆ یەکیەتی بچین هەموو کوردین هەموو.

**- ٢٠٠٤ کۆچی دوایی سەرۆکی دەسەڵاتی فەڵەستینی (یاسر عەرەفات).**

**- ٢٠٠٥ کۆچی دوایی دەرهێنەری سینەمایی (مستەفا عەقاد)[١].**

## * ١١/١٢

**- ١٩٣٦ کۆچی دوایی شاعیری کورد (حەمدی)[٢].**

---

[١] - مستەفا عەقاد، دەرهێنەری فیلمی بەناوبانگی (ڕیسالە)، لەساڵی (١٩٣٥) لەشاری حەلەبی سوریا لەدایکبووە، ڕیسالە یەکەم فیلمە دەربارەی پەیامی ئیسلام لەهۆلیۆد بەرهەم هێنرابێت، کە لەساڵی (١٩٧٦) لەوڵاتی (لیبیا) بەرهەم هاتووەو پێنج ساڵ ئامادەکاری بۆکراوە، لیبیا هاوکاری (مستەفا عەقاد)ی کرد بەو مەرجەی کە پاش تەواوکردنی ڕیسالە، فلیمێك لەسەر یەکێك لەشۆڕشگێڕە لیبیەکان بەرامبەر داگیرکەران بەرهەم بهێنێت، عەقاد بەو مەرجە ڕازی بوو، پاشتر فیلمی شێری بیابان (عومەر موختار)ی بەرهەم هێنا، عەقاد پێش ئەوەی یەکێك لەئاواتەکانی بێتەدی کەبەرهەمهێنانی فیلمێك بوو لەسەر ژیانی سەلاحەدینی ئەیوبی، لە ٢٠٠٥/١١/١١ لەگەڵ (ڕیم)ی کچی لەکردەوەی تەقاندنەوەی هۆتێلی (گراند) لەعەممانی پایتەختی ئەردەن کۆچی دواییان کرد.

[٢] - حەمدی، ناوی ئەحمەدی فەتاح بەگی حاجی ئیبراهیم بەگی ساحێبقرانە، بەپێی پارچە شیعرێکی خۆی مێژووی هاتنە دونیای دەرخستووە، کەدەڵێ:

گەرام بۆ ساڵی تەئریخی ولادەتم و غەریبم دی

بەهیجری حەمدی دەنگی بوو لەنەو "باری غمم" دەست کەوت.

(باری غمم) بەپێی حروفی ئەبجەدی دەکاتە (١٢٩٣ك - ١٨٧٦ز)، حەمدی لەتەمەنی (٨) ساڵیدا دەچێتە قوتابخانەی مەلا عەزیز زەڵزەلەیی لەسلێمانی، دواتر چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی تاگەیشتۆتە پۆلی یەکەمی ڕوشدیە، بۆ خوێندنی عەرەبی و ئایینیش هاتووچۆی سلێمانی کردووە، بەتایبەتی لەخانەقای (مەحوی)دا گەلێکی خوێندووە.

حەمدی هەر لەمنداڵیەوە ئولفەتی بەئەوین و شیعرەوە گرتووە، لە ساڵی (١٨٩٢) یەکەم شیعری وتووە، بەردەوام بووە تا ساڵی (١٨٩٢) کەساڵی داگیرکاری بووەو میری ماڵەکەیانی

– ١٩٤٨ كۆچی دوایی شاعیر یونس ڕەئوف (دڵدار)[1].

## * ١١/١٣

– ١٩٢٩ (عەبدولموحسین سەعدون) سەرۆك وەزیرانی عێراق خۆی کوشت.

---

داگیرکردووەو هەرچی هەبووە لێی زەوتکراوەو کتێبخانەیەکی بەنرخیشی هەبووە سوتاندویانەو هەوڵ و تەقەللای (٢٤) ساڵی تەمەنی شیعری بووە بەئاگر، حەمدی لە ١٩٣٦/١١/١٢ کۆچی دوایی کردووەو لەگردی سەیوان بەخاك سپێرراوە، لەسەر کێلی گۆڕەکەی ئەم هۆنراوەیە نووسراوە:

لەدەفی سنگ ئەدەم لەتەپڵی سەر
لەنەفیری نەفەس دەدەم وەك نەی
گاه دێوانەو گاه ئاقڵ
یاهو یاهو دەڵێم یاهەی هەی
خەوو بێداری وەك یەکن بۆمن
مردنم کەم نییە لەحاڵی مەی
لەئەزەل تائەبەد، خوا خوایە
جیلوەیەکە کەپڕ لەدوو دنیایە.

[1] – دڵدار، یونس کوڕی مەلا ڕەئوفی مەلا مەحموده ئەفەندیە، خوێندنی سەرەتایی لەکۆیە تەواو کردووە، ساڵی (١٩٣٥) بۆ خوێندنی ناوەندی چووە بۆ هەولێر، هەر لەهەمان ساڵدا یەکەم شیعری لەگۆڤاری ڕووناکیدا لەهەولێر بڵاوکردۆتەوە، ساڵی (١٩٣٨) بۆ خوێندنی ئامادەیی چووە بۆ کەرکوك و لەوێ بووە بەئەندامی (کۆمەڵی دارکەر)، ساڵی (١٩٤٠) بۆ خوێندنی ماف (حقوق) چووە بۆ بەغدادو لەوێش بووە بەئەندامی (حیزبی هیوا) کەسەرۆکەکەی (ڕەفیق حیلمی) بوو، دوای تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ دەگەڕێتەوە بۆ هەولێرو دەبێتە پارێزەر تا لە ١٢ی تشرینی یەکەمی (١٩٤٨) کۆچی دوایی دەکات، شیعری (ئەی ڕەقیب) یەکێکە لەشیعرە بەنرخەکانی دڵداری شاعیرو تائێستاش وەکو سرودی نیشتمانی دەوترێتەوە.

– ١٩٦١ بەنداوی دوکان کرایەوە.

– ١٩٩٠ سەربەخۆیی (لۆکسمبۆرگ) لەهۆڵەندا.

## * ١١/١٤

– ڕۆژی جیهانی نەهێشتنی نەخۆشی شەکرە.

– ١٧٨٤ پایتەختی (میرنشینی بابان) لە قەڵاچوالانەوە گوازرایەوە بۆ سلێمانی.

– ١٩١٩ داگیرکردنی (ئاکرێ) لەلایەن ئینگلیزەکانەوە،

– ١٩٢٢ دامەزراندنی ڕادیۆی لەندەن (BBC)[١].

– ١٩٨٧ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (ڕەنگین).

## * ١١/١٥

– ١٩٢٢ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان)[٢].

---

[١] – (ئێرە ڕادیۆی لەندەنە، کۆمپانیای ئێزگەی بەریتانیا) بەم وشانە کۆمپانیای ئێزگەی بەریتانیا یەکەم پەخشی خۆی بڵاوکردەوە لەئێوارەی ١٤ی تشرینی دووەمی (١٩٢٢)، وە نزیکەی (٣٠٠٠٠) کەس لەخەڵکی لەندەن گوێ بیستی بوون، وە لە ١٩٢٣/١٢/٣١ بەبۆنەی سەریساڵی نوێوە بۆ یەکەم جار دەنگی کاتژمێرە بەناوبانگەکەی لەندەن (Big Bin) لەڕادیۆی لەندنەوە بیسترا، ئەم ڕادیۆیە پەرەی پێدرا تاکو لەساڵی (١٩٢٧) بەدەستورێکی مەلەکی بوو بە (دەزگای ڕادیۆی بەریتانیا BBC) کەکورتکراوەی ( British Broadcasting Corporation)، ئێستا ئەم ئێزگەیە بە (٥٠) زمانی جیهانی بەرنامەکانی خۆی بۆ هەموو جیهان پەخش دەکات.

[٢] – (ڕۆژی کوردستان) ڕاستەوخۆ لەدوای (بانگی کوردستان) دەرچووەو زمانحاڵی ڕەسمی حکومەتەکەی شێخ مەحمود بووە، یەکەم ژمارەی لە ١٩٢٢/١١/١٥ لە سلێمانی دەرچووە، خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری (شێخ نوری شێخ ساڵح) بووەو نووسەرەکەشی (عەلی کەمال) بووە، لەژێر ناوی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە: (سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی، غەزەتەیەکی

- ١٩٨٣ كۆچی دوایی (نوری شاوەیس).

## * ١١/١٦

- ڕۆژی جیهانی لێبوردن.
- ١٩٣٤ کۆچی دوایی (کارل فۆن لیندە) داهێنەری سەلاجەی کارەبایی.

## * ١١/١٧

- ١٩١٨ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ژین) لەئەستەنبوڵ[1].

---

ڕەسمیە هەفتەی جارێك دەردەچێ)، ڕۆژی کوردستان بەشێوەو قەبارە وەکو پێشکەوتن و بانگی کوردستان وابوو، لەهەمان چاپخانەو بەهەمان پیت چاپکراوە، کارمەندانی چاپخانە کە هەر ئەوانەی پێشوو بوون و زۆربەی نووسەرەکانیشی هەمان نووسەرانی ڕۆژنامەکانی پێش خۆی بوون، گرنگی ڕۆژی کوردستان لەوەدایە کەدرێژەی بەکاری ڕۆژنامەوانی داوەو نەریتی ڕۆژنامەوانی چەسپاندووە، پاش بۆردومانی هێزەکانی بەریتانیا لەمانگی ئازاری (١٩٢٣)، مەلیکی کوردستان (شێخ مەحموود) لەگەڵ هێزەکەیدا سەر لەبەیانی ڕۆژی (٤)ی ئازار کشایەوە بۆ ناوچەی سورداش، چاپخانەکەشی گوێزرایەوە بۆ ئەشکەوتی جاسەنە، ئیتر (ڕۆژی کوردستان) لەدەرچوون کەوت، بەڵام چوار ڕۆژ دوای ئەوە لە ١٩٢٣/٣/٨ ڕۆژنامەی (بانگی حەق)ی لەئەشکەوتی جاسەنە دەرکرد.

[1] - یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ژین) (١٧) ڕۆژ دوای ڕاگرتنی جەنگی جیهانی یەکەم، لە ١٩١٨/١١/١٧ لەئەستەنبوڵ دەرچووە، لەژمارە (١-٢٠) (حەمزە موکسی) صاحیبی ئیمتیازو مدیری مەسئولی بووە، لەژمارە (٢٠) بەدواوە (مەمدوح سەلیم) بۆتە صاحیبی ئیمتیازو مدیری مەسئولی، لەژێر ناوی کوردی (ژین)دا بەعەرەبی نووسراوە (حیات)و لەژێر ناوەکەشیدا نووسراوە (دین، أدبیات، إجتماعیات و إقتصایاتدن بحث ایدر تورکجة- کوردجة مجموعة در)، ژین تا ژمارە (٣٤)ی گۆڤار بووە، ئیتر لەوە بەدواوە بەشێوەی ڕۆژنامە دەرچووە، ژین گرنگی بەزۆر لەبوارەکانی نووسین داوە لەبواری (سیاسی و ئەدەبی و مێژوویی و هەواڵی ڕۆشنبیری)، زمانی ڕۆژنامەکە (تورکی عوسمانی - کوردی) بووەو بەڕێنووسی فارسی و عەرەبی نووسراوە.

- ١٩٦٧ كۆچی دوایی زانای گەورەی کورد (شێخ ئەمجەد زەهاوی)[١].
- ١٩٨٩ کۆچی دوایی (مامۆستا مەلا ساڵحی گەورە)[٢].

---

[١] - مامۆستا ئەمجەد زەهاوی، ساڵی (١٨٨٠) لەدایك بووە، یەکەم مامۆستا لەژیانیدا (مەلا سەعید ئەفەندی) باوکی بووە، کەموفتی بەغداو زانایەکی ناوداری عێراقی بووە، لەتەمەنی لاوێتیدا دەچێتە ئاستانەو لەکۆلێژی (قچاو) وەردەگیرێ و پاش تەواوکردنی لەساڵی (١٩٦٠) دەگەڕێتەوە بۆ بەغداد، مامۆستا زەهاوی هەر لەسەرەتای تەمەنیدا توانای زیرەکی و بلیمەتی دەردەکەوێ، بۆیە سەرۆکایەتی زۆرێك لەکۆڕو کۆمەڵەو کۆنگرەکانی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامیەکان دەکات، لەوانە:

(پاش گەڕانەوەی لەتورکیا بووەتە موفتی بەغداد، دواتر بۆتە ئەندامی دادگای تێهەڵچوونەوە (إستئناف) لەبەغدادو، بۆ ماوەیەکیش دادگای (جەزا)ی بەسرە بووە، لەساڵی (١٩٤٧) بووە بەسەرۆکی (کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامی)، لە (١٩٥٣) بووە بەسەرۆکی (ڕابیتەی زانایانی عێراق) و تاکۆچی دوایی لەپۆستەکەیدا ماوەتەوە، هەر لەساڵی (١٩٥٣)دا بووە بەسەرۆکی (کۆمەڵەی ڕزگارکردنی فەڵەستین)، لە (١٩٥٦) بووە بەسەرۆکی (کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامی) کە یەکەم ڕووی (ئیخوان موسلمین) بوو لەعێراق).

[٢] - مامۆستا مەلا صاڵحی هەڵەبجە، ساڵی (١٩٠٤) لەگوندی (هەناری)ی شارباژێر لەدایك بووە، لەمزگەوتی خەنەقای مەولانا خالید لەسلێمانی لای زانای پایەبەرز (شێخ عومەری قەرەداغی) زانستە گرنگەکانی وەك فەلسەفەو ئیلاهیات و ئوصولَ و مەنتقی خوێندووەو هەر لای ئەویش ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، پاشان بووە بە پێشنوێژی مزگەوتی گوندی (تریفە) لەنزیك هەڵەبجە، لەکۆتایی چلەکاندا دەچێتە هەڵەبجەو لەگەڕەکی کانی عاشقان مزگەوتێك و مەدرەسەیەك دروست دەکات و دەبێتە جێی خوێندنی زانستە شەرعیەکان، لەپەنجاکاندا پەیوەندی بە(شێخ ئەمجەد زەهاوی)یەوە دەکات و ڕێ بۆ بڵاوکردنەوەو گەیشتنی نامیلکە ئیسلامیەکان بۆ کوردستان ئاسان دەکات، پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووز بەسەرۆکایەتی وەفدێك چاوی بە (عەبدولکەریم قاسم) دەکەوێت و پشتگیری گۆڕانکاریەکەی کردووە، بەڵام پاش ماوەیەك بەتۆمەتی ئەوەی کە مامۆستا وتوویەتی (تەمسیل کردن بە ئەندامی لەشی مەلیك فەیصەڵ بەمردوویی دروست نەبووە) دەستگیری دەکەن و دەیبەن بۆ

## * ١١/١٨

### - ١٩٣٧ لەسێدارەدانی سەید ڕەزاو هاوڕێکانی لەدەرسیم[١].

---

بەغدادو لەبەردەم دادگای سەربازیدا دادگایی دەکرێت، سەرۆکی دادگا (عەقید شەمسەدین عەبدولا) ئازادی دەکات، بەلام جارێکی تر لەئازاری (١٩٥٩) بەتۆمەتی پالپشتیکردنی هەوڵەکەی (عەبدولوەهاب شەواف) لەموسلْ دژی عەبدولکەریم قاسم، لەگەلْ چەند زانایەکی تری ناوچەکە دووردەخرێنەوە بۆ (ناسریە)، پاش چەند مانگێك بەلێبوردنێکی گشتی (قاسم) دەگەڕێنەوە بۆ هەڵەبجە، سالی (١٩٦٥) لەگەلْ ژمارەیەك لەزانایانی عێراقدا بەشداری لە (کۆنگرەیەکی ئیسلامی)دا دەکەن لەبەغدادو بۆ (لیژنەی دەرکردنی فەتواو بڕیار) هەلدەبژێردرێت، وە بەشداری دەکات لەپوچەلکردنەوەی بڕیارێك کەبزووتنەوەی کوردی بە(باغی)و یاخی تاوانبار بکات، سالی (١٩٦٦) حەجی مالی خوا دەکات، هەر لەوسالەدا بەدەستی خۆی یاداشتێکی نارەزایی دەداتە بالوێزخانەی میسر لەبەغداد سەبارەت بەلەسێدارەدانی (سەید قوتب)، لەسالەکانی کۆتایی تەمەنیدا لەمزگەوتی کانی عاشقان دەمێنێتەوە، پاش کارەساتی کیمیابارانی هەلەبجە، ئاوارەی ئێران دەبێت و لە ١٩٨٩/١١/١٧ لەشاری (سنە) کۆچی دوایی دەکات.

[١] - هێزە سەربازیەکانی دەولەتی تورکیا، سالی (١٩٣٦) هەلمەتێکی سەربازی دەستپێکرد بۆ ناوچەی (دەرسیم) بەبیانووی ئەوەی کەخەلکی ئەم ناوچەیە پشتگیری لەیاسای تورکیا ناکەن کەملکەچ بوونە بۆزمانی تورکی، وە هەر لەسەرەتاوە ناوی (دەرسیم)یان گۆڕی بۆ (تونجلی)، لەم میانەشدا (سەید ڕەزای دەرسیمی) ڕابەری کوردەکانی دەرسیم، نامەیەکی نارەزایی ئاراستەی جەنەڕالْ (ئالب دۆگان) کرد، بەلام دۆگان گوێی بەنامەکە نەدا، هەربۆیە سەید ڕەزا کەوتە حالەتی ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی لەگەلْ حکومەتی تورکیا، سەید ڕەزا بۆ پشتگیری ڕاپەڕینەکەی (دکتۆر محەمەد نوری دەرسیمی) ڕەوانەی سوریا کرد، (دکتۆر دەرسیمی) لەسوریاوە بەیاوەری (دکتۆر کامەران بەدرخان) ڕوویکردە میسرو ولاتانی تری جیهانی عەرەبی و ئیسلامی، بەلام هیچ ولاتێك پشتگیری شۆڕشەکەیان نەکرد، بۆیە سەیدڕەزا دوای نائومێدبوونی لەهەرجۆرە هاوکاریەك، لەبەهاری (١٩٣٧) ئیبراهیمی کوڕی ڕەوانەی لای جەنەڕالْ دۆگان کرد بەمەبەستی دانوستان و ئاشتەوایی، بەلام دۆگان داوای

– ١٩٦٢ كۆچی دوایی شاعیری کورد (گۆران)[1].

– ١٩٦٢ کۆچی دوایی (نێلز بۆر) یەکەمین جێبەجێکەری تیۆری کوانتەمی.

## * ١١/١٩

– ١٩١٦ مۆرکردنی پەیماننامەی (سایکس بیکۆ).

– ١٩١٧ دامەزراندنی (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان).

---

خۆ بەدەستەوەدانی کردو سەید ڕەزا داواکەی ڕەتکردەوە، هەر لەبەهاری ئەو ساڵەدا دۆگان لەشکرێکی گەورەی بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە ڕەوانەی ناوچە کوێستانیەکانی دەرسیم کرد، بەڵام سەرەڕای کوشتاری زۆر نەیانتوانی سەرکەوتووبن، بۆیە ئەم جارەیان دۆگان داوای دانوستانی کردو سەیدڕەزاش بەدڵسافی قبوڵی کردو بەمەبەستی دانوستان ڕووی لە (ئەرزەنجان) کرد، بەڵام دەستبەجێ لەوێ لەلایەن سوپای تورکیاوە دەستگیرکران، وە لەڕۆژی ١٩٣٧/١١/١٠ دادگای سەربازی تایبەت لەشاری (العزیز) بەئامادەبوونی (ئەتاتورك) دەستی پێکردو دادگا بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ سەیدڕەزاو (٢٧) کەس لەهاوڕێکانی دەرکردو (٢٣) کەسی تریش حوکمی زیندانی درێژخایەنیان بۆ دەرچوو، ئەوەبوو لە ١٩٣٧/١١/١٨ سەیدڕەزاو کوڕێکی و هاوڕێکانی تریان لەسێدارەدران.

[1] – شاعیری کورد عەبدوڵڵا سلێمان عەبدوڵڵا ناسراو بە (گۆران) ساڵی (١٩٠٥) لەهەڵەبجە لەدایکبووە، چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی لەهەڵەبجە، ساڵی (١٩١٩) باوکی کۆچی دوایی کردووەو ساڵی (١٩٢١) محەمەد بەگی برای ناردوویەتیە مەدرەسەی علمیە لەکەرکوك، هەر لەو ساڵەدا براکەی دەکوژرێ، لەبەرئەوەی کەس نەبووە خۆی و دایکی بەخێو بکات واز لەخوێندن دەهێنێت، ساڵی (١٩٢٥) بەمامۆستای سەرەتایی لەهەڵەبجە دامەزراوە، ساڵی (١٩٣٧) بەیارمەتی (توفیق وەهبی) کە ئەوکات بەڕێوەبەری ئەشغال بووە، گوێزراوەتەوە بۆ دائیرەی ئەشغال، گۆران زمانی فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی زانیوە، مامۆستا (ڕەشید نەجیب) نازناوی (گۆران)ی بۆ داناوە، گۆران شاعیرێکی بەتوانا بووە بەتایبەتی لەپەسنداو پەسنی سروشتی کوردستانی بەجوانی کردووە، لە (١٩٦٢) کۆچی دوایی کردووە.

## ١١/٢٠ *

- ١٨٧٤ لەدایکبوونی (ونستۆن چەرچڵ).
- ١٩٣٥ کوژرانی (عزالدین قسام) لەفەلەستین.
- ١٩٣٧ لەسێدارەدانی (مەحمود جەودەت).
- ١٩٨٩ دەرچوونی (ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی مافەکانی منداڵ).

## ١١/٢١ *

- ڕۆژی جیهانی تەلەفزیۆن.

## ١١/٢٢ *

- ١٩٦٣ تیرۆرکردنی سەرۆکی ئەمریکی (جۆن کەنەدی)[١].
- ١٩٩٩ تیرۆرکردنی (عەبدولقادر حاشانی) لە فەڵەستین.

## ١١/٢٤ *

- ١٩٣٥ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ڕووناکی) لەهەولێر.
- ١٩٦٠ کۆچی دوایی شاعیری کورد (حەمدی بەگی بابان).
- ١٩٨٠ کۆچی دوایی قورئان خوێن (شێخ مەحمود خەلیل حوصەری).
- ١٩٨٩ کوژرانی (عەبدوڵا عەزام)و دوو کوڕی لەپیشاوەری پاکستان.
- ١٩٩٨ (ئەمیل لەحود) بوو بەسەرۆکی لوبنان.

---

[١] – (جۆن فتزجیراد کەنەدی) لەدایکبووی ساڵی (١٩١٧)ی ئەمریکایە، لەزانکۆی (هارڤارد) بڕوانامەی زانستی وەرگرتووە، لە (١٩٤٦) بەنوێنەری دیموکراتەکان بۆ ئەندامی کۆنگرێس هەڵبژێردراوە، لە (١٩٥٢) بووە بەئەندامی (ئەنجومەنی پیران)، سەرۆکی حزبی دیموکراتی ئەمریکاو (٣٥)ەمین سەرۆکی ئەمریکی بووە لەماوەی ساڵانی (١٩٦١-١٩٦٣)، یەکەم کاسۆلیکی ئەمریکی بووە کەهەڵبژێردراوە بەسەرۆکی ئەمریکا، ساڵی (١٩٦٣) لەلایەن (لی هارفی ئۆزولد)ەوە تیرۆرکراوە لەشاری (دالاس)ی ویلایەتی تەکساس.

## * ١١/٢٥

- ١٩٦٠ ڕۆژی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژ بەژنان[١].
- ١٩٧٥ کۆچی دوایی شاعیر (شێخ ئیبراهیمی شانەدەری).
- ١٩٧٨ دامەزراندنی پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیا (pkk).
- ١٩٩١ کۆچی دوایی نووسەری کورد (فەرەیدون عەلی ئەمین).

## * ١١/٢٦

- ١٩٤٧ دامەزراندنی (کۆڕی زانیاری عیراق).
- ١٩٦٩ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (بەیان).
- ١٩٩٢ دامەزراندنی پەیمانگای هونەرەجوانەکانی هەولێر.

## * ١١/٢٧

- ١٩٤٠ کۆچی دوایی شێخ باباعەلی تەکیەیی
- ١٩٥٣ کۆچی دوایی نووسەری ئەمریکی (ئیوگین ئونیل).

## * ١١/٢٨

- ١٩١٢ سەربەخۆیی (ئەلبانیا) لەخەلافەتی عوسمانی.
- ١٩٦٠ سەربەخۆیی (مۆریتانیا) لەفەڕەنسا.
- ١٩٨٠ دامەزراندنی (الجبهة الوطنية الديمقراطية (جود) – بەرەی نیشتمانی دیموکراتی) لەنێوان (پارتی و حشع و حسك و پاسۆك).

---

[١] – ژنانی چالاکی بواری مافەکانی ژنان لەساڵی (١٩٨١)ەوە ڕۆژی (١١/٢٥)یان وەك ڕۆژی بەرەنگابوونەوەی توندوتیژی دژ بەژنان دیاریکرد، پاشان کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەککگرتووەکان لەساڵی (١٩٩٩) ئەم ڕۆژەی بەفەرمی ناساند، دیاریکردنی ئەم بەروارە دەگەڕێتەوە بۆ ١٩٦٠/١١/٢٥، کاتێك بەفەرمانی (ڕافائیل تروجیلو) دیکتاتۆری کۆماری دۆمەنیکان، سێ خوشکی چالاك لەبواری ڕامیاریدا تیرۆرکران.

- ١٩٩٠ (جۆن میٚجەر) بوو بەسەرۆك وەزیرانی بەریتانیا.

## * ١١/٢٩

- ١٩٢١ لەدایکبوونی هونەرمەند (حەسەن زیرەك) لەشاری بۆکان.
- ١٩٤٥ دامەزراندنی (کۆماری یۆگسلاڤیا).
- ١٩٤٧ دابەشکردنی دەوڵەتی فەڵەستین.
- ١٩٩٠ (ئەنجومەنی ئاسایش)ی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری (٦٧٨)ی بۆ بەکارهێنانی هێز لەدژی عێراق پەسەند کرد.

## * ١١/٣٠

- ١٩٧٣ کۆچی دوایی هونەرمەند (ڕەفیق چالاك).
- ١٩٧٤ کۆچی دوایی شاعیر (کەمالی)[1].

---

[1] - (کەمالی)، عەلی کوڕی باپیر ئاغایە، ساڵی (١٨٨٦) لەسلێمانی لەدایکبووەو لە (١٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە، لەلای (مەحوی) زانستی (عەروز)ی خوێندووە، پاشان بووە بە (کاتب)و لە (١٩٠٦)دا گوێزراوەتەوە بۆ بەغداد، ساڵی (١٩١٩) لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بۆ ماوەیەکی کورت کراوە بە (قائمقامی چەمچەماڵ)، ساڵی (١٩٢٢) شیعرەکانی مەحوی کۆکردۆتەوەو لەسەر ئەرکی (میٚجەرسۆن)ی حاکمی سیاسی ئینگلیز لەسلێمانی چاپی کردووە، کەمالی بەدوایین شاعیری کلاسیکی کوردی دادەنرێت، زمانی فارسی و تورکی بەباشی زانیوە، لەزۆربەی ڕۆژنامە کوردیەکانی سلێمانیدا کاری کردووەو لەڕاپەڕینەکەی (شێخ مەحموود)دا بەشدار بووە، لەبەرهەمەکانی:

- شاعیرە ناو ونبووەکان - ١٩٣٧
- گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەصرم - ١٩٣٩.
- باغی میر (کۆمەڵە شیعر) - ١٩٦٨
- دیوانی کەمالی.

هەروەها ژمارەیەك چیرۆك و ئەفسانەی فارسی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، لەوانە: چیرۆکی (شیرین و فەرهاد)و (شیرین و خەسرەو).

**- ١٩٨٨ کۆچی دوایی قورئان خوێنی بەناوبانگ (عەبدولباست محەمەد عەبدولصەمەد)[١].**

**- ٢٠٠٦ کۆچی دوایی مێژوونووس (محەمەد ڕەسوڵ هاوار).**

---

[١] - قورئان خوێنی بەناوبانگ (شێخ عەبدولباست محەمەد عەبدولصەمەد)، ساڵی (١٩٢٧) لەشاری (قەنا)ی میسر لەدایکبووە، لەتەمەنی (١٠) ساڵیدا قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە، لەتەمەنی (١٤) ساڵیدا لەئاهەنگی قورئان خوێندندا بەشداری کردووەو خەڵات کراوە، ساڵی (١٩٥١) پەیوەندی بەئێزگەی قاهیرەوە کردووەو چەند کاسێتێکی دەنگی لەسەر قەوان تۆمارکردووە، هەر لەوساڵەدا حەجی ماڵی خوای کردووە، لەژیانیدا زۆربەی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی و ئەورووپی و ئەمریکی گەڕاوەو بەدەنگە کاریگەرەکەی خەڵکی سەرسام کردووە، ساڵی (١٩٨٦) سەردانی عێراقی کردووە، لەم بارەیەوە (هەژار موکریانی) دەڵێت: ئەو کاتە شێخ عەبدولباست لەهۆتێل فەڵەستین دەبێ و چاوپێکەوتنی لەگەڵ سازدەکەن، دەڵێ: من بەڕەچەڵەك کوردم و ڕەسەنایەتی باب و باپیریشم دەگەڕێتەوە بۆ شاری (دیاربەکر)ی کوردستانی تورکیا، بەڵام لەکۆنەوە کۆچیان کردووە بۆ میسر، ساڵی (١٩٧١) لەبەشی عەرەبی ڕادیۆی BBC لەلەندەن قورئانی پیرۆزی تۆمارکردووە، لەژیانیدا چەندین خەڵاتی گەورەی پێبەخشراوە، لە٣٠ی تشرینی دووەمی (١٩٨٨) بەنەخۆشی کۆچی دوایی کردووە، جێی ئاماژەیە ئێستا یەکێك لەکوڕەکانی بەناوی (تاریق) قورئان خوێنە.

# مانگی کانوونی یەکەم (دیسەمبەر)

## * ١٢/١

- ڕۆژی جیهانی ئەیدز[١].
- ١٩٣٩ دەرچوونی گۆڤاری (گەلاوێژ) لەسلێمانی.

## * ١٢/٢

- ١٩٧٥ کۆچی دوایی مامۆستا محەمەد تۆفیق (وردی)[٢].

---

[١] - ئەیدز (AIDS) کورتکراوەی ڕستەی (Acquired immuno deficiency syndromc) بەواتای (کۆنیشانەی دەرکەوتوو بەهۆی دابەزینی بەرگری لەشەوە)، بەشێوەیەکی گشتی ئایدز بریتیە لە: کۆبوونەوەی کۆمەڵێك نیشانە لەگەڵ هەوکردنی جیاواز لەمرۆڤدا کە ئەبێتە هۆی زیانگەیاندن بەسیستەمی بەرگری بەهۆی تووشبوونی بەڤایرۆسی (HIV)، لەدوا قۆناغی نەخۆشیەکەدا هەلی تووشبوونی کەسەکە بۆ تووشبوون بەهەوکردن و شێرپەنجە جیاوازەکان بەهێز دەبێت، لەهاوینی ساڵی (١٩٨١) بۆ یەکەمجار نەخۆشی ئایدز دۆزرایەوە، ساڵی (١٩٨١) یەك حاڵەت لەشاری سلێمانی تۆمارکرا، یەکەم منداڵی کورد لەساڵی (١٩٨٧) پاش گواستنەوەی خوێن بۆی دووچاری ڤایرۆسی (HIV) بوو، ساڵی (١٩٨٨) نەخۆشی ئەیدز وەك گرفتێکی جیهانی ئاماژەی پێدرا، ڕۆژانە (١٦)هەزار حاڵەتی نوێی تووشبوو بەم نەخۆشیە تۆماردەکرێن (کەزۆربەیان گەنجی تازە پێگەیشتوون)، وەتەنها لەساڵی (٢٠٠٣)دا پێنج ملیۆن کەس بەم نەخۆشیە مردوون، هەروەها لەئەفریقا ڕۆژانە پێنج هەزار ئافرەت و پیاو، لەگەڵ هەزار منداڵ بەم نەخۆشیە دەمرن!

ڕێگەکەکانی تووشبوون بە نەخۆشیەکە بریتین لە: (ڕێگای زایەندی و سێکسی، ڕێگای گواستنەوەی خوێن و بەرهەمەکانی، ڕێگای بەکارهێنانی دەرزی و پێکهاتووە تیژەکانی تر، ڕێگای دایك بۆ کۆرپە، ڕێگای چاندنی ئەندامە جیاوازەکانی لەش).

[٢] - محەمەد تۆفیق وردی، لەساڵی (١٩٢٢) لەکۆیە لەدایك بووە، خوێندنی لەئامۆژگای مامۆستایانی کۆیە تەواو کردووە، ساڵی (١٩٤٤) بووە بەمامۆستا، (ووردی) زیاتر وەك کەلەپورناسێك ناسراوە، ڕۆڵێکی دیاری بینیوە لە پەرەپێدان و پێشخستنی سامانی ئەدەبی

## * ١٢/٣

- ڕۆژی جیهانی کەم ئەندامان.
- ١٧٧٦ دامەزراندنی (زانکۆی ئەمریکی) لەبەیروت.
- ١٩٩٠ (بوترس غالی) بوو بەئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان.

## * ١٢/٤

- ١٦٧٩ کۆچی دوایی زانای بەریتانی (تۆماس هۆبز)[١].

---

فۆلکلۆری کوردیدا، گەلێ دەقی ئەدەبی فۆلکلۆری لەفەوتان ڕزگارکردو بەچاپی گەیاندن، لەوانە: (حەسەن و مەریەم، خانزادو لەشکر، ناسرو مارمار، مامەیارە قارەمانێکی بەناوبانگی کورد، قەڵای دمدم، فۆلکلۆری بەشی یەکەم و دووەم و سێیەم، بەیتەکانی عەلی بەردەشانی) هەروەها چەند بەرهەمێکیش هەر لەم بوارەدا بەزمانی عەرەبی، کە ژمارەی بەرهەمەکانی نزیکەی (٤٦) بەرهەمی هەمەڕەنگە.

[١] - (تۆماس هۆبز)، ساڵی ١٥٨٨ لەبەریتانیا لەدایکبووە، لەتەمەنی پانزە ساڵیدا چۆتە زانکۆی ئۆکسفۆردو لەوێ لۆژیك و سروشتی خوێند، هۆبز بۆی دەرکەوت کەگۆڕانی جووڵە دەبێتە هۆ بۆ هەموو شتەکان، لەوکاتەوە کێشەی جووڵە هۆبزی سەرقاڵ کردووە، وەهەموو پەرۆشیەکی بۆ ئەوەبوو کە تیۆرێکی فەلسەفی وا دابڕێژێ کەتێیدا دەری بخات ئەوی لەبووندایە لەدۆخی جووڵەدایە، ساڵی (١٦٣٤) هەلی ناسینی (گالیلۆ)ی بۆ ڕەخسا، هەندێك دەڵێن: گالیلۆ ڕایسپاردووە کەمیتۆدی ئەندازەیی، یان ڕێگەی هەڵهێنجان لەزانستی ئاکاردا بگرێتەبەر، ساڵی (١٦٤٠) کتێبێکی بچووکی بەناونیشانی (پرەنسیبی یاسای ئەخلاق و سیاسەت)ەوە دەرکرد، ساڵی (١٦٥١) لەکتێبێکی تازەدا بەناوی (ئەژدیها) جەختی لەوە کردەوە کە پێویستە کەنیسە ملکەچی دەوڵەت بێت، وە کەوتە ڕاڤەکردنی کۆمەڵگەی سیاسی و دینی، بەهۆی بیروڕاکانیەوە دەربارەی فەلسەفە لەزانکۆی پاشایەتی دەرکراو بڕیاردرا چیتر نابێ لەسەر ئاکارو مرۆڤ بنوسێت، بۆیە بەناچاری گەڕایەوە سەر ئەدەب و مێژوو، وە لەو ماوەیەدا یاداشتەکانی خۆی نووسیەوە، تا لەتەمەنی (٩١) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

**- ١٩٩٦ كۆچی دوایی مامۆستا (مەلا محەمەدی ڕەبیعی)[1].**

**- ٢٠٠٥ دادگای لاهای نێودەوڵەتی (١٥) ساڵ زیندانی سەپاند بەسەر (فرانز ڤان ئەنراد)ی هۆڵەندی بەهۆی فرۆشتنی چەکی کیمیایی بەحکومەتی ڕووخاوی عێراقی.**

## * ١٢/٥

**- ١٦٠٨ شەڕی بەناوبانگی قەڵای دمدم.**

**- ١٧٩١ کۆچی دوایی مۆسیقاری بەناوبانگی نەمسایی (مۆزارت).**

---

[1] - مەلا محەمەد مەلا عەبدولکەریم، ساڵی (١٩٣٢) لەگوندی (دەرێن)ی سەر بەشاری (دیواندەرە) لەبنەماڵەیەکی ئاین پەروەر لەدایکبووە، لەتەمەنی (٥) ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندن و بۆ ئەو مەبەستە زۆر شوێن گەڕاوە، لەچەندین شاری گەورەی وەکو کرماشان و سنەو تاران ڕۆڵی گەورەی بینیوە، ساڵی (١٩٦٦) لەبەشی کوردی ڕادیۆی تاران چەندین بەرنامەو تەواشیحی پێشکەش کردووە، ساڵی (١٩٧٨) لەسەر داوای خەڵکی کرمانشان دەچێتە ئەو شارەو لەمزگەوتی ئیمامی شافیعی دادەمەزرێت، ساڵی (١٩٨١) کراوە بە بەرپرسی بەرنامە کوردیەکانی بەشی کوردی ڕادیۆی کرمانشان، مامۆستا محەمەدی ڕەبیعی زانایەکی هەڵکەوتوو و بەهرەمەند بووە، (٣٠) ساڵی تەمەنی لەبواری نووسیندا تەرخان کردبوو، وەنزیکەی (٤٠) کتێبی نووسیوە، لەوانە: (گەنجینەی گەوهەر- (الباقیات الصالحات) بەزمانی فارسی- وەرگێڕانی کتێبی (الحلال والحرام فى الاسلام)- قصص القران- بەزمی مەتەڵ بەکوردی و عەرەبی و فارسی- مەعالیمی ئیسلام- (مالکیت در الاسلام) بەزمانی فارسی- عالی جەناب (تەنزی سیاسی)- ڕۆمانی لۆریل- داستانی نوقڵ و نەبات- ڕۆمانی (جمعەسیا)- حەزرەتی عوسمان- ئەخلاق و ژیانی ژن و مێردایەتی- هەزار پەند بەناوی کورەکانم- ٢٠٠٠ بەیت شیعری کوردی- ١٠٠٠ شیعری فارسی)، هەروەها نامیلکەی (القارعە، حق الیقین، علم الیقین، جەلای ئاوێنە)، لەبەرواری ١٩٩٦/١٢/٤ لەشاری کرمانشان شەهیدکراوە.

**– ١٩٧٣ کۆچی دوایی (ڕۆبێرت واتسۆن وات) یەکەم داهێنەری ڕاداری پڕاکتیزەیی.**

**– ١٩٩٩ هەڵبژاردنەکانی نوێنەرایەتی قوتابیان و خوێندکاران لەزانکۆو پەیمانگاکانی هەرێمی کوردستاندا دەستی پێکرد.**

## * ١٢/٦

**– ١٨٩٢ کۆچی دوایی (ڤێرنەر فۆن سیمنس) داهێنەری شەمەندەفەری کارەبایی[1].**

**– ١٩١٧ سەربەخۆیی (فنلەندە) لەڕوسیا.**

**– ١٩٢١ سەربەخۆیی (ئیرلەندە) لەبەریتانیا.**

**– ١٩٤٣ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (ستێر) لەشام.**

**– ١٩٤٥ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (کوردستان) لەمەهاباد.**

**– ١٩٤٧ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان).**

**– ٢٠٠٥ سوتان و تالانکردنی بارەگاکانی (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان) لەبادینان.**

**– ٢٠٠٥ تیرۆرکردنی (م. موشیر ئەحمەد) ئەندامی مەکتەبی سیاسی (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان).**

**– ٢٠٠٦ ڕاگەیاندنی ڕاپۆرتی گروپی لێکۆڵینەوەی عێراق، ناسراو بە (ڕاپۆرتی بیکەر – هاملتۆن).**

---

[1] – سیمنس لە ١٢ی کانوونی یەکەمی (١٨١٦) لەهانۆڤەری ئەڵمانیا لەدایکبووە، داهێنەرێکی بەتوانایەو وەك ئەندازیارێکی کارەبایی کاری کردووە، سیمنس بەداهێنەری تەلەگرافی پیشەسازی و شەمەندەفەری کارەبایی دادەنرێت، ساڵی (١٨٤٧) کۆمپانیای سیمنسی تەلەگرافی دامەزراند، ساڵی (١٨٨٢) شەمەندەفەری کارەبایی داهێناو لەساڵی (١٨٨٦)یشدا توانی داینەمۆی کارەبایی دابهێنێت، لەکانوونی یەکەمی (١٨٩٢) کۆچی دوایی کردووەو یەکەی پێوانەی گەیاندنی کارەبا بەناوی ئەوەوە ناونرا (سیمنس).

## * ١٢/٧

- ١٩٣٤ كۆچی دوایی مەلا ئەحمەدی گەورەی ڕۆژ بەیانی.
- ١٩٨٦ کۆچی دوایی شاعیر (کامەران موکری) لەهەولێر.

## * ١٢/٨

- ١٩٤٨ بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی برایانی موسڵمان (إخوان المسلمین) لەمیسر.

## * ١٢/٩

- ڕۆژی جیهانی بەگژاچوونەوەی گەندەڵی.
- ١٩٤٤ کۆچی دوایی شاعیری کورد (صابری)[١].
- ١٩٦٣ کۆچی دوایی زاناو شاعیر (مەلا مستەفای سەفوەت)[٢].
- ١٩٦٣ کۆچی دوایی مەقام بێژی کورد (مام سێوە) لەکۆیە.

---

[١] – صابری ناوی (شێخ نەجمەدین کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان بەرزنجی)یە، ساڵی (١٨٨١) لەدایك بووە، کەسایەتیەکی ناودارو خواناس بووەو زۆر شارەزاو زیرەك بووە، بێجگە لەزمانی کوردی زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی بەباشی زانیوە، ماوەیەك بەکاری کشتوکاڵەوە خەریك بووەو ماوەیەکیش شێخایەتی و ئیمامەتی بۆ گوندەکەیان کردووە، لەکانوونی یەکەمی (١٩٤٤) کۆچی دوایی کردووەو لەگەڕەکی شۆریجەی کەرکوك بەخاك سپێرراوە.

[٢] – سەفوەت، ناوی مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسوڵی دێلێژەیە، ساڵی (١٩٠٦) لەگەڕەکی دەرگەزێنی شاری سلێمانی لەدایك بووە، بەفەقێیەتی زۆر شوێن گەڕاوەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ساڵی (١٩٤٣) بەمەبەستی چارەسەرکردن دەچێتە لوبنان و پاش ماوەیەك دەگەڕێتەوە، سەفوەت جگە لەوەی کە شاعیر بووە، لەبوارەکانی تەفسیرو مێژوو و وەرگێڕان و چەند بوارێکی تر دەستی باڵای هەبووە، لەبەرهەمەکانی: (وەرگێڕانی گوڵستانی سەعدی شیرازی، تەفسیری قورئان، مێژووی بەرزنجە).

## * ١٢/١٠

- ڕۆژی جیهانی مافی مرۆڤ.
- ١٦٢٤ کۆچی دوایی نوێخوازی هەزارەی دووەم (ئیمامی ڕەببانی - سەرهەندی).
- ١٨٩٦ کۆچی دوایی دۆزەرەوەی بارود (نۆبڵ).
- ١٩٠١ بۆ یەکەم جار خەڵاتی (نۆبڵ) دابەشکرا.
- ١٩٤٨ ڕاگەیاندنی (جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ).
- ١٩٧٠ دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (ژین).
- ١٩٩١ دامەزراندنی (ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لەکوردستان).

## * ١٢/١١

- ١٩٥٢ دامەزراندنی (یەکێتی ئافرەتانی کوردستان).
- ١٩٨٣ کۆچی دوایی شاعیر مەلا شێخ حسێنی هەولێری (فانی)[١].

---

[١] - زۆر لەشاعیران نازناوی (فانی)یان بۆخۆیان هەڵبژاردووە، لەوانە (حامید ئاغای فانی)و زۆری تریش، بەڵام (مەلا حسەین) نازناوی (فانی) لەکۆنەوە بۆخۆی هەڵبژاردووەتا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد، تەنانەت مۆرێکیشی هەڵکەندبوو بەناوی (حسێنی فانی)، تەنیا لەیەك هۆنراوەدا بەوشەی (کاکە) دوایی پێهێناوە، بۆیە مامۆستا (گیوی موکریانی) لەیەکێك لەژمارەکانی گۆڤاری (هەتاو)دا باسی نازناوی کۆن و نوێی شاعیرانی کردووەو وتوویەتی (فانی) مەبەست لە (مەلاحسێنی سەغدی) بووە.

(فانی) لەساڵی (١٨٨٣) لەگەڕەکی خانەقای شاری هەولێر لەدایك بووە، ئیجازەی مەلایەتی لەلای (مەلا ئەبوبەکر عومەر) ناسراو بە (مەلا کچکە) لەهەولێر وەرگرتووە، دانراوەکانی: (ژیانی ئینسان و تەفسیری قورئان (شەش بەرگ)، وەرگێڕانی صەحیحی بوخاری بۆ کوردی، کتێبی بەلاغەت بەعەرەبی، وەرگێڕانی (جامع الصغیر) بۆ کوردی، نەظمی (تهذیب المنطق)ی تەفتازانی بەعەرەبی، (منهج الحقیقة) لەتەسەوفدا بەعەرەبی، شەرحی (ذات الشفا) بە کوردی، شەرحی (لوائح) لەفارسی بۆ عەرەبی، وەرگێڕانی (شەرحی لەمەعات) لەفارسی بۆ

## * ١٢/١٢

- ١٩٦٣ سەربەخۆیی (کینیا) لەبەریتانیا.
- ١٩٨٥ دامەزراندنی (حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان).
- ٢٠٠٤ کۆچی دوایی پرۆفیسۆر (د.کەمال خۆشناو) سەرۆکی زانکۆی سلێمانی لەئەمریکا.
- ٢٠٠٦ کۆچی دوایی (جۆزیف باربێرا) داهێنەری کارتۆنی (تۆم و جیری)[١].

---

عەرەبی، دیوانی هۆنراوەکانی بەکوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی، کاتی خۆی ئەم دیوانەی بە ئەمانەت داوە بە (سالح زەکی بەگ) کە ئەوکاتە موتەسەرپیفی هەولێر بووە بەلام نەی داوەتەوە، دانانی دیوانێک بەعەرەبی بەناونیشانی (المنظوم في العقود)، وەرگێڕانی قەصیدەی (بوردیە) بۆ کوردی، وەرگێڕانی چوارینەکانی (خەیام) لەفارسی بۆ عەرەبی)، ساڵی ١٩٤٧ لەگوندی (دوو گردکان)ەوە هاتۆتەوە بۆ هەولێرو لەیەکێك لەمزگەوتەکانی شاری هەولێر بۆتە پێش نوێژ، لەتەمەنی (١٠٠) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

فانی ئەم هۆنراوەیەی لەساڵی (١٩٤٢) لەجەنگی جیهانی دووەمدا نووسیوە:

وەرن رێك كەوین ئەی کوردی هەژار
بێ ترس بەردێك بۆ گەل چەند هەزار
لەپاش صەلاح و مظفرالدین
تاکەی زەبوون بین ژێردەستی ئەغیار.

[١] - بێگومان هەموومان کارتۆنی (تۆم و جیری) یان (مشك و پشیلە)مان بینیوە، ساڵی (١٩٥٧) (جۆزیف باربێرا)ی هونەرمەندی وێنەکێش لەگەڵ (ولیام هانا) کۆمپانیای (هێنە- باربێرا)ی بۆ فیلمی کارتۆنی دامەزراند، (هانا) کاری دەرهێنانی دەکردو (باربیرا)ش وێنەکێشی بۆ فیلمەکان دەکردو توانیان حەوت خەڵاتی ئۆسکار بەدەست بهێنن و (٣٠٠) فیلمی کارتۆنی بەرهەم بهێنن، باربیرا، لەبەرواری ٢٠٠٦/١٢/١٢و پێنج ساڵ دوای مەرگی هانای هاوڕێی لەتەمەنی (٩٥) ساڵیدا لەویلایەتی کالیفۆرنیای ئەمریکا کۆچی دوایی کرد.

## ١٢/١٣ *

- ١٩٤٤ كۆچی دوایی (ساڵح بەگی ساحێبقڕان).
- ١٩٤٩ دامەزراندنی ڕێکخراوی (یونسێف).
- ١٩٨٤ کۆچی دوایی ئەدیبی کورد (عەلائەدین سوجادی) لەبەغداد[1].
- ١٩٩٩ کۆچی دوایی عەقید بەکر عەبدوڵا حەوێزی.
- ٢٠٠٣ دەستگیرکردنی دیکتاتۆر (سەدام حسێن) سەرۆك کۆماری پێشووی عێراق.

## ١٢/١٤ *

- ١٩١٤ لەسێدارەدانی (شێخ عەبدولسەلامی بارزانی)و هاوەڵەکانی لەموسڵ.
- ١٩٩٦ (کوفی ئەننان) بوو بەئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان.
- ٢٠٠٣ ڕاگەیاندنی دەستگیرکردنی (سەدام حسێن).

---

[1] – عەلائەدین سوجادی کوڕی نەجمەدین عیصامەدینە، ساڵی (١٩٠٧) لەدایکبووە، لەسلێمانی خوێندنی شەرعی لەلای (شێخ باباعەلی تەکیەو ئەمجەد زەهاوی و شێخ محەمەد قزڵجی) خوێندووەو لەبەغداد بووە بەپێش نوێژ، لەساڵی (١٩٣٩)وە چۆتە بواری ڕۆژنامەگەریەوە، لە (١٩٤١) بووە بەبەڕێوەبەری گۆڤاری (گەلاوێژ) لە (١٩٤٨) گۆڤاری (نزار)ی بەکوردی و عەرەبی دەرکردووە، لەدوای شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ بووە بە مامۆستای ئەدەبی کوردی لەکۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغداد تا ساڵی (١٩٧٤)، ئەندامی (یانەی سەرکەوتنی کوردان) بووە لەبەغداد، بۆماوەی (٣) ساڵ ئەمینداری گشتی ئەوقاف بووە، یەکێك بووە لەئەندامانی (کۆڕی زانیاری کورد)، جگە لەو نووسینانەی کە لەڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە، زیاتر لە (٢٠) کتێبی بەنرخی لە لەبواری زمان و مێژوو و ئەدەب و کۆمەڵایەتی و فۆلکلۆردا نووسیوە، لەوانە: (مێژووی ئەدەبی کوردی ١٩٥٢)، (ڕشتەی مرواری ١٠ بەرگ)، (شۆڕشەکانی کوردو کۆماری عێراق)، (ڕەوانبێژی).

## * ١٢/١٥

- ١٨٩٠ كۆچی دوایی زانای گەورە (محەمەد فەیزی زەهاوی) ناسراو بە (موفتی زەهاوی) لەبەغداد.
- ١٩٥٧ کۆچی دوایی (مەلا سەید حەکیمی خانەقین)[1].
- ١٩٦٦ کۆچی دوایی (واڵت دیزنی) داهێنەری کارتۆنی میکی ماوس.
- ١٩٩٨ کۆچی دوایی مێژوونووس (مامۆستا زوبێر بیلال)[2].

---

[1] – مەلا سەید حەکیم سەید محەمەد عەبدولڕەحمان، ساڵی (١٨٩٢) لەگوندی (هوویە)ی کوردستانی ئێران لەدایکبووە، ساڵی (١٩٣٦) بووە بە مامۆستا مزگەوتی گەورەی مەحمود پاشای جاف لە (قزرابات) دوای ئەوە چۆتە مزگەوتی (خەزوری) لەخانەقین و لەچلەکانیشدا چۆتە مزگەوتی (حسەین پاشا) لەحەیدەرخانە، ساڵی (١٩٣٧) پەیوەندی بە (کۆمەڵەی هیوا)وە کردووە، پاش ئەوەی لەدەست حکومەتی عێراقی ڕادەکات دەچێتە لای (شێخ مەحمود) لەگوندی (داری کەلی)، پاش هەڵوەشانەوەی (کۆمەڵەی هیوا) مەلا سەید حەکیم پەیوەندی کردووە بە (حیزبی ڕزگاری کورد)ەوە، لەدامەزراندنی (پارتی دیموکراتی کورد) لە ١٦ی ئابی (١٩٤٦)دا یەکێك بووە لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری ئەم پارتە نوێیەو لەکۆنگرەی دامەزراندندا بووەتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، لە ١٩٥٧/١٢/١٥ کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی (پاشا کۆپری) لەشاری خانەقین بەخاك سپێردراوە.

[2] – (زوبێر بیلال ئیسماعیل) لەساڵی (١٩٣٨) لەشاری هەولێر لەدایکبووە، هەر لەهەولێر خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی تەواوکردووە، پاشان بەشی (الاثار والحضارة)ی لە کۆلیژی ئاداب لەبەغداد تەواوکردووە، پاشان دەبێتە مامۆستا لەناوەندی شەقڵاوە، ساڵی ١٩٧١ دەگوێزرێتەوە بۆ پەیمانگای مامۆستایانی هەولێر، ساڵی (١٩٨٥) خانەنشین دەکرێت، هەتا ١٩٧٩/٦/٥ (١٧٠) لێکۆڵینەوەی لەسەر مێژووی کوردو شاری هەولێر بڵاوکردۆتەوە، جگە لەدەیان بابەت و لێکۆڵینەوەی تر لەگۆڤارو ڕۆژنامەکاندا، هەروەها (٨) دەستنووسی ئامادەی هەیە، لەبەرهەمە بڵاوکراوەکانی:
أربيل في أدوارها التأريخية (١٩٧١) – تأريخ اللغة الكردية (١٩٧٧) – إبن خلكان (١٩٧٩) – علماء ومدارس في أربيل (١٩٨٤) – الشيخ چولی (١٩٨٩).

**- ٢٠٠٥ هەڵبـژاردنی کۆمـەڵی نیـشتمانی عێـراق (الجمعیـة الوطنیـة العراقیة) ئەنجامدرا.**

## * ١٢/١٦

**- ١٩٥٠ بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەی (هەولێر) .**

**- ١٩٩١ سەربەخۆیی (کازاخستان) لەیەکێتی مامۆستایان.**

## * ١٢/١٧

**- ١٩٤٦ ڕووخانی (کۆماری مەهاباد) لەلایەن شای ئێرانەوە[1].**

**- ١٩٦٩ کۆچی دوایی (دکتۆر مستەفا جەواد).**

**- ١٩٨٦ کۆچی دوایی هونەرمەند (محەمەد عارف جەزراوی) لەدهۆك.**

---

[1] - ڕووخانی حکومەتی کوردستان لەمەهاباد پەیوەسـتە بـەو ڕێکەوتنـەی کەلـەنێوان شـای ئێران و یـەکێتی سـۆڤیەتدا هـەبوو، کـەئێران بـەڵێنی بەخـشینی بـیرە نەوتـەکانی بـاکووری بەڕووسیا دابوو لەبەرامبەردا ڕووسیا پشت لەکورد بکات، لـەدوای ئـەم ڕێکەوتنـە بـارودۆخی کوردستان شڵەژاو خەڵکی بێ هیوابوون، قازیْ خەڵکەکـەی لەمزگـەوتی (نـەهری) لەمـەهاباد کۆکردەوەو وتی: من سوێندم خواردووە کەمیللەتی خۆم بەجێ ناهێڵم، هەروەك عـەلی قـازی کوڕی پێشەوا دەڵێ: دایکم بۆی گێڕامەوەو وتی: قازی لیباسی مەلایەتی لەبـەردابوو، چـووم جلەکەیم گرت و وتم: قازی ڕەحم بەخۆت ناکـەیت ڕەحـم بـە (٨) منداڵەکـەت بکـە، (چـونکە لەزۆر لاوە هاتن داوایان لێکرد بابم بچێتە لایان، لەوانە دەوڵەتی شورەوی و بەریتانیا) بـەڵام قازی وتبووی: منداڵی من لەمنداڵی خەڵکی زیاتر نیە، کەمن دەزانم دەمکوژن بـەڵام خـەڵك و میللـەتی خـۆم بـەجێ نـاهێڵم، هەربۆیـە لـە ١٩٤٦/١٢/١٧ هێزەکـانی شـا دێنـە نـاو خـاکی مـەهابادەوەو داگـیری دەکـەن و، کۆتـایی بـەکۆماری کوردسـتان دەهێـنن و لـەڕۆژی ١٩٤٧/١/٢٣یشدا (دادگای بەری حمرای) حوکمی لەسێدارەدانی دەرکرد بۆ (قازی محەمـەدو سەدری قازی برای و سەیفی قازی ئـامۆزای)، وە لـەڕۆژی ١٩٤٧/٣/٣١ لەمەیدانی چوارچـرا لەمەهاباد حوکمەکە جێبەجێکراو قازی و هاوەڵەکانی لەسێدارەدران.

## * ١٢/١٨

- ١٩٤٨ كۆچی دوایی شاعیری كورد (فایەق بێ كەس)[١].

## * ١٢/١٩

- ١٩٦٢ جەنەڕاڵ (دیگۆڵ) بوو بەسەرۆكی فەڕەنسا.

## * ١٢/٢٠

- ١٩٥٨ كۆچی دوایی شاعیر (شێخ نوری شێخ ساڵح)[٢].

---

[١] – فایەق بێ كەس، ناوی (فایەق عەبدوڵڵای كاكەحەمەی ئیلیاس قۆچە)یە، ساڵی (١٩٠٥) لەگوندی (سیتەك)ی سەر بەپارێزگای سلێمانی لەدایكبووە، لەسلێمانی چۆتە خوێندن و پاشان لە كەركوك چوەتە (مەكتەبی عیلمیە)، ساڵی (١٩٢٥) چۆتە بەغدادو لەفەرمانگەی ئەشغال دامەزراوە، ساڵی (١٩٢٨) بووە بەمامۆستا لەقوتابخانەی زانستی، لەڕۆژی شەشی ئەیلولی (١٩٣٠) لەبەردەركی سەرای سلێمانی برینـدار بـووەو لەكارەكەی دوورخراوەتـەوەو زیندانی كراوە، لەزینداندا ئەم شیعرەی نووسیوە:

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیركەوتەوە
وەختی بەندی و ئەسارەت پێ بەتەوق و كەوتەوە
من لـەزیـكرو فـكری خـافڵ نـەبـووم وا تێ نـەگەی
حەپس و تێ هەڵدان و زیللەت تۆی لەبیر بردۆتەوە
لافـی میـللەت بـەدەم لـەم عـەسرەدا كـەڵكی نـیە
ڕۆژی هەوڵە هەر بەهیممەت گۆی هونەر ئەكرێتەوە

بێ كەس كوڕێك و دوو كچی هەیە، كوڕەكەی شاعیرەو ناسراوە بە (شێركۆ بێ كەس).

[٢] – شێخ نوری شێخ ساڵح، كوڕی شێخ غەنی شێخ عەبدولقادر سەید حوسێنی بەرزنجییـە، لە(١٣١٥)ی كۆچی لەسلێمانی لەدایكبووە، لەحوجرە خوێندوویـەتی و بـەهرە ئەدەبیەكـەی هـەر لەمنداڵیـەوە سـەری هەڵـداوە، هەرچـەندە هـاوڕێی (عەبـدوڵڵا گـۆران) بـووە، بـەڵام لەدەركـەوتن و بڵاوكردنـەوەدا پـێش گـۆران كـەوتووە، لەزۆربـەی بابەتەكانـدا نووسـیویەتی بەتایبەتی ڕۆمانسی و كۆمەڵایەتی و سەربازی و سیاسی.

– ١٩٨٥ کۆچی دوایی شاعیر (سامی عەودالّ) لەکۆیە.

## * ١٢/٢١

– ١٩٤٥ (عێراق) بوو بەئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

## – ١٢/٢٢

– ١٩٣٠ کوژرانی سمایل خانی شکاك (سمکۆ).

– ١٩٧٨ کۆچی دوایی قورئان خوێن (شێخ مستەفا ئیسماعیل).

– ١٩٩٠ سەربەخۆیی (میکرۆنزی) لەئەمریکا.

– ١٩٩٧ کۆچی دوایی خاتوو (عیصمەت نوری باباعەلی) ناسراو بە (دایە عیصمەت) لەسلێمانی.

– ٢٠٠١ (حامد کارزای) بوو بەسەرۆکی ئەفغانستان.

## * ١٢/٢٣

– ١٩٧٦ کۆچی دوایی نووسەر مامۆستا (عەبدولعەزیز پارەزانی)[١].

---

[١] – شێخ عەبدولعەزیز کوڕی شێخ ئەمین شێخ ئەحمەد پارەزانیە، ساڵی (١٩٢٨) لەگوندی (پارەزان) سەر بەناحیەی بەرزنجەی پارێزگای سلێمانی لەدایکبووە، هەر لەمنداڵیەوە باوکی ناردویەتی بۆ خوێندنی حوجرەو پاشان دەچێتە دێی (دۆڵپەمو)ی نزیك پارەزان، دواتر دەچێتە هەڵەبجەو لەمزگەوتی (مەلا ساڵح) لەگەڕەکی (کانی عاشقان) لەخزمەت مامۆستا گەورەکانی وەك (مامۆستا مەلا ساڵحی گەورەو مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز)دا تاساڵی (١٩٥٢) خوێندنی فەقێیەتی تەواو دەکات و ئیجازەی مەلایەتی لەسەر دەستی مامۆستا مەلا ساڵحدا وەردەگرێت، پاشان لەگوندی (تەپی سەفا) دەبێتە پێش نوێژو هەر لەوێ مەدرەسەیەکی شەرعی دەکاتەوە، کەیەکێك لەقوتابیەکانی (مامۆستا عومەر ڕێشاوی) دەبێت، ساڵی (١٩٥٤) ژنی هێناوە کە (خاتوو نەجیبە)ی کچی مامۆستا مەلا عومەر عەبدولعەزیز بووە، لەسەرەتای پەنجاکانەوە کاتێك کە (محەمەد مەحمود صەواف)و چەند کەسێکی تر دێنە هەڵەبجەو بیری (ئیخوان) بڵاودەکەنەوە، مامۆستا پارەزانی یەکێك بوو

- ٢٠٠١ کردنەوەی (سەنتەری گەشەپێدانی چالاکی لاوان) لەسلێمانی.

## * ١٢/٢٤

- ١٩٥١ سەربەخۆیی (لیبیا) لە ئیتاڵیا.
- ١٩٧٠ کۆچی دوایی (حاجی برایمی چەرمەگا) لەبەغداد.
- ١٩٩٥ لەهەڵبـژاردنی پەرلـەمانی تورکیـا، (پـارتی ڕەفـاهی ئیـسلامی) بەرێژەی (٢١٪) زۆرینەی دەنگەکانی بەدەست هێنا.

## * ١٢/٢٥

- ١٧٢٧ لەدایکبوونی (ئیسحاق نیوتن).
- ١٩٢١ لەدایك بوونی نووسەر (د. مستەفا مەحمود)[١].

---

لەوانـەی کەبـەردەوام لەهـەموو گەشـتەکانیاندا بـۆ ناوچـە جیاجیاکـان لەگەڵیانـدا دەبێـت و دەبێتە یەکێك لەچالاکەکانی کۆمەڵی برایان لەناوچەکەدا، دوای شۆڕشی چواردەی تـەمووزو گۆڕانی باری ناوچەکە مامۆستا لەسـاڵی (١٩٥٩) دێـت بـۆ سـلێمانی و دەبێـت بـەپێش نوێـژ لەمزگـەوتی (سـەید حەسـەن) لەگـەڕەکی سـابونکەران، هـەر لەوسـاڵەدا دەچـێتە خـولی پەروەردەو بەپلەی دووەم دەردەچێت بـۆ مامۆسـتای سـەرەتایی، لـەکۆتایی شەسـتەکاندا مامۆستا بووە لەقوتابخانـەی سـالم لەگـەڕەکی کـانی عاشقانی هەڵەبجەو کاردەکاتـە سـەر مامۆستایان و گەنجانی گەڕەك و شارو لەخۆی کۆدەکردنەوە، مامۆسـتا پـارەزانی لەشـەوی پێنج شەممەی ٢٢\١٩٧٦/١٢/٢٣ لەتەمەنی ٤٨ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

لەبەرهەمـەکانی پـارەزانی: (نمونەیـەك لەئیـسلام ١٩٦٨– پێـنج پایـەکانی ئیـسلام ١٩٦٩– لـەدەروازەی ئیـسلامەوە ١٩٧٣– ژیـانی پێغەمبـەری مـەزن ١٩٧٣– خێزانـی بـەختیارو کۆمەڵی کامەران ١٩٧٥– پاشکۆی ژیـان ١٩٧٩– کـوڕێکی لاسـارو بـاوکێکی هـەژار ١٩٩٣– ئیشکردن نەك تەمەڵی ٢٠٠٧– ئیسلام بەرنامەی ژیانە (دەستنووس)).

[١] – د. مستەفا مەحمود، یەکێکـە لـەو نووسـەرانەی کـە لەسـەرەتای ژیانیـدا هێرشـی زۆری کردۆتە سەر ئیسلام و بیروباوەڕی موسڵمانان و لەیەکـەم کتێبیـدا بـەناوی (الله والأنـسان) گاڵتەی بەئایین کردووەو، بوونی خواو غـەیبی ڕەتکردۆتـەوە، بـەڵام دواتـر پـاش گەشـتێکی

- ١٩٢٢ کۆچی دوایی نووسەری کورد (جەمال عیرفان).
- ١٩٣٦ کۆچی دوایی (حاجی مستەفا پاشای یامولکی)[١].
- ١٩٦٤ کۆچی دوایی شاعیری ناوداری عێراقی (بەدر شاکر سەیاب)[٢].

---

ئالۆز لەگوماندا گۆڕانێکی گەورە بەسەر بیروباروباوەڕیدا هات و وەکو خۆی دەڵێت: (بۆم دەرکەوت کەزانیاری ناتوانێت هەموو شتێك شیتەڵ بکات...) وەگەشتەکەی بۆ ئیمان لەکتێبێکدا بەناوی (رحلتي من الشك الى الأيمان) دەگێڕێتەوە، کە لەلایەن نووسەری کورد (محەمەد مەلا صالح شارەزووری)ەوە کراوە بەکوردی، نووسەر ناوی تەواوی (مستەفا کەمال مەحمود حسین)ە، لەشارۆچکەی (شبین الطوم)ی وڵاتی میسر لەدایك بووە، لەساڵی (١٩٥٢) زانکۆی لەقاهیرە تەواو کردووەو بووە بە(پزیشك)، ساڵی (١٩٦٠) وازی لەپیشەکەی هێناو بوو بە نووسەر، پاش ئەوەی لەگەشتەکەیدا ئیمانی دۆزیەوە، چەند کتێبێکی بەنرخی نووسی کەناوەڕۆکەکەیان باس لەئیمان و چارەسەری ئیسلامی دەکات، لەوانە: (المستحيل، لغز الموت، لغز الحياة، العنكبوت، الخروج من التابوت، القران محاولة لفهم عصري).

[١] - مستەفا شەوقی کوڕی عەزیز یامولکی، ساڵی (١٨٨٦) لەسلێمانی لەدایك بووە، لەبەغدا خوێندنی ئامادەیی تەواوکردووە، ساڵی (١٨٨٨) لەقوتابخانەی سەربازی و قوتابخانەی ئەرکان بەپلەی (سەرۆك ڕوکن) دەرچووە، گەلێ پلەی جۆراوجۆری سەربازی لەشوێنی جیاجیای دەوڵەتی عوسمانیدا بینیوە، لەشەڕی بەڵقاندا وەك فەرماندەی هێز بەشداری کردووە، ساڵی (١٩١٤) خانەنشینی کراوە، ساڵی (١٩١٨) وەك ئەندامێکی دادگای عورفی سەربازی دامەزراوە، پاشان بووە بە والیی (بۆرسە)، ساڵی (١٩٢٠) سەرۆکی ئەنجومەنی سەربازی بووە، کە دادگایی ئەتاتورك و هاوەڵانی کردو بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەرکردن، ساڵی ١٩٢١ پاش سەرکەوتنی ئەتاتورك، مستەفا پاشای یامولکی گەڕایەوە بۆ سلێمانی و (کۆمەڵەی کوردستان)ی دامەزراندو ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان)ی دەرکرد، ساڵی (١٩٢٢) بووە بە وەزیری مەعاریف لەحکومەتەی شێخ مەحموددا، لە ١٩٣٦/١٢/٢٥ لەبەغداد کۆچی دوایی کردووە.

[٢] - بەدر شاکر سەیاب، ساڵی (١٩٢٦) لەبەسرە لەدایکبووە، (خانەی باڵای مامۆستایان)ی تەواوکردووەو بووە بە مامۆستا، پاشان بەهۆکاری سیاسیەوە فەسڵ کراوە، ساڵی (١٩٦٤)

- ٢٠٠٧ کۆچی دوایی (مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحمود) ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەی ئیسلامی لە هەڵەبجەی شەهید.

## * ١٢/٢٦

- ١٩١٣ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (بانگی کورد).
- ١٩٣٩ بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەی (ژین) لەسلێمانی.
- ١٩٧٢ کۆچی دوایی سەرۆکی ئەمریکی (هاری ترومان).

## * ١٢/٢٧

- ١٩٧٤ کۆچی دوایی هونەرمەند (فەرید ئەترەش).
- ١٩٩٣ کۆچی دوایی شاعیر (خدر کۆساری)[١].

---

لەنەخۆشخانەی (کوێت) بەنەخۆشی کۆچی دوایی کردووە، لەدیوانەکانی: (أزهار ذابلة، أساطير، حفار القبور، المومس العمياء، الأسلحة والأطفال، أنشودة المطر، المعبد الغريق، إقبال، و ديوان بدر شاكر سياب)

[١] – کۆساری، ناوی (خدر محەمەد)ە، ساڵی (١٩٦٧) لە گوندی (قولە)ی شارۆچکەی ڕانیە لەدایك بووە، بەهۆی سەختی باری ژیانی تا پۆلی یەکەمی ناوەندی خوێندووە، لەکۆتایی ساڵی (١٩٨٧) یەکەم شیعری بەناوی (نیگاری خودان) نووسیوە، ساڵی (١٩٩١) بەشێك لەشیعرەکانی بەناوی (سەدای کۆساری) بەدەنگی خۆی تۆمارکردووە، لەساڵی (١٩٩٣)شدا بەشی دووەمی (سەدای کۆساری) بڵاوکردۆتەوە، ساڵی (١٩٩٢) وەك پێشکەشکاری بەرنامە لەتەلەفزیۆنی بزووتنەوەی ئیسلامی لەڕانیە کاری کردووە، یەکێك لەسیفەتە دەگمەنەکانی کۆساری شاعیر ئەوەبوو کە تەواوی شیعرەکانی خۆی لەبەر بووەو بێ نووسینەوەو لەبەر شیعرەکانی خوێندۆتەوە، لەکۆتایی ساڵی (١٩٩٣)دا لەشەڕی نێوان (بزووتنەوەی ئیسلامی)و (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)دا لەدەڤەری ڕانیە شەهید کراو لەشاری ڕانیە بەخاك سپێردرا.

- ١٩٩٨ یەکەمین کۆنگرەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان - هەولێر.
- ٢٠٠٧ دووەمین کۆنگرەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان لەهەولێر.
- ٢٠٠٧ تیرۆرکردنی (بینەزیر بۆتۆ)ی سەرۆك وەزیرانی پێشووتری پاکستان و سەرۆکی (پارتی گەلی پاکستان)[1].

## * ١٢/٢٨

- ١٩٩٠ سەربەخۆیی وڵاتی (دوورگەکانی مارشاڵ) لەئەمریکا.

## * ١٢/٢٩

- ١٧٧٠ (جۆزیف کۆنیۆ) بۆ یەکەم جار ئۆتۆمبیلی داهێنا.
- ١٩٤٤ کۆچی دوایی شاعیری کورد (شێخ نەجمەدینی صابری).

---

[1] - (بێنەزیر بۆتۆ) لەساڵی (١٩٥٣) لەشاری کراتشی پاکستان لەدایك بووە، باوکی (زولفەقار عەلی بۆتۆ) دامەزرێنەری پارتی گەلی پاکستان بووە، خوێندنی لەزانکۆی (ئۆکسفۆرد) لە بەریتانیا لەبواری فەلسەفەو سیاسەت و ئابووری تەواو کردووە، ساڵی (١٩٧٦) لەتەمەنی (٢٤) ساڵیدا بوو کاتێك باوکی لەلایەن (ضیاء الحق) کودەتای کرد بەسەریداو باوکی خستە زیندان و تاساڵی (١٩٧٩)، کەلەسێدارەیدا، بۆتۆ لەگەڵ دایکیدا لەزینداندا مایەوە تا ساڵی (١٩٨٤)، پاشان دوورخرانەوە بۆ بەریتانیا تا ساڵی (١٩٨٨)، لە ساڵی (١٩٨٨) پارتی گەل سەرکەوتنی بەدەست هێناو بۆتۆ بوو بەسەرۆك وەزیران، پاش دوو ساڵ بەتۆمەتی گەندەڵی لەسەر پۆستەکەی لابراو ڕوویکردە مەنفاو مێردەکەشی (کەجێگری بوو) بۆ ماوەی سێ ساڵ زیندانی کرا، ساڵی (١٩٩٥) بۆ جارێکی تر بووە سەرۆك وەزیرانی پاکستان، ساڵی (١٩٩٦) دایکی و براکەی لە (کراتشی) تیرۆرکران، ساڵی (١٩٩٩) بەناچاری وڵاتی بەجێهێشت و لەنێوان ئینگلتەراو دوبەی ژیانی بەسەر دەبرد، لە ٢٠٠٦/١٠/١٨ گەڕایەوە بۆ پاکستان و لەو ماوەیەشدا چەند جارێك هەوڵی تیرۆرکردنی درا، تا دواجار لە ٢٠٠٧/١٢/٢٧ تیرۆرکرا.

## * ١٢/٣٠

- ١٨٧٢ یەكـەمین یـاری تـۆپی پێـی نێودەوڵـەتی لـەنێوان تیپـی سكۆتلەندەو تیپی ئینگلتەرا ئەنجامدرا.

- ٢٠٠٦ (سەدام حسێن)ی سەرۆكی پێشووتری عێراق لەسێدارەدرا[١].

## * ١٢/٣١

- ١٩٥٢ كۆچی دوایی شاعیر (بەختیار زێوەر)[٢].

---

[١] - سەدام حسێن مەجید، لە ١٩٣٧/٤/٢٨ لەشارۆچكەی تكریت لـەدایكبووە، لەشۆڕشێكدا كە بەشۆڕشی حەڤدەو سی تـەمووز ناسـراوە، لەسـاڵی (١٩٦٨) بەعسیەكان دەسـەڵاتیان گرتە دەست و سەدام بوو بەجێگری سەرۆك كۆمارو لەڕاستەقینەشدا دەسـەڵاتداری یەكـەم لەعێراقدا، لە ١٦ی تـەمووزی (١٩٧٩) لـەدوای (ئەحمـەد حەسـەن بـەكر) بەفـەرمی پۆسـتی سـەرۆك كۆمـاری عێراقـی وەرگرتـووە، سـەدام پیـاوێكی دڵـڕەق و توندوتیـژ بـووەو هـەر لەسەرەتاوە بەلەناوبردنی هاوەڵەكانی خۆی لەناو حیزبی بـەعس دەسـەڵاتی گرتـە دەسـت، ساڵی (١٩٨٠) شەڕێكی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێران هەڵگیرساند، لەسەرەتای دەسـەڵاتیەوە دژایەتی توندی كوردو شۆڕشەكەی كردووەو لەساڵی (١٩٨٨) زیاتر لە (١٨٢) هەزار كـوردی ناوچـە جیاجیاكـانی كوردسـتانی جینۆسـاید كـردووە، كەبەپرۆسـەی (ئـەنفال) نـاوزەدی كردبوو، هەر لەبەهاری ئەو ساڵەدا شاری هەڵەبجەی كیمیاباران كردو زیـاتر لـە پێـنج هـەزار كەسـی شـەهید كـرد، لـە ٢ی ئـابی (١٩٩٠) پـەلاماری (كوێـت)ی داو داگـیری كـرد، لەسـاڵی (١٩٩١)دا بەتوندی ڕاپەڕینی ناوچەكانی باشـوری سـەركوتكردو لەڕاپـەڕینی كوردستانیـشدا هاوڵاتیانی ناچاركرد كـە ئـاوارەی سـنورەكانی ئێـران و توركیـا بـبن، سـەدام حسێن پـاش هێرشی هاوپەیمانەكان بۆسەر عێراق لـە ٢٠٠٣/٣/١٩دا لەبەغـداد هـەڵهات و لـە ٢٠٠٣/١٢/١٣ دەستگیركراو، بەتاوانی كۆمەڵكوژی (١٤٨) عەرەبی شیعەی شارۆچـكەی (دوجێـل) لەسـاڵی (١٩٨٢)دا، لە٢٠٠٦/١٢/٣٠ لەسێدارەدرا.

[٢] - بەختیار زێوەری شاعیر، ناوی ڕاستەقینەی (فایەق)ە، كوڕی شاعیری بەناوبانگی كـورد (زێوەر)ە، ساڵی (١٩٠٨) لەشاری سلێمانی لەدایكبووە، پاشان خوێندنی حوجرەو خوێندنی

**- ١٩٦٩ دامەزراندنی کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی (کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان).**

**- ١٩٩٢ کۆچی دوایی (مامۆستا ئیبراهیم ڕێشاوی).**

**- ١٩٩٩ کۆچی دوایی زانای بەناوبانگ (شێخ ئەبوحەسەنی نەدەوی)[١].**

---

سەرەتایی تەواو کردووەو لەبەغداد خولێکی برین پێچی تازەلانی بینوەو چۆتە سەر ئەو کارە، ساڵی (١٩٤٨) پۆلی سێیەمی ناوەندی تەواوکردووە، لە ١٩٥٢/١٢/٣١ کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی (گردی جۆگە) لەسلێمانی نێژراوە، بەختیار زێوەر لە پارچە شیعرێکدا کە لەساڵی (١٩٤٣)دا نوسیویەتی، بەناونیشانی (ژیانێکی بێ غەم)دا پاش ئەوەی وەسفی ژیانی لادێ دەکات، دەڵێت:

چونکە ژیانی ئێستای شارستان

هەر کەس لێی دووربێ نابینێ زیان

ڕۆژی کاسبی هەر دەس بڕینە

خزم و برایی بۆ ورگە شینە

خوێندن بۆ ناوو مەئموریەتە

نەک بۆ خزمەتی موڵک و میللەتە.

پارەداریش بی ئەبێ مەغرور بی

باشتر ئەوەیە کە لەشار دووربی.

[١] - ئەبولحەسەن، لەساڵی (١٩١٤) لەگوندی (تکیەکلان)ی هیندستان لەدایك بووە، باوکی پزیشکێکی هەڵکەوتوو و مێژوونووسێکی دیاربوو، بە (إبن خلکانی هند) ناسرابوو بەهۆی کتێبی (نزهة الخواطر) کەباسی زانا پایە بەرزەکانی هیندستان دەکات، ئەبو حەسەن لەتەمەنی (١٤) ساڵیدا دەچێتە بەشی عەرەبی لەزانکۆی (لکهنۆ)، کەبچووکترین قوتابی زانکۆکە بوو، لەساڵی (١٩٢٩) پەیوەندی کرد بە (دارالعلوم - ندوة العلماء)و شارەزایی چاکی پەیداکرد لەفەرمودەو تەفسیری قورئاندا، لەساڵی (١٩٣٢) و لەتەمەنی (٢٠) ساڵیدا بوو بە مامۆستای (دارالعلوم - ندوة العلماء) بۆ وتنەوەی تەفسیرو ئەدەب، لەساڵی (١٩٢٩)ەوە کەوتە گەڕان بەبنکە ئایینیەکانی هیندستانداو گەیشت بەخزمەتی زانای گەورە

(عبدالقادر الراى فورى)و چاکسازو بانگخواز (شێخ إلياس الكاندهلوى)، کە ئەم ناسینەش خاڵی وەرچەرخان بوو لەژیانیدا.

لەساڵی (١٩٤٣)دا بنکەیەکی تەعلیماتی ئیسلامی دامەزراند بۆ ڕێکخستنی ئەڵقەکانی وانەی قورئان و سوننەت، وەلەساڵی (١٩٥١) (حرکة رسالة الأنسانية)ی دامەزراند لەنێوان موسڵمان و هیندۆسەکاندا، وە لەساڵی (١٩٥٩)دا (مجمع الاسلامي العلمی) دامەزراند لە دارالعلوم (ندوة العلماء)، وە لەساڵی (١٩٦١)دا بوو بەئەمینداری گشتی (دارالعلوم – ندوة العلماء)، تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد.

لەساڵانی (١٩٦٠–١٩٧٢) لەدامەزراندنی چەند دامەزراوەیەکی زانستی و ئایینیدا بەشداربووە، لەساڵی (١٩٣١)دا (واتە لەتەمەنی ١٧ ساڵیدا) یەکەم وتاری بەعەرەبی لەگۆڤاری (المنار)دا بڵاوبۆوە لەمیسر کە (محەمەد ڕەشید ڕەزا) سەرپەرشتی دەکرد، لەساڵی (١٩٣٧) یەکەم پەڕاوی بەناوی (سيره أحمد شهيد) بەزمانی (ئوردو) بڵاوکردەوە، لەساڵی (١٩٤٠–١٩٤٤)دا زنجیرەی پەڕاوی قوتابخانەی بەزمانی عەرەبی دانا، وەك (مختارات من أدب العرب)، (قصص النبيين) بۆ منداڵان، وە (القراءة الراشدة)، کە ئەو کتێبانەش لەزۆر لەزانکۆکانی هیندستان و وڵاتە عەرەبیەکان دەخوێنرێن.

ئەدەوەی لەساڵی (١٩٤٤)دا پەڕاوە بەناوبانگەکەی نووسی (ماذا خُسرَ العالَم بِإنْحِطاط المُسلِمين)، کەبەهۆی ئەم کتێبەوە لەساڵی (١٩٨٠) خەڵاتی مەلیك فەیسەڵی جیهانی پێدرا، هەروەها پەڕاوی (رجال الفكر والدعوة) کەچوار بەرگەو گەشتی ژیانی لەپەڕاوێکی دووبەرگیدا بەناوی (مسيرة الحَياة) بڵاوکردەوە، بەگشتی نووسینەکانی بەزمانەکانی عەرەبی و فارسی و ئوردی و ئینگلیزی نزیکەی (٧٠٠) نووسینە لەپەڕاوو نامیلکە، جگە لەوەی لەچەندین دامەزراوەی ئیسلامی و جیهانیدا بووە بەئەندام، شێخ ئەبولحەسەن لەدوایین جومعەی مانگی ڕەمەزان لەساڵی (١٩٩٩) کۆچی دوایی دەکات.

# سەرچاوەکان


**یەکەم/ کتێب:**

١- قاموس الرائد (معجم ألفبائي في اللغة والاعلام) ، جبران مسعود، دار العلم للملايين،بيروت ٢٠٠٠.

٢- چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی ڕۆژنامەوانی کوردی (سالآنی نێوان دوو جەنگی جیهانی ١٩١٨-١٩٣٨)، بەرگی دووەم، نەوشیروان مستەفا ئەمین، سلێمانی/٢٠٠٢

٣- هەگبەی مێژوو، ئا: هۆشیار نوری بەگ- شەیدا شێخانی، پێداچوونەوەی: ئاری ئاغۆك، هەولێر/٢٠٠٤.

٤- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کۆکردنەوەو لێکدانەوەی: شێخ محمدی خاڵ، پێداچوونەوەی: د.کەمال فوئاد/ سلێمانی- ٢٠٠٣.

٥- (پەنجەکان یەکتری دەشکێنن) نەوشیروان مستەفا/ چاپی سێیەم، ١٩٩٨- سلێمانی.

٦- مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سوجادی/ ١٩٥٢.

٧- ڕۆژنامەگەری کوردی لەعێراقدا (بەراییەکان ١٩١٤-١٩٣٩)، فاروق عەلی عومەر، و.تاریق کارێزی، ساغکردنەوەی. عبدالله زەنگەنە/٢٠٠١.

٨- تێگەیشتنی ڕاستیو شوێنی لەڕۆژنامەگەری کوردیدا، د.کەمال مەزهەر ئەحمەد.

٩- فەرهەنگی مێژووی کورد، مایکڵ گانتەر/ وەرگێرانی: مامکاك/ هەولێر-٢٠٠٧.

١٠- دیوانی فانی (مەلا حسین شێخ سەعدی)، ئا: بشير حسين سعدی/١٩٨٤.

١١- ئینسایکلۆپیدیای گشتی، یاسین صابر صالح، سلێمانی/٢٠٠٥.

١٢- پێغەمبەر ﷺ لەدڵی شاعیرانی کورددا، عوسمان سەنگاوی.

١٣- ڕۆمانی (بێ نەوایان)، ڤیکتۆر هیگۆ، و.محمدی شلماشی.

١٤- هەڵوێستی جیهانی ئیسلامی ڕوو بەڕژیاری ڕۆژئاوا، نووسینی: شێخ أبوالحسن الندوی، و. مامۆستا غەفور کانی سپیکەیی، چاپی یەکەم/٢٠٠٢.

١٥- ئەدەبیاتی کلاسیکی و نوێخوازی کوردی/ د. کەمال مەعروف، چاپی یەکەم، سلێمانی-٢٠٠٣.

١٦- لەفەرهەنگی بانگخوازانەوە، ئەندازیار عوسمان محەمەد ڕەشید، ١٩٩٩ز، چاپی دووەم.

١٧- یەڵماز گۆنای ، نووسین و ئامادەکردن و گۆڕینی حەمەکەریم عارف.

١٨- دیوانی بەختیار زێوەر، کۆکردنەوەی: مەحمود زێوەر، بەغدا/١٩٨٩.

١٩- بورکانی شیعر، کۆساری - چاپی دووەم، هەولێر/٢٠٠٦.

٢٠- مرۆڤ و ڕێبازی ژیان، م.ناصری سوبحانی - ئا:عبدالله علی/ چاپی یەکەم، هەولێر-١٩٩٧.

٢١- ڕۆمانی (چاوەکانی)، بزرگ علوی، و.ئازاد برزنجی، سلێمانی- ٢٠٠٣.

٢٢- سۆمای دیدە، کتێبی دووەم، عادل شاسواری/ ٢٠٠٢ .

٢٣- (ئەیدن)، ئا: د.عبدالفتاح حمەرحیم هەورامی، ٢٠٠٧.

٢٤- گەشتەکەم لەگومانەوە بۆ باوەڕ/ ن:د.مستەفا مەحمود، وەرگێڕانی: م. محمد ملا صالح شارەزووری/ سلێمانی- ١٩٧٤

٢٥- ئازادی ڕادەربڕین لەڕۆژئاوا، لەسەلمان ڕوشدیەوە بۆ ڕوجیەگارودی..... و/وەرزێر حمەسلیم.

٢٦- خەباتی من، نووسینی/ هیتلەر- و/ م.حمەصالح محمد گەلآلی.

٢٧- ڕێکخراوی گەشەپێدانی قوتابیانی کوردستان، لەنێوان ڕابردوو و داهاتوودا/ ئامادەکردنی: بەهێز جەلال.

٢٨- ئیشکردن نەك تەمەڵی / عەبدولعەزیز پارەزانی، چاپی یەکەم- ٢٠٠٧.

٢٩- دیوانی فانی/ کۆکردنەوەو پێشەکی و لێکۆڵینەوەی: د. کەمال میراودەلی، سلێمانی - ٢٠٠٦.

٣٠- ڕەوتی ئیسلامی لەباشووری کوردستان (١٩٤٦-١٩٩١)، ئیدریس سیوەیلی/ چاپی یەکەم-٢٠٠٦.

٣١- بزانین باشترە، ئامادەکردن و وەرگێڕانی/ کامیل ئەحمەد بەگ - ٢٠٠٥.

٣٢- جوگرافیای سیاسی جیهان/ عبدالرحمن مەلا حبیب أبوبکر پیرە، سالی/ ٢٠٠١.

٣٣- تورکیاو ڕەفاهی ئیسلامی، لێکۆڵینەوەی/م.هەورامانی، ١٩٩٦ (دەستنووس).

٣٤- گوڵستانی ئیرەم لەوەصفی فەخری عالەم، ئامادەکردنی: عوسمان سەنگاوی/٢٠٠٨.

٣٥- تۆپی پێ، مێژوو- سەرهەڵدان- داهێنان/ ئامادەکردنی: سامان عەبدولا بریفکانی- ٢٠٠٧.

٣٦- ژیان و بەسەرهاتی قورئانخوێنە ناودارەکانی جیهان/ ئامادەکردنی: صهیب جمبل علی/٢٠٠٦.

٣٧- گوزەرێك بەژیان و تێکۆشانی زاناو موفەسیری قورئان مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز، نووسینی: م. مەلا ئەحمەدی شافیعی، وەرگێڕانی: م. ناصیح شارباژێڕی، چاپی یەکەم/٢٠٠٨.

٣٨- ڕۆژان (فەرهەنگی زانایان و شاعیران و ناوداران) بەشیر حسین سعدی کوردستانی، هەولێر-٢٠٠٧.

٣٩- دانوستانەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردو حکومەتەکانی عێراق (١٩٢١-١٩٦٨)/ د.واحد عومەر محێدین، سلێمانی/٢٠٠٦.

٤٠ - شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لەعیراق، عەبدولقادر سالح/ سلێمانی -٢٠٠٥.

٤١- (پەیامی گەورە پیاوانی فەلسەفە) ئا/شاخەوانی کەریم هەژار.٢٠٠٦.

٤٢- - ژوانگەی سەروەران، شەهید محەمەد سەنگاوی، چاپی یەکەم/ سلێمانی - ٢٠٠٧.

٤٣- پێکهاتەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، ئامادەکردنی: ڕێکخراوی عێراقی بۆ هەماهەنگیکردنی مافەکانی مرۆڤ، العراق- ٢٠٠٦

٤٤- الادب والنصوص، للصف السادس الاعدادي.

## دووەم/ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان:

١- ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارەکانی: (٦١٢)، (١٣٤)، (٤٦١)، (١٣١)، (٢٨١)، (٣٣٢)، (٣٧٧)، (٤٣٥)، (٤٦٣)، (٦١٢)، (٢٣٨)، (١٥٦)، (١١١)، (٢٨٦)، (سـفر)، (١٣٠)، (١٢٤)، (٤٨)، (٤٤)، (٢١٣)، (٣٧١)، (١٩٢)، (١٨٨)، (١٧٨)، (١٥٧)، (٢٤١)، (٦٨)، (٣٦١)، (٢٤٥)، (٧٨)، (١٧٧)، (٦٥)، (٦٦)، (١٦٢)، (٦٨٣)، (٢٤٥)

٢- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ، ژمارەکانی: (٢٠٤٢)، (٢٠٤٦)، (٢٠٥٤)، (٢٠٥٦)، (٢٠٦٧)، (٢٠٧٧)، (٣٥٩٧)، (٣٧٣٥)، (٤٥٧٤).

٣- ڕۆژنامەی داهێنان، ژمارەکانی (١٧)، (٢٣)، (١٦٣)، (١٦٧)، (١٦٨)

٤- ڕۆژنامەی ئاسۆ، ژمارەکانی (٣٥٣)، (٥٩٨)، (٦٣٥)، (٦٥٧).

٥- ڕۆژنامەی ڕۆژنامە، ژمارەکانی: (٣)، (٤٩).

٦- ڕۆژنامەی خوێندنی لیبراڵ، ژمارەکانی: (٤٢)، (١٠٠)

٧- ڕۆژنامەی ڕێبازی ئازادی، ژمارە (٣٥٨)

٨- ڕۆژنامەی ئاوێنە، ژمارە (٤٥)

٩- ڕۆژنامەی پێشڕەو، ژمارە (٢٢٤)، ئابی ٢٠٠٧.

١٠- ڕۆژنامەی ڕۆژهەڵات، ژمارە (١٨).

١١- ڕۆژنامەی پارێزگاران، ژمارە (٧٩).

١٢- ڕۆژنامەی ئایندە، ژمارە (١٠٨).

١٣- ڕۆژنامەی پێگە، ژمارە (٩٢).

١٤- ڕێبازی ئەدەب و هونەر، ژمارە (٦٣)- ئەیلولی ٢٠٠٧.

١٥- ڕۆژنامەی ڕۆژی وڵات ژمارە (٧٣).

١٦- ڕۆژنامەی هەڵەبجە ژمارە (٢) ١٦/٣/١٩٩٨.

١٧ - گۆڤاری بانگەشەی ڕاستی، ژمارە (٢٥و ٢٦)/٢٠٠٧.

١٨ - گۆڤاری پەیامی ڕاستی، ژمارەکانی (١٩)، (٢٣)، (٥٧).

١٩- گۆڤاری ڕامان، ژمارەکانی (٣، ٣٢)
٢٠- گۆڤاری گوڵان، ژمارە (٢٧٥) نیسانی ٢٠٠٠.
٢١- گۆڤاری (REAL AXIS) ژمارە (١) شوباتی ٢٠٠٧.
٢٢- گۆڤاری گزنگ، ژمارە (٢٨) ئەیلولی ٢٠٠٥.
٢٣- گۆڤاری پەیڤین، ژمارە (١٥)، مارسی ٢٠٠٤.
٢٤ - گۆڤاری تێکست، ژمارە (١)، پاییزی ٢٠٠٣.
٢٥ - گۆڤاری ڕابەر، ژمارەکانی (٣٦)، (٣٠).
٢٦- گۆڤاری ڕۆشنگەری، ژمارە (١٠)ی ٢٠٠١.
٢٧- گۆڤاری هەژان/ ژمارە (١٤و١٥)/٢٠٠٤.
٢٨- گۆڤاری ستاندەر، ژمارە (٢٢) شوباتی ٢٠٠٨.
٢٩- گۆڤاری پێشەنگ، ژمارە (٢) هاوینی ٢٠٠٣.
٣٠- گۆڤاری کاروان ، ژمارە (١١٧)/ ١٩٩٨
٣١- گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە (٥) خولی سێهەم، ئەیلولی ١٩٨٦.
٣٢- گۆڤاری جەماوەر، ژ(٦٣) تشرینی یەکەمی ١٩٩٦.

چوارەم/ تەلەفزیۆن و ڕادیۆکان:
١- کەناڵی ئاسمانی کوردسات.
٢- بەشی کوردی ڕادیۆی تاران، بەرنامەی (ئەمڕۆ لەئاوێنەی مێژوودا).
٣- دەنگی یەکگرتوو - ڕادیۆی سلێمانی، بەرنامەی (گوڵستان).

پێنجەم/ ماڵپەڕی ئینتەرنێت:
١- www.pukmedia.net.
٢- www.kurdistantv.net
٣- www.kurdiu.org
٤- www.xebat.net
٥- www.frmesik.mihrablog.com
٦- www.moprmg.net.
٧- ماڵپەڕی نزار قەبانی (www.nizar.com).
٨- ماڵپەڕی ئەحمەد شەوقی (www.ashawktmuseum.gov).

# پێڕستی مانگەکان

# پێڕستی پەراوێزەکان